یاسین قادر بەرزنجی

# مەرگی وەنەوشە



55 چیرۆکە هەواڵ

چاپی چوارەم

هەولێر - ٢٠١٢

چیرۆکە هەواڵ

# مەرگی وەنەوشە

نووسینی : یاسین قادر بەرزنجی

پێشەکی : جەمال غەمبار

چاپی چوارەم

هەولێر / ٢٠١٢

وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان
بەڕێوەبەرایەتی گشتیی رۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر

ناوی کتێب: مەرگی وەنەوشە
نووسینی: یاسین قادر بەرزنجی
مۆنتاژ: مەهدی ئەحمەد قادر
نەخشەسازی بەرگ: ئارام عەلی
چاپی چوارەم، چاپخانەی رۆشنبیری – هەولێر/ ٢٠١٢
چاپی یەکەم ٢٠٠٠، چاپی دووەم ٢٠٠٢، چاپی سێیەم ٢٠١٠، چاپی چوارەم ٢٠١٢

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٣١١) ساڵی (٢٠١٢)ی پێدراوە

## پێشکەشە بە:

دایکمو خوشکەکەم،

هاوسەرو کچەکەم..

لەوانیشەوە بۆ

گشت کچانو ژنانی گەلەکەم..

لەگەڵ خۆشەویستیمدا

**یاسین**

# وتەیەك ..

خۆشحاڵم کە (مەرگی وەنەوشە) بۆ جارێکی دی‌و بە چەند چیرۆکێکی نوێوەو لە چاپێکی تازەدا دەکەوێتە بەرچاوی خوێنەر.

زیندوویی هەر بەرهەمێکی ئەدەبی‌و رۆژنامەوانیی بە ناوەرۆکی بابەتەکان‌و شێوازی داڕشتنیانەوەیە، ئەگەر ئەم چیرۆکانەش تا ئەم ساتە لای خوێنەری ئازیز وەهابن، ئەوا مایەی ئەوپەڕی هاندانە بۆ بەندە کە بەردەوام بم لەسەر نووسینیان، بەتایبەت کە کۆمەڵگای ئێمە پڕاوپڕە لە کێشە کۆمەڵایەتییەکان، ئەوانەی بوونەتە کرۆك‌و تانوپۆی ئەم چیرۆکانەی بەردەست.

مایەوە بڵێم، بیرۆکەی چاپکردنەوەی ئەم کتێبە سەرەتا لەگەڵ خوشکی بەڕێزم خاتوو ئاسۆس نەجیب (وەزیری کارو کاروباری کۆمەڵایەتی) سەریهەڵدا، تاوەکو لەدوای چاپ، ژمارەیەکی باشی بەسەر فەرمانگاکانی چاکسازی‌و چاودێریی کۆمەڵایەتیدا (بەزیندانەکانیشەوە) دابەش بکرێت، ئەوەبوو ئەویش بیرۆکەکەی لای بەڕێز د.کاوە مەحمود (وەزیری رۆشنبیری‌و لاوان) باسکردو بەڕێزیشیان خەمخۆرانە بە دەنگمانەوە هات، هەروەها بەڕێوەبەرێتیی گشتیی رۆژنامەنووسیی‌و چاپ‌و بڵاوکردنەوە بە سوپاسەوە ئەرکی چاپیان لە ئەستۆگرت.

هیوادارم، مەرگی وەنەوشە لای خوێنەرانی پەسەندبێت‌و هۆکارێ بێ بۆ کەمکردنەوەی توندوتیژیی نێو کۆمەڵگا.

**یاسین قادر بەرزنجی**

٢٠١١/١٢/١

# "مەرگی وەنەوشە" یان بەمێژووکردنی غەدر!

**جەمال غەمبار**

دەستبردن بۆ گێڕانەوەو خستنەبەرچاوی ئەو کەیسانەی دادگا کە ڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە تاوانی کوشتن‌و سڕینەوەی بوونی ئینسانەوە هەیە لەسەر نەخشەی ژیان، بەتایبەتی تاوان گەلی ژن کوشتن بەبیانووی ناموسپەرستیی‌و پاراستنی شەرەفی خێزان‌و بنەماڵە کارێکی هێندە ئاسان نییەو هەر بە تەنها ناچێتە خانەی وەزیفە یان چالاکییەکی ڕۆژنامەنووسییەوە، بەڵکو سەرەڕاش، ئەوەی بیەوێت کارێکی وەها بکات ئەبێت خەمێکی ئینسانیی وای هەبێت کە لەگەڵ کاراکتەرو لەحزەی ڕووداوەکانی ناو کەیسەکاندا بژی‌و خەمیان لێ بخوات‌و لەگەڵیاندا لەناوەوە بهەژێت. زەینی خوێنەر بەرەو هەموو لایەنەکانی کەیسەکە کێش بکات‌و تووشی پرسیارو بیرکردنەوەی بکات. لێرەوە ئەکرێت دڵنیا بین لەوەی، کە هاوڕێی هونەرمەندو ڕۆژنامەنووس کاک یاسین قادر بەرزنجی، لەگەڵ یەك بەیەکی ئەم کەیسانەدا ژیاوەو تووشی هەژان‌و قەهری بەردەوام بووە، بۆیە توانیویەتی ئەم کارە سەرکەوتووانە ئەنجام بدات. من بەحوکمی ئەوەشی لە دادگای سلێمانی پارێزەر بووم(دیارە هەتا ئەو کاتەی لەوێ بووم)، لە نزیکەوە ئاگاداری ئەوە بووم ئەم هاوڕێیە لەگەڵ فایلی کەیسەکاندا بە چ سەلیقەیەکەوە مامەڵەی ئەکرد، ئەمە وێڕای توانای داڕشتنەوەی کەیسەکان‌و وەسفکردنی کاراکتەرەکان‌و لە هەندێك لەحزەدا خوێندنەوەی ناخیان وەك چیرۆکنووسێکی بەتوانا، لەم لایەنانەوە دەستخۆشی لێئەکەم.

من نامەوێت لەبارەی رادەی ترسناکیی ئەو تاوانانەوە بدوێم کە لەم کتێبەدا باسکراون، چونکە کەیسەکان بۆ خۆیان زۆر بەڕوونیی قسە ئەکەن‌و خوێندەوار تێیان ئەگات، بەڵکو مەبەستمە بڵێم بایەخی ئەم کتێبە لە لایەنەکانی کۆمەڵایەتی‌و فەرهەنگی‌و قانونییەوە لەوەدایە کە ئەیەوێت پێمان بڵێن:

*لەسەرجەمی ئەو تاوانانەی بەبیانووی ناموسپەرستییەوە ئەنجام ئەدرێن، کارەسات لەوەدایە، کۆمەڵگە لەجیاتی تاوانکار، سزای قوربانی ئەدات، روونتر، کاتێ جەستەی ژن ئەکرێتە پێخۆری تێرکردنی ئارەزووی پیاو، هاوزەمان بۆ کوشتن‌و لەناوبردن کە زۆرجار ئەم کوشتنە زۆر دڕندانە ئەنجام ئەدرێت لە جۆری سەربڕین‌و لەتو پەتکردنی جەستەو سوتاندنی. لەوەش زیاتر، ساڵانێکی دوورو درێژ قانونی سزادانی عێراقی بەبیانووی کڕینەوەی شەرەفەوە کە ناوی نابوو(غسل العار) ئەم تاوانی کوشتنەی لە خانەی سووککردنی سزاکاندا پۆلێن کردبوو، دواتریش‌و لەسەرەتای نەوەدەکانی سەدەی رابردوودا، رژێمی ئەوسای عێراق، بەبڕیارێکی زۆر نامرۆیانە، شەرعییەتی تەواوی بەم کوشتنەداو، لە خانەی تاوان هێنایە دەرێ‌و دەستی خێزان‌و بنەماڵەو عەشیرەتی تەواو واڵا کرد بۆ کوشتنی ژن بەبیانووی ناموسپەرستی. سەرەڕاش، رژێم خۆیشی لەژێر ئەو پەردەڕەشەدا، نەیارانی خۆی لەناو برد. دوای راپەڕین‌و لەدوای ناوەڕاستی ساڵانی نەوەدەکانی سەدەی رابردووەوە پرۆژەی یاسایەك دەرچوو بۆ لابردن‌و پەکخستنی ئەو قانونەو بڕیارەکەی رژێم سەبارەت بەکوشتنی ژن بەبیانوی ناموسپەرستییەوە. بەڵام پرسیار ئەوەیە ئایا فەرهەنگ‌و عورفی دواکەوتووی کۆمەڵگایەکی سوننەتی، رێ بە جێبەجێکردنی ئەم پرۆژە یاسایە ئەدەن؟ یان وەکی ئەشێ بپرسین، بڵێی هەموو کەیسەکانی ژن کوشتن بەبیانووی ناموسپەرستی، بگەنە بەردەم

دادگا یان هەر لەژێر دەواری خێزانو بنەماڵەدا حەشار ئەدرێنو دەستی دادگاو قانونیان ناگاتێ؟

* ئەم کتێبە ئەیەوێت پێمان بڵێت، ئێمە پێویستمان بە هەڵوێستەی جددیی و وردبوونەوەی قووڵ هەیە لە هۆکارەکانی قەوماندنو روودانی ئەم تاوانانە کە لە رووداوی تاکو تەراوە بوونەتە دیاردە. هۆکارە ئابووریو کۆمەلایەتییو سیاسییو تەنانەت قانونیەکانیش چین کە وا ئەکەن ئەم دیاردەیە نەك هەر بەردەوم بێت، بەڵکو زیادیش بکات. دیارە لێرەدا ناکرێت رۆڵی بەرچاوی رێکخراوەکانی ژنانو ئافرەتانو تۆڕەکانی کۆمەڵی مەدەنیو کەسانی یەکسانیخوازو رۆشنبیران نادیدە بگرین کە چ رەنجو کۆششێکیان داوەو بەردەوامیشن بۆ نەهێشتنی ئەم دیاردەیە، بەلام من لێرەدا ئەمەوێت باسی رۆڵی دامەزراوەیەکی گرنگی زانستیی بکەم کە ئەویش زانکۆیەو بەتایبەتیش بەشەکانی-کۆمەڵناسیی لە زانکۆکانی کوردستاندا-کە هەتا ئەم لەحزەیەی ئەم پێشەکییەی تێدا ئەنوسم، یەك بە خۆم نەمبیستووەو نەمخوێندۆتەوە کە ئەم دەزگا گرنگە لەسەر دیاردەیەکی وەها ترسناك هیچ توێژینەوەو ئامارێکی وردی وەك پرۆژەیەکی کۆمەلایەتیی گرنگ کە پەیوەندیی راستەوخۆی بەژیانو ئارامیی ئینسانەوە هەیە ئامادە کردبێتو دواتریش هاوپێچ لەگەڵ کۆمەڵێك راسپاردەو پێشنیازی گرنگدا پێشکەشی حکومەتو دەزگا تایبەتمەندەکان کردبێت. هیوادارم حکومەتیش بودجەی تایبەت بۆ ئەو مەبەستە بخاتە بەردەم زانکۆکانو داوای راسپاردەو پێشنیازیان لەو بارەیەوە لێبکات.

* ئەم کتێبە ئەیەوێت پێمان بڵێن، دەقی قانونەکان پێویستیان بەپێداچوونەوە هەیەو هەروەها سیستمی سزادانیش پێویستی بەپێداچوونەوە هەیە. بۆ نمونە ئەوەتا چەندین ساڵە تاوانکاران سزای

ئیعدام ئەدرێن‌و کەچی تاوان هەر بەردەوامەو زیادیشی کردوە. لێرەوە ئەکرێت بڵێین، بە تەنها سزادان، تاکە چارەسەر نییە بۆ بنەبڕکردنی تاوان.

* لە روانگەی یەکسانیی نێوان ژن‌و پیاوەوە ئەم کتێبە ئەیەوێت پێمان بڵێت، مەرج نییە تاوان هەر لەپیاو بوەشێتەوە، بەڵکو لە هەندێ حاڵەتدا، ژنیش وەك بوونەوەرێکی ئینسانیی بەشداری تاوان ئەکات.

* دواجار ئەم کتێبە ئەیەوێت ئەو پرسیارە بوروژێنێت، ئایا مرۆڤ چۆن ئەتوانێت گورگە نوستووەکەی ناوەوەی خۆی بکوژێت، ئەو گورگەی کە تاوانی پێئەکات؟ ئەو هۆکارانە چین کە دەستەبەری ژیانێکی کۆمەڵایەتیی ئاسوودەو هۆشیارانە بۆ مرۆڤ ئەکەن بۆ ئەوەی دووری بخەنەوە لە تاوان.

بەڕاستی ئەم کتێبە شایانی خوێندنەوەیە لەلایەن هەموومانەوە. پێشنیازیشم بۆ کاك یاسین ئەوەیە، کە ئەگەر کاتی هەبێت، بەهەمان ئەم نەفەسەوە، دەست بداتە پرۆژەی کۆکردنەوەو خستنەڕووی ئەو کەیسانەی کە تایبەتن بە خۆکوشتنی توێژی ژنان‌و گەنجان کە ماوەیەکە خەریکە ئەبێتە دیاردەیەکی بەربڵاو لە زۆربەی شارو شارۆچکەکانی هەرێمی کوردستان.

گەرچی ئەم کەیسانە، بەحوکمی سروشتی رووداوەکە رەنگە زۆربەیان هەر لە قۆناغی لێکۆڵینەوەدا بۆ ماوەیەکی زۆر بمێننەوە، یان فایلی هەندێکیان دابخرێن، بەڵام مادامەکی بەرەو ئەوە ئەچن کە ببنە دیاردە، پێویستە بەجددی قسەیان لە بارەوە بکرێت. دڵنیاشم ئەم هاورێ بەرێزە لە ئۆیەی ئەو کارە دێت‌و پێویستە هاوکارییش بکرێت.

**ئەدیلاید-باشووری ئوستراليا**

**٢٠١١/١١/٢٧**

# پێشەکی چاپی سێیەم

## د. ڕەفیق سابیر

(مەرگی وەنەوشە) کتێبێکە لەبارەی دیاردەی توندوتیژیو لایەنێکی نیمچە شاردراوەی ئەم دیاردەیە لەکۆمەڵی کوردستاندا پێشان دەدات.

نووسەری ئەم کتێبە، کاک یاسین قادر بەرزنجی، لەڕێگای کۆمەڵە ڕووداوێکی تراجیدییانەوە، کەبەشێوەیەکی چیرۆکئامێز دەیانگێڕێتەوە، سەرنجمان بۆ لای ئەو ستەمو تاوانانە رادەکێشێت کەبەهۆی دڵپیسی، یان بیانووی جۆراوجۆر، لەوانە بەبیانووی شەرەفەوە، بەرامبەری ژنانو کچانی کوردستان دەکرێن. ڕۆژانە بەبەرچاوی هەموانەوە، ژنانو کچان ڕووبەڕووی شێوازی جۆراوجۆری توندوتیژی دەبنەوە، ئەوان تێهەڵدەدرێن، ئەتك دەکرێن، دەسووتێندرێنو دەکوژرێن؛ ئەم تاوانانە بەزۆری لەلایەن کەسانی هەرە نزیکی قوربانییانەوە (باوك، برا، مێرد، ئامۆزاو.. تاد) ئەنجام دەدرێنو بەئاسانی تێدەپەڕن، تاوانبارانیش دوای سزایەکی سووك، یان زۆر جار بێ سزادانو بەدەستی خوێناوییەوە تێکەڵی کۆمەڵ دەبنەوە، وەك ئەوەی تاوانەکانیان بەشێك بێت لەپێداویستییەکانی مانەوەو بەردەوامبوونی کۆمەڵی کوردستان.

ئاخۆ کۆمەڵێك دەبێت لەچ ئاستێکی دارمانی ئەخلاقیو ئینسانیدا بێت کە رێگا بەم جۆرە تاوانانە بداتو ئەوەندە بەئاسانی تاوانباران قبوول بکاتەوە.

بڵاوبوونەوەی دیاردەی توندوتیژی، بەتایبەتی بەرامبەری ژنان، ئەنجامێکی ترسناکی کۆمەڵایەتیو کولتووریو ئەخلاقیی لێ کەوتۆتەوە، ئەنجامەکەیش ئەوەیە کەخەریکە توندوتیژی زەبرپەروەری دەبنە دیاردەی ئاساییو قبوولکراو و هەمووومان، بێ ئەوەی بەخۆمان بزانین لەگەڵیان رادێین.

ئەم کتێبە پێش هەر شتێك ستایشێکی قوربانییانی توندوتیژیو زەبر پەرستییە، کتێبێکە هاوسۆزیو رێزلێنانی نووسەرەکەی لەو قوربانییانەی بە پەرۆشەوە باسی کردوون دەردەخات، بەڵام وەك هەر کتێبێکی تری لەم جۆرەە، هەندێك ئەنجامی ترسناکی ئەم دیاردیەمان پێشان دەدات کەدەشێت هۆشیاریمان بەرامبەری مەترسیی توندوتیژی زیاتر بکاتو هانمان بدات، هەر نەبێت لەبەرخۆمانو بۆ پاراستنی سروشتو ناوەرۆکی ئینسانییانەی خۆمان، پێش بەتوندوتیژیو زەبرپەروەری بگرینو کار بۆ کۆمەڵێکی پڕدادو جوانتر بکەین.

**سلێمانی**

**٢٠٠٩/١٢/١٢**

## پێشەكی چاپی یەكەم و دووەم

# چیرۆكە هەواڵ
# ژانرێكی كاری رۆژنامەگەری دوای ڕاپەڕین

**ئازاد جندیانی**

كاتێ دەستكرا بە دەركردنی ڕۆژنامەی كوردستانی نوێ، هێشتا كۆمەڵی كوردەواری لەژێر كاریگەری راستەوخۆی ڕاپەرین دا بوو، كەشوهەوای شۆڕشگێڕی بەسەر بارودۆخەكەدا زاڵ بوو، بەشێوەیەكی گشتی ڕەواجی نووسینی سیاسی و ئەدەبیاتی سیاسی و بگرە ریپۆرتاژی سیاسی بوو، هێشتا جەماوەر لەسەردەمی دروشمەكان دوورنەكەوتبووەوە و دەرچوونی رۆژنامەكەش وەك ئەزموونێكی پێشڕەوو نوێ بۆ خۆی هۆیەكی تر بوو تا خەڵكەكە دەرچوونەكەی بە زۆر بزانن و باوەشی گەرمی بۆ بكەنەوە، بۆیە لەو سەردەمی دەسپێكەدا ڕۆژنامە قبوڵ دەكرا، گەرچی كرچ و كاڵ و سەقەتیش بێ. بەڵام وردەوردە لەگەڵ گۆڕانی سایكۆلۆژی دەستە جەمعی كۆمەڵ و دووركەوتنەوەی زەمەنی لەكەش و هەوای ڕاپەڕین و نەمانی كاریگەرییە ڕاستەوخۆكانی ڕاپەڕین بووە هۆی ئەوەی كەچیتر ڕۆژنامەكە بە هەمان شێوەی دەسپێكی خۆی ڕەواجی نەبێ، ئەوە ڕاستییەك بوو پێش ڕوودانی هەستی پێكراو گۆڕانێك بەسەر رەوشی ڕۆژنامەكەدا هێنراو

بەمەش بیّ رەواجی لەسەر خۆی کەلی کرد، بەڵکو ئەو بیّ ڕەواجییەی هەر نەبینی و لەبری ئەوە وەرچەرخانێکی ئەنجامدا. لەسەردەمی ئەو وەرچەرخانەدا بوو کە رۆژنامەنووسەکانی دەرگای تازەو شێوازی کاری رۆژنامەگەری تازەیان لەسەر لاپەڕەکاندا نەخشاندو(چیرۆکە هەواڵیش) یەکێك بوو لەو شێوازە نووسینانەی کە لەو سەردەمەدا سەری هەڵداو جێی خۆی کردەوە.

چیرۆکە هەواڵەکانی کوردستانی نویّ کەدەسپێکەکەی لەلایەن هەردوو رۆژنامەنووس کاك غیاث الدین نەقشبەندی و کاك یاسین قادربەرزنجی یەوە دەستی پیّ کردو دواتر بە هەوڵی کاك یاسین و هاندانی خوێنەران و بەرپرسانی رۆژنامەکە بەردەوام بوو، سەرکەوتنی زۆری وەدیهێناو خوێنەرێکی زۆری لەدەور کۆبۆوە.

کۆبوونەوەی ئەو هەموو خوێنەرانەو رەواج پەیداکردنی ئەو جۆرە ریپۆرتاژە رۆژنامەگەرییە، لەلایێکەوە بۆ تواناو سەلیقەی رۆژنامەنووسەکە لە دارشتن و بەکارهێنانی عونسرەکانی چیرۆك، بە تایبەت عونسری گێڕانەوە دەگەڕایەوە، بەڵام لەلاییێکی دیکەوە بۆ تازەیی بابەتەکە خۆی دەگەڕایەوە.

کورد، بۆ خۆی تا دوای راپەڕین بە هۆی هەلومەرجی سیاسییەوە نەیتوانیوە رۆژنامەیەکی رۆژانە دەربکا، بۆیە ئەزموونەکانی لەو بوارەدا زۆر کەم بووە، هەروا بە هۆی سیاسەتی راگەیاندنی حکومەتی بەغداش کە رەنگدانەوەی سیاسەتی تۆتالیتاری حزبی بەعس بوو، بواری راگەیاندیش، وەکو بوارێکی دیکەی ژیانی کۆمەڵ کۆنتڕۆڵ کراو بوو، لە مەرکەزەوە برگەکانی سیاسەتی راگەیاندن دیاری دەکراو بەشێوەیەکی زۆر پۆلیسیانەش چاودێری [illegible] جێکردنی دەکرا، یەکێك لەو سیاسەتی

ڕاگەیاندنانەی بەعس ئەوە بوو کە ژیانی کۆمەڵی عێراق، بەشارو لادێوە بەژیانێکی جێگیرو بێ گیروگرفتی کۆمەڵایەتی، ئابووری، ڕووناکبیریو..هتد.. نیشان بدرێ، ئەو سیاسەتە کە لە بنەڕەتەوە سیاسەتێکی دیماگۆگی بوو بەو ئامانجە بوو کە بەعس وایپیشان بدا کە خوێندنەوەی فەلسەفیو کۆمەڵەیەتی نوێی بۆ کۆمەڵی عێراق (لە کۆتایشدا بۆهەموو کۆمەڵە عەرەبیەکان) زانستی و ڕاستو دروستەو بەو خوێندنەوەو ستراتیژ داڕشتنە توانیویەتی کار بکاتە سەر بزاوتی مێژوو و کۆمەڵی عێراق بخاتە سەر ڕێی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیو ناکۆکیەکانی ناو هەناوی کۆمەڵی بەقازانجی چینو توێژە چەوساوەکانی یەکالاکردۆتەوە.

چیرۆکە هەواڵ، لە بنەڕەتدا گێڕانەوەو وێناکردنی کێشەی کۆمەڵایەتی و ئابوری و سایکۆلۆژی و هی ترە کەدەکرێ لە کۆمەڵی پێشکەوتوو پاشکەوتوودا ڕووبدەن و زۆربەی جاریش کارەساتی دڵتەزێنیان لێ کەوتۆتەوە، بۆیە لە ڕۆژنامەکانی عیراقدا لە کوردستانی سەردەمی بەعسیشدا باسکردنی ئەو دیاردەیەو ڕووداوانە پێچەوانەی سیاسەتی ڕەسمی حکومەت بوو، بۆیە باسکردنیان قەدەغەبوو. بێ جێ نیە لێرەدا ئەوەش بڵێین کە حزبی بەعس ڕێگەی نەدەدا گۆرانیو مۆسیقای خەماوی لەعیراقدا تۆماربکرێنوبلاوبکرێنەوە، بە بیانووی ئەوەی کە گوایا لە کۆمەڵێکی سۆسالیستدا فاکتەرە ماددیو مەعنەوەیەکانی نامۆبوونی مرۆڤ نەماوەو هەبوونی دەقی ئەدەبی و هونەری خەماوی ئەدەب و هونەری سەرمایەدارییە.

لەشوێنێکی ئەم وتارەمدا ناوی کاک یاسین بەرزنجی-م هێنا کە ئەم لە داڕێژەرانی ئەو جۆرە کارە ڕۆژنامەنووسییە بوو کە لای خۆمان بە (چیرۆکە هەواڵ) ناوی دەرکردوەو بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە درێژەی پێداو لە

ماوەی چەند ساڵێکدا چەندین(چیرۆکە هەواڵی) شایستەو بەپێزی بڵاوکردەوە، کە هەرئەوەش وایکردووە ئەو جۆرە ژانرە ڕۆژنامەنووسیە برەوی پێ بدرێو بەر بڵاوتربێو خەڵکانی زۆرو ڕۆژنامەی تریش گرنگی پێ بدەن.

(چیرۆکە هەواڵەکانی) کاک یاسین هەڵقوڵاوی ناو کۆمەڵن و لە بنەڕەتدا هەریەکەیان لە هەواڵێکی ناو کۆمەڵەوە دەست پێ دەکەن، کە دواتر خەیاڵی ڕۆژنامەنووس و شارەزاییەکانی لە هونەرەکانی چیرۆك نووسین و شانۆگەری نووسیندا لە هەواڵێکی تراژیدی ڕووتەوە دەیکاتە بەرهەمێکی بەپێزو شایستەو سەرنج ڕاکێش. ئەو ئەزموونە زۆرەی کاری شانۆییش کەلای کاك یاسین کەڵەکە بووە سەرلەنوێ لە داڕشتنەوەی (چیرۆکە هەواڵ)ەکاندا شوێن پەنجەیان دیارەو هەر ئەمانەش بەشێك لە سەرکەوتنی چیرۆکە هەواڵەکانیان دەستە بەرکردووە.

لەکۆتاییدا دەستخۆشی لە کاك یاسین دەکەم وداواش لە پسپۆڕانی ڕۆژنامەنووسی دەکەم کە گرنگی بە لێکۆڵینەوە لەو ژانرە ڕۆژنامەنووسیە بدەنو لەسەری بنووسنو لایەنە جۆراوجۆرەکانی تاووتوێ بکەن.

**سلێمانی**

**٢٠٠٠/٢/٢١**

رۆژی ٢٠٠٣/١/١٤، دادگای جینایاتی کەرکوك لەکێشەیەکی کۆڵییەوە کەڕۆژی ٢٠٠١/٧/٢٨ لەگوندی (ماخۆ بزنان)ی سەر بەسەنگەسەر روویدابوو..

لەو رۆژەدا (خەرمان)ی تەمەن ٢٥ ساڵ بزربوو بوو، دوای خۆی کوڕە (١٢)ساڵەکەی‌و کچە(١١) ساڵەکەی‌و کوڕەکەی تری کەلەوان بچوکترە، بەواق وڕماوی‌و رەنگی پەڕیوەوە لەچاوەڕوانی رەنگ‌و دەنگ، یان هەواڵێکی دایکەکەیاندابوون.

بەڵام پاش چەند رۆژێك هەواڵی دۆزینەوەی لاشەی دایکیان گەیشتە گوێیان‌و لەماڵە خزم‌و کەسوکارەوە، بەهەنسکی پڕ لەگریانەوە برانە بەردەمی دادوەری لێکۆڵینەوەو لەوێ گوێ لەقسەی کوڕە گەورەکەو کچەکەی (خەرمان) گیرا..

## شەوێک بەر لەبزربوونی ئەو !

کوڕە گەورەکەی (خەرمان) کەقوتابیی پۆلی پێنجەمی سەرەتاییە، لەبەردەم دادوەری لێکۆڵینەوەدا وتبووی:

–بڕواناکەم دایکم بزر بووبێت، ئەو شەوەی بۆ بەیانی دایکم دیار نەما، باوکم بەدارو بەرد لێیداو لەئێمەش تووڕە بوو، وتی بخەون، ئێمە چووینە ژێر بەتانی‌ولەترساندا خەومان لێکەوت، کەبەیانی لەخەو هەڵساین، باوکم وتی دایکتان بزربووە!

ئەوە بوو سێ مانگ دوای کوژرانی، تەرمەکەی لەولا (ماخۆ بزنان)ەوە دۆزرایەوە، باوکم لەگەڵ دایکمدا زۆر خراپ بوو، دەیگووت: شێت بووەو بەردی تێگرن، هەرگیز رێگای پێ نەدەدا لەماڵ بێتە دەرەوە.

## ئەو ڕۆژەی خەرمان دیار نەما !

کچەکەی خەرمان کەقوتابیی چوارەمی سەرەتایی بوو، بەدادوەری وت:
-منو برا گەورەکەمو برا شەش ساڵانەکەم، پێکەوە لەو ژوورەی تیایدا دەژیاین لە(ماخۆبزنان) پێکەوە دەماینەوەو باوکم بەتەنیا دەچوو بۆ بنێشتکردن، زۆر جار دایکم بەتەنیا لەگۆشەیەکدا کز دادەنیشتو لەبەرخۆیەوە قسەی دەکرد، ئەو بەیانییەی کە دایکم ونبوو، هێشتا زۆر زووبوو، بانگی کردینو وتی "هەڵسە خۆتو براکانت بچنە سەر کانییەکەو دەموچاوتان بشۆنو ئاو بێنن تا چایی لێ بنێم.."
کە ڕۆیشتین باوکیشم هات بۆ نوێژکردن.. ماوەیەکی کورتمان پێ چوو، کەهاتینەوە دایکم دیار نەمابوو، باوکم یەکسەر چووە سۆراخی و گەڕان بەدوایدا، بەڵام دیار نەمابوو، من دایکمو باوکمم خۆشدەوێت..

## دایکو باوکەکەی خۆی وتیان چی ؟

*دایکە حەفتا ساڵەکەی خەرمان، دوای سوێندخواردن بەکەلامی خودا، لەلێکۆڵینەوەدا وتی:
-من سکاڵام هەیە دژی تۆمەتبار (مێردی کچەکەم)، من گومانم لێیەتی کە ئەو دەستی هەبێت لەونبوونی کچەکەمو کوشتنیدا، چونکە لەوەوبەر زۆر خراپ بوو لەگەڵی، کچەکەم هەمیشە دەیوت (مێردەکەم خراپە لەگەڵم، بەباشی خەرجیماڵمان ناداتێ، بەڵکو پارەکانی تەرخانکردووە بۆ باخ)، لەبەرئەوەی خەرمان بەشێوەی ژن بەژن درابوو بە(ڕەسوڵ)، هەر بۆیە

نەدەتۆراو دانی بەخۆیدا دەگرت.. کوێرایم دایە، هەموو جارێك دەیووت: دایکە رەسوڵ زۆر خراپە لەگەڵم، جوێنم پێدەداو لێم دەدا.. (ئەوەی وتو فرمێسك بەری چاوی گرتو گریان نەیهێشت چی دی بەدادوەر بڵێت)

*باوکە حەفتاو دوو ساڵەکەشی وتی:

١٣ساڵە کە کچەکەم ژنی رەسوڵ بوو، لەزاری دایکی خەرمانەوە دەمزانی کەبەردەوام کێشەو ناخۆشی لەماڵیاندا بووەو شەڕو ئاژاوە لەنێوانیاندا روویداوە، هەرگیز پێویستی ماڵی بۆ دابین نەکردووەو کچەکەم بەسکێ تێرو بەدە برسی بووە.

خەرمان وتوویەتی گوایە مێردەکەی بەنیازی ژن هێنانەوەی تر بووە، هەروەها ئێستا کە رەسوڵ بێ عەقڵی دەخاتە پاڵ کچەکەم ئەمە ئەسڵی نییەو بوختانە، کەمن کچم داوە بەو عەقڵیی تەواو بووەو کچێکی سەلاربوو، کاتێ چوونە گوندی ماخۆ بزنان بۆ بنێشتکردن ئاگادار بووم، کاتێکیش دوای دیارنەمانی چوومە ئەو ناوە ژنی یەکێك لەهاورێکانی رەسوڵ پێی وتم (هەر رەسوڵ دەزانێ کچەکەت چی لێ بەسەر هاتووە..) من ونبوونی ئەوو پاشان کوژرانی بەپیلانی مێردەکەی خۆی دەزانم، لەبەرئەوە داوا لەدادگا دەکەم کاری یاسایی بەرامبەر رەسوڵ ئەنجام بدات..

## چۆن کوژراوە ؟ !

کاتێك لەرۆژی ٢٠٠١/٩/٨ داو لەسەر داوای (پۆلیسی ئاشتی) لاشەی (خەرمان) برایە بەشی دادوەریی پزیشکی بۆ پشکنینو دۆزینەوەی هۆکاری مردن، پزیشکی ئەوێ لەراپۆرتەکەیدا نووسیبووی:

-لاشەکەی رزیوەو ئێسکەکانی لەبەر یەك ترازاون، هێشتا سەری لەملی نەبووەتەوە، بەشێك لەپێستی پشتی وشك هەڵاتووە، شکان لەکەللەسەرو

ئێسکەکاندا بەدیناکرێت، هێندە نەبێت شوێنەواری شکانی کۆن لەددانی سەرو خوارەوەی دەمیدا هەستی پێدەکرێت، ئەویش ماوەی شکاندنیان دیاری ناکرێت.. بەڵام دیارە لاشەکە هینی ژنێکەو کەسوکارەکەشی بەهۆی جلەکانییەوە ناسیویانەتەوە، کە لەکاتی مردنیدا ماکسییەکی مارۆنیو بیجامەیەکی قاوەیی گوڵ گوڵی لەبەردا بووە.

## ئەی مێردەکەی چۆن ئەو بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە ؟ !

رەسوڵی مێردی خەرمان، کەلەدایک بووی ١٩٦٠-ەو کاسبکارەو خوێندەواری نییە، بەدادگای بەڕێزی وتووە:

-خەرمان لەساڵی ١٩٨٨-ەوە خێزانم بووە، من ماوەی ٢٥ ساڵ دەبێت بۆ بنێشتکردن لەوەرزەکانی بەهارو هاویندا دەچمە دەرەوە، کەدواجار چووینە (ماخۆبزنان) دووکەس پاسەوانی ناو گوندەکە بوون، چونکە خەڵکەکەی ئاژەڵداربوون، کەخەڵکی ئاژەڵیان دەبردە دەرەوەی گوند ئەوان پاسەوانی ماڵەکانیان بوون، ئێمە لە ٢٠٠١/٦/١٣دا چووینە ئەوێ، بەڵام رۆژی ٧/٢٨ کاتێ لەکانی گەڕاینەوە دەبینم خەرمان دیار نییە، تالەمانگی (٩)دا تەرمەکەی دۆزرایەوە، بەڵام نازانم لەکوێ دۆزرابووەوە، چونکە ئەو کاتە بەتۆمەتی کوشتنی ئەو من زیندانی کرابووم..

ئەو رۆژەی دیار نەما زۆر بەدوایدا گەڕاین، پاسەوانەکانی گوندەکەم لەگەڵدا بوو، بەڵام هیچ ئەنجامێکمان دەستنەکەوت، بۆ سبەینێ هەرسێ منداڵەکەم هێنایەوە بۆ ماڵی برایەکی خەرمان، پاشان لەگەڵ براکەی چووینەوە ئەو گوندەو کەوتینە گەڕان و سۆراخ، بەڵام هیچمان دەستنەکەوت،

لەگـەڵ خێزانەکـەم نێوانمـان بـاش بـوو، بـەڵام مێـشکی تـەواو نـەبوو، دەروجـــیرانم دەیـــانزانی کەماوەیەکـــە ئـــەو حاڵەتـــەی بەســـەردا هــاتبوو..(ئیــدریس) لــەو کــەین و بەینــەو لەســۆراخم بــەدوای خەرمانــدا ئاگادارە.. کەسوکارەکەی راستناکەن کە دەڵێن من کوشتوومە، چۆن دایکی سێ منداڵم دەکوژم، کێ شتی وادەکات؟! من ئاگادارم کە ددانێکی شکابوو، چـونکە هـەر خـۆم بردمـە لای دکتـۆر لەکارێزەوشـك و لەتەکـەی تریـان بـۆ دەرهێنا.. بەڵام لەبیرم نەماوە ددانی سەرەوە بوو یان خوارەوە، چونکە ئەوە پێنج ساڵ لەمەوبەربوو..

گەر بڵێم هەرگیز نێوانمان تێکەنەچووە ئەوە درۆ دەکەم، ژن و مێرد هەیە شەڕیان نەبوو بێت.

## شایەتی ئاگاداریش وتەی خۆی هەبوو..

ئیـدریس، شـەریکی رەسـوڵ لـەدەرهێنانی بنێـشتدا لـەدارەکانی ئـەو ناوچـانەی پـشدەر لـەدادگا گـوێ لـەئیفادەی گـیرا، دوای ئـەوەی دەسـتیدا بەقورئانەکەدا وتی:

–ئەو رۆژە، سەعات ٦,٣٠ی سەرلەبەیانی کوڕە گەورەکەی رەسوڵ هات و ئاگـاداری کـردم کەخـەرمانی دایکـی دیـار نـەماوە، هـەروەها وتـی بـاوکم بەشوێنیدا دەگەڕێت، منیش چووم و کەوتمە سەرو سۆراخی. دوایی دەوری سەعات(٩)پێکەوە چووینە سەنگەسەر، چونکە لەو گوندانەوە هەر یەك رێگا هەیـەو دەچـێتەوە سەرسەنگەسـەر. ئـەو رۆژە رەسـوڵ زۆر شـپرزە بـوو، بـۆ ســەبەینێ منداڵــەکانی بــردەوە بــۆ ســلێمانی، وتــی بــەڵکو ئەمــە خوایــە خــەرمانیش چــووبێتەوە بــۆ ئــەوێ. ئــەوەبوو دوای ماوەیــەکی تــر لاشــەی خەرمان دۆزرایەوە.

من هیچ کاتێك ئاگام لەشەڕو ئاژاوەیان نەبوو، بەڵام زۆر جار لەرەسولّ-م دەبیست کەدەیووت باری دەروونیی ژنەکەم هیلاكوخراپە، هیچ کەسیشمان، نەئێمەو نەڕەسولّ چەکمان لەلانەبوو.

## داواکاران لەخوێنی کچەکەیان دەست هەڵدەگرن..!

یەك رۆژ بەر لەوەی دادگا دوا دانیشتنی خۆی بۆ ئەو کێشەیە بکاتو بڕیاری خۆی دەربکات، باوکی خەرمان دوا قسەی خۆی کردو وتی:

من لەڕێی خواو لەبەرخاتری سێ منداڵەکەی خەرمان لەتۆمەتبار خۆشدەبمو هیچ داوایەکم لەسەری نییە.. چونکە من نازانم ئاخۆ دەوری هەبووە لەلەناوبردنی کچەکەمدا یان نا..!

بەهەمان شێوەش دایکی خەرمان دەستی لەداواکەی لەوەوبەری هەڵگرتو بەدادگای وت:

-من قسەم نەماوە، هیچ پارەیەکیشم لەڕەسولّ وەرنەگرتووەو هیچم لەسەری نییە..!

## بڕیاری دادگا

دادگا" لەبەر رۆشنایی لێکۆڵینەوە سەرەتاییەکانو قەزائییەکانو دوای دانیشتنی ئاشکرای ئەو رۆژە(٢٠٠٣/١/١٤)، بەپێی گوێگرتن لەداواکارانو منداڵەکانی خەرمانو تۆمەتبارو شایەتەکان، گەیشتە ئەو ئەنجامەی لەهەلومەرجێکی تەمومژاویدا (خەرمان ) کوژراوە، هیچ بەڵگەیەکیش نییە بۆ سەلماندنی بەشداریی (رەسولّ) لەکوشتنی ژنەکەیدا، هەر بۆیە دادگا بڕیاری ئەوەیدا(رەسولّ) لەو تۆمەتە بێ بەری بکرێت کەدراوەتە پاڵیو لەزیندان ئازاد دەکرێت..

## رۆحیانەتی خەرمانیش قسەی خۆی هەیە !

ئەو بەدبەختە تەنیا بەجل و بەرگەکەیدا ناسرایەوە، بەهۆی بیجامەیەکی قاوەیی گوڵ گوڵی و ماکسیەکی مارۆنی.. زانرا ئەوە ژنە ٢٥ساڵە بەشمەینەتەکەیە، کە هەر لەمنداڵییەوە کرایە قوربانی دیاردەیەکی گەندەڵ و بڕیارێکی دواکەوتوو، کرابەقوربانی ژن بەژن..

ئەو درا بەپیاوێك بەرامبەر بەژنێك بۆ براکەی خۆی..

هەرچەندە هەر زوو ئەو ساباتە رووخاو بەدەستی (عومەر)ی برای ژنەکەی کوژراو براکەشی چەند ساڵە میوانی زیندانێکی نووتەك و بێ پێکەنین و حەپەساوە..

رۆحیانەتی ئەو چارە رەشە بەدەنگی بەرز دەڵێت:

-بۆ واتانکرد.. راست و چەپی خۆمم نەدەناسی.. بۆ بێ پرسی خۆم و بەو منداڵییە دامتان بەشوو؟!

پاشان بەلالانەوەو لاواندنەوەوە دەنگی بەسۆزی هەڵدەبڕێ و بەهەر سێ جگەر سۆزەکەی دەڵێت:

-مەپرسن، نوری چاوەکانم مەپرسن چۆن کوژرام.. مەپرسن چۆن رەوانەی مەرگ کرام.. فریشتەکانم من دەمێکە کوژراوم.. من هێشتا لەبەهاری تەمەندابووم بەزۆر درامە باوکتان کە رۆژێك لەرۆژان نەیتوانی خۆشییەك بخاتە دڵمەوە.. پاشان پێشی دەوتم شێت وهار..!

دواجار دەزریکێنێت و ئەو رۆحیانەتە بێ ئۆقرەیە دەڵێت:

-خەڵکینە، لەوەتەی براکەم خوشکەکەی رەسوڵی کوشت، هەموو ساتێ چاوەڕوان بووم دڵ و سنگم پڕ لەخوێن کەن.. ئێوەو خودا مەهێڵن جارێکی تر کچان وەك من و ژنەکەی عومەرو ئەوانی تر ببنە میوانی دۆزەخی ژیان.. مەهێڵن خێرلەخۆنەدیوبین.. مەهێڵن..مە..

تەنیا دووساڵ جیاوازی نێوان تەمەنیان بوو،عەلی(٣٦)ساڵو گولاڵە (٣٤) بوو، لەو دوانزە ساڵەی پێکەوە ژیان چوار منداڵیان بوو بوو، دوو کوڕو دوو کچ، بەدرێژایی ئەو ساڵانە عەلی رێزی لەژنەکەیو جوانییەکەی دەگرتو خۆشی دەویست، تەنیا لەو دواییەدا بەهۆی مانەوەی ماڵی کاکی عەلییەوە ناخۆشی کەوتە نێوانیانو عەلی دەرکردە دەریو دوای چەند رۆژێ هێنایەوەو ئاشتی کردەوە.

ئەوەی بووە هۆی تێکدانی شیرازەی ژیانی ئەو ماڵەو لەبەرچاوکەوتنی عەلی لەلایەن گولاڵەوە، کوڕە لاوێکی ١٩ساڵ بوو کە گولاڵە بەجارێ شەیدای بوو بوو، ئەویش بەهەمان شێوە، ئەو کوڕە کەناوی(سەرکەوت) بوو پەیوەندییەکی توندو تۆڵی بەگەورەی ماڵەکەوە هەبوو، سەرکەوت برازای عەلیو هاموشۆکەری بەردەوامی گولاڵە بوو....!

## عەلی...ئاگر سوتانی...!

دوو رۆژ دوای نەورۆزو سەرەتای وەرزی بەهار، سەرکەوت وەك زۆر جاری دیکە ئەو ماڵە مامەی بەسەرکردەوە کەبەلای ئەوەوە خۆشترین ماڵی (سلێمانی)بوو...مامە دڵپاکەکەی بەو پەیوەندییە دزێوەی ژنو برازاکەی نەدەزانی، گەر کەسێ پێشی بووتایە باوەڕی نەدەکرد!

شەو، لەگەڵ چاخواردنو پیاڵە دانانو هەڵگرتنەوەیدا، گولاڵە چاوە گەشەکانی دەبڕییە سەرکەوت، سەرکەوتیش وەك ئەوەی (١٥)ساڵ جیاوازی تەمەنی خۆیو ئامۆژنەکەی نەبێ، بەزەردەخەنەو خۆشویستنەوە وەڵامی چاوەکانی گولاڵەو نیگاکانی دەدایەوە...

دوو ساڵ بوو ئەم لاوە شەیدای چاوو باڵاو گشت جوڵانەوەیەکی ئامۆژنەکەی بوو بوو، دوو ساڵ بوو گولاڵەی دایکی چوار منداڵیش وەك

ئەوەی یەکەم جار بیّ ئاگری عەشق بیسوتیّنی، گیرۆدەی سەرکەوتەکەی بوو، لەزۆر ژووانی دوو قۆڵیدا رازو نیازی خۆیان دەگۆڕییەوە... تادەهات عەلی لەبەرچاوی گولاڵەکەی ناشیرین دەبوو..ئەو خۆشەویستییەکی تر مەستی کرد بوو، خۆشەویستییەکی شیّتانە....

ئەو شەوە منداڵ خەوت و عەلی داوای روخسەتی لەمیوانە برازاکەی کردو چووە ژوورەکەی خۆی تا لەگەڵ گولاڵەکەیدا دەست کەنە ملی خەویّکی قووڵ، جیّ بۆ سەرکەوت راخرا... ئەو (خەو)نەچووە چاوی، بیری لەوە دەکردەوە چۆن لەدوای نەمانی مامەکەی گولاڵە بخوازیّ و تادنیا دنیایە لەگەڵیا بەختەوەرانە بژی...

نیوەشەو رابوردو عەلی لەخەوی شیرینی خۆیدا بوو، بەڵام سەرکەوت و گولاڵە بیّداربوون، هەستان، دەستیان دایە چەکوش و دەسکی دەسکەوان و بیّ رەحمانە بەربوونە سەری عەلی، خویّن لەچەند جیّگای سەریەوە هاتە خوارو بیّ هۆش کەوت، رایانکیّشایە گەرماوەکەو گولاڵە هاتەوە ژوورەکەی و لەویّ خویّنەکەی پاك کردەوە، ئەوجا پەرەمیّز برایە گەرماوەکەو گڕ لەجەستەی عەلی بەردرا...

## راگەیاندنی مەرگی عەلی...

ساتیّ بەسەر بانگی بەیانی تیّپەڕی کردو دوای ئەوەی سەرکەوت بۆی دەرچوو بوو، گولاڵە یان(ژنە پیاو کوژەکە) چووە نانەواخانەکەی گەڕەکی خۆیان بۆنان کڕین، نانی هیّنایەوە، دەکەویّتە زریك و هوڕو هات و هاوار، ئەی هاوار فریام کەون، عەلی ڕۆ، باوکی چوار منداڵم بوو، خەڵکینە مەردی خوا بن بمگەنیّ، عەلی گیان سووتا، عەلی گیان مرد، ئەی هاوار...

دراوسێ، ئەوەی دەنگی گوڵاڵە دەبیستن دەگەنە سەری، دەچنە گەرماوەکەو لاشەی کوژراوو سوتێنراوی کاك عەلی دۆستو دراوسێی بێوەی دێنە دەرێو دەکەونە خۆ ئامادەکردن بۆ مەراسیمی کفنو دفنو بەخاك سپاردنی، هەر بۆ ئەو مەبەستەش دەنێرن بەدوای دایكو براو کەسوکاری عەلی دا.

لەو ناوەدا، دیمەنی هەر چوار منداڵەکەی عەلی، بەدەموچاوی تۆقیوو هەنسکی گریانەوە سوێیان دەخستە دڵەوە، بەجارێ دراوسێکانیان ئەوق کردبوو...

## لاشەی عەلی، ئاوا بینرابوو...

راپۆرتی پزیشك، ئاوا باسی عەلیی کوژراوی کردبوو:

-ئەم پیاوە بالاّ مام ناوەندییە، پێستو قژودەموچاوی سووتاوە، هەروەها چاوەکانی داخراون، لەسەری دراوەو ئێسکی شکاوەو تووشی خوێن بەربوون بووە، دوای ئەوە سووتاوییەکەی زۆر جێگای لەشی گرتووەتەوە.

## کاکی عەلی بەم شێوەیە قسەی بۆ دادوەر کرد....

حسەین(باوك برای)عەلی کەبە تەمەن پانزە ساڵێك لەبرا کوژراوەکەی گەورەتر بوو، بەم شێوەیە قسەی بۆ لێکۆڵینەوەو دادگا کرد:

-من کاتی رووداوەکە لەوێ نەبووم، کاتێ گەڕامەوەو بەرووداوەکەم زانی وەختە بوو شێت بم، هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم گوڵاڵە کاری وای لێ بوەشێتەوە، من لەوەوبەر نەمدەزانیو نەمبیستبوو براژنەکەم پەیوەندی

خراپی لەگەڵ ئەو برازایەماندا بووبێت، بەڵام دایکی عەلی کە باوەژنی منیشە خستمیە گومانەوە، هەر کەپرسەکە تەواو بوو دایکمان شکاتی لەو جووتە کردو گیران، هەر کەگیران دانیان بەتاوانەکەیاندا ناو ئاشکرابوو کەبرا بەدبەختەکەم بەپەرەمێزی گەرماوەکە نەسووتاوە، بەڵکو گولاڵەو سەرکەوت کوشتوویانەو دواتر نەوتیان پیاکردووەو گڕیان تێ بەرداوە... من داوا لەیاسا دەکەم دادوەرانە سزای ئەو دوو مرۆڤە تاوانکارە بدات، کەبوونە هۆی هەتیو کەوتنی چوار منداڵی بێ گوناە...

## دایکی عەلیش وتی....

لەو ٦٥ساڵە پڕ لەکوێرەوەرییەی من تیایدا ژیاوم بەم شێوەیە شپرزە نەبووم، جەرگ سووتان لەهەموو کۆسپێ گرانترە...

من دوو ساڵ بوو گومانم لەسەرکەوت و پەیوەندی خراپی لەگەڵ بووکەکەمدا پەیدا کردبوو، ئەو ژنە نەگریسە چوار منداڵی لەکوڕەکەم هەبوو کەچی خیانەتی لێکرد... داوا دەکەم هەقی ئەو چوار منداڵە بێ نازە لەو دوو تاوانبارە بستێنن.

## بەڕای دادگا..

دادگای جینایاتی سلێمانی، دوای سەرنجدان و لێکۆڵینەوە لەو داوایەو لەئەنجامی دادگایی کردنی هەردوو تاوانبار گولاڵەو سەرکەوت لەرۆژی ١٦/١٠/١٩٩٠بۆی دەرکەوت و رایگەیاند:

ئەمانە ئەمڕۆ هەرچییەك دەڵێن درۆ دەکەن، دەیانەوێ لەتاوانەکەیان پاشگەزببنەوەو وای لە قەڵەم بدەن کەعەلی بەڕێکەوت سووتاوە، بەڵام هەر خۆیان لەلێکۆڵینەوەی سەرەتاییدا لەپۆلیسخانەو دواتریش لای بەڕێز

دادوەری لێکۆڵینەوە بەئاشکرایی تاوانەکەیان باسکردووەو هەموو شتیان وتووە، دیارە لەو شەش مانگ‌و نیوەدا کەئەمانە گیراون بواری بیرکردنەوەو راگۆڕینیان هەبووە، بەڵام ئەمە ناخواو دادگا هیچ بایەخێکی بۆ دانانێ...

چۆنیەتی کوشتنی عەلی بۆ خۆی کارەساتێکی گەورەیەو دوورە لەهەموو بنەماکانی رەوشت‌و ژیانی کۆمەڵگاوەو لەق کردنی کۆڵەکەکانی مرۆڤایەتییە، چ کارەساتێکە ژنێ دوای (١٢)ساڵ ژنێتی پیاوێك‌و پاش ئەوەی (٤)منداڵی لێی ببێ حەز لەیەکێکی تر بکات‌و پیلانی کوشتنی مێردەکەی دارێژێ، کوڕێکیش تەنیا بۆ تێرکردنی حەزە سێکسییەکانی دەستی بچێتە خوێنی مامی خۆی!!!

کەواتە دادگا بەهیچ شێوەك بەزەیی بەم تاوانبارانەدا نایەتەوەو لەپێناوی راگرتنی کۆڵەکەکانی ژیانی کۆمەڵ‌و پاراستنی بەها بەنرخەکانی ژیانی مرۆڤ دەبێ حوکمی هەردوو تاوانبار گوڵاڵەو سەرکەوت بدرێ...

## بڕیاری دادگا..

دادگای بەرێز، بەم شێوەیە بڕیاری بەسەر تاوانبارەکاندا دەرکرد:

١-بڕیاری لەسێدارەدانی گوڵاڵە (تامەرگ).

٢-بڕیاری بەندکردنی هەمیشەیی سەرکەوت(چونکە تەمەنی خوار٢٠ ساڵ بوو،دەنا بڕیاری لەسێدارەدانی دەدرا).

دواتریش لە١٩٩١/٦/١٦دا دادگای تەمیز رەزامەندی لەسەر ئەو بڕیارە نیشاداو هەردوو تاوانبار بەسزای رەوای خۆیان گەیشتن.

رۆژێکی گەرمی مانگی ئاب بوو، کەسوکاری کوژراوەکە لەگەڵ ئەفسەری لێکۆڵینەوەو نوێنەری دادگای سلێمانی چوونە سەر گۆڕێك و یەکێکیان وتی(ئالێرەدا نێژراوە، ئەمە گۆڕەکەی وەنەوشەیە!..).

دەستبەجێ گۆڕەکە هەڵدەدەنەوەو لاشەی ژنێك دەردێنن، دەبینن زمانی هاتووەتە دەرێ و خەریکە لاشەکەی تێك دەچێ، دەیگوێزنەوە بۆ نەخۆشخانەو لەبەشی (پزیشکی دادوەری)پسپۆڕ دەیبینێ و لەراپۆرتەکەیدا دەنووسێ:

-لاشەی ئەم ئافرەتە کەبەپێی نووسراوی پۆلیس لە١٩٩٣/٨/١٥دا مردووەو تەمەنی ٢٥ساڵ بووە، لەحاڵەتی تێکچووندایە، هیچ شکانێ لەئێسکیدا نییە، بەلام گومانی ئەوەی لێ دەکرێ بەهۆی (هەناسەبڕانەوە) مردبێت، واتە خنکێنرابێت، سکی پڕ نییەو دڵنیانین لەوەی حەب یاخود ژەهری خواردبێت، چونکە تاقیگەی ئەوتۆ لەهەرێمدا نییە کەپشکنینی ئەو جۆرە حاڵەتانەی تیا بکرێت، بەلام رەنگی مردووەکە شین هەڵگەڕاوە.

## مەرگی کچەکەی ناوا دیوە..

خاتوون.. شپرزەو پەرێشان، ئا بەم شێوەیە بۆ دادگا دوا:

_ من بێتاوانم، نزیك سەعات ١٢ی شەو بوو، وەنەوشە داوای (چا)ی کرد، منیش بۆم تێکردو دوای خواردنەوەی راکشاین و خەوتین، هەر سەعاتێ دەبوو خەوتبووین بێدار بوومەوە، هەستم کرد گڵۆپی هەیوانەکەی ئەو بەر داگیرساوە، هەڵسام و چوومە هەیوانەکە، لەوێ بینیم میرانی کوڕم لەهۆش خۆی چووەو کەوتووە، بەهەڵەداوان رامکردە ئەو دیو و زەینەب خانی دراوسێمانم لەخەو هەڵسان و بانگم کردە ئەمدیو، کەهاتینەوە چیمان دی، رەبی ئەوەی من دیم هەر دوژمنتان بیبینێ...

زەینەب وتی:

_ سەعات (١)ی شەو لەقاپی درا، دڵم داخورپا، خوایە بەم شەوە درەنگە چی روویدابیٚ؟! بینیم خاتوونەو پەشێواوە، یەکسەر وتی:

_ فریام کەوە، میران لەهۆش خۆی چووە...

لەگەڵیا چوومە ئەو دیو، پێکەوە ئاومان بەدەمو چاوی میراندا پژان، هۆشی هاتەوەو راست بووەوە، میران وتی:

_ وەنەوشە...وەنەوشە مرد!

هەر ئەوەی لەدەم هاتە دەرو خاتوونیش بورایەوە...! خودایە چی بکەم! بەحەپەساویی خۆمەوە چوومە سەرجێگاکەی وەنەوشەو کەسەرنجم دا کوێربم مرد بوو، دەست بەجێ منداڵەکانی ترم خەبەرکردەوەو ناردمن بە شوێن مامەکەیاندا، کەئەو و ژنەکەی گەیشتن خاتوون بەئاگا هاتبووەوە، خاتوون بۆ مەرگی کچەکەی دەگریا، مامیان داوای کرد لاشەی برازا جوانەمەرگەکەی ببرێتە نەخۆشخانە، بەڵام براکانی بەوە رازی نەبوون !! دەستم بشکێ، چەند زوو ئەو گوڵە وەنەوشەیە گۆڕدرا، رەنگە سوورو سپییەکەی نەماو بەجارێ (شین) هەڵگەڕا بوو!!..

## فەریدە:وتیان لەخۆیەوە مردووە

فەریدەی خوشکی وەنەوشە، ئاوا بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە:

_ من لەماڵی خۆم بووم، مەلا بانگدان ئەو هەواڵە جەرگبڕەیان دامێ، کەگەیشتمە ماڵی دایکم بینیم خوشکە کلۆڵەکەم مردووەو دایکم و ئەوان بەدەوریا کۆبوونەتەوە، رەنگی دەموچاوی وەنەوشەی بەدبەخت گۆڕرا بوو، وتم بابیبەینە نەخۆشخانەو بزانین بەچی مردووە، بەڵام دایکم رازی نەبوو، دایکم وتی( هەر لەخۆیەوە مرد، چیت دەوێ، ناتەوێ میران بگرن لەسەری )، زۆریان لێ پاڕامەوە، تکام لێ کردن رازی بن و ئەو خێر لەخۆنەدیوە ببەینە نەخۆشخانە، نەك هەر بەگوێیان نەکردم، بەڵکو میران لێشم تووڕە بوو...

هەروەها فەریدە وتی:

– پێشتر ئاڵتوونەکانی وەنەوشە لەلای من دانرا بوون، بەر لەماوەیەك دایکم هات و داوای کردنەوەو وتی وەنەوشە پێویستی بەپارەیەو هەندێکیانی بۆ دەفرۆشم، بەڵام وانەبوو، راستی نەکرد،بۆ میرانی دەویست، من دڵنیام خوشکەکەم لەخۆیەوە نەمردووە، بەڵکو بەدەستی میران و دایکم کوژراوەو، من شکات لەهەردووکیان دەکەم، داواکارم لەدادگا لەم تاوانە بکۆڵێتەوە.

## براکەی دیکەشیان قسەی کرد...

سامانی برا بچووکیان، بەم شێوەیە باسی مەرگی خوشکەکەی کرد:

– شەوی رووداوەکە من لەماڵی خۆمان نەبووم، کەگەڕامەوە دایکم و میران لەمردنی (وەنەوشە) یان ئاگادار کردم، ئەوان بێ ئاگادارکردنی پۆلیس یان نەخۆشخانە ناشتبوویان... لەوەوبەر هیچ جۆرە گیروگرفتێکم لەنێوانیان و وەنەوشەدا هەست پێ نەکردبوو، بەڵام بەرلەوەی تەڵاق بدرێت مێردەکەی پێی وتم ژیانی لەگەڵ وەنەوشەدا مەحاڵەو ناتوانن درێژە بەژیانی ژن و مێردی خۆیان بدەن....

هەروەها سامان وتی:

–بەرلەماوەیەك ئاڵتوونەکانی خوالێخۆشبووم برد و دامە دەستی فەریدە خان، ئەوەم لەترسی میران کرد، چونکە نیازی بوو ئاڵتوونەکانی وەنەوشە بفرۆشێ و بەپارەکەی بۆی دەرچێ بۆ دەرەوەی وڵات..!

## بۆ چی سالار ژنەکەی تەڵاق دابوو

(سالار)ی تەمەن ٣٨ ساڵ کاسبکار، رۆژی دادگایی کردن بەم شێوەیە قسەی بۆ دادگای بەرێز کرد:

–وەنەوشە هەمووی سێ مانگ ژنی من بوو، نەمتوانی لەتەکیا زیاتر بژیم، چونکە ئەقڵی تەواو نەبوو، هەمیشە ئەو داوای تەڵاقی دەکرد و منیش

رازی نەدەبووم، کەبردمە لای دکتۆر دەرکەوت قوڕ بەسەرە نەخۆشە، ئیدی لەچارەمان نووسرابوو جودا بینەوە..

یەك هەفتە بوو تەڵاقم دابوو، بیستم کەکوژراوە ! سەرەتا نەیانوت کێ کوشتوویەتی، بەڵام دواتر باسی میرانی برای کرا، گوایە ئەوەی لەپێناوی نامووس و شەرەفی خێزانەکەیدا کردووە، بەڵام هەر بۆ خوا دەیڵێم:

وەنەوشە وەك گوڵ وابوو، رەوشتی یەکجار بەرز بوو، هیچ کەسێك شتێکی لێ نەدیوەو هەرگیز پەیوەندیی خراپی نەبووە، من شکاتم نییەو هەقم بەسەر میرانی براشییەوە نییە، چونکە بەر لەو رووداوەی بەسەر ئەو نەگبەتەدا هات، من سێ بەسێ وەنەوشەم تەڵاق داوە..

*وەك لەقسەکانی خەسووەکەشی (خاتوونی دایکی وەنەوشە)دا وترابوو، لەوەوبەر سالار بەخاتوونی وتوە:

_ من ناتوانم لەگەڵیا بژیم، هەرگیز ناتوانم، کچەکەت مێشکی تەواو نییەو وەك شێت وەهایە، جاری وا هەبووە هەموو جلەکانی لەبەر خۆی داکەنیوەو رووت و قووت بەماڵەکەدا هاتوچۆی کردووە!!

## ئایا وەنەوشە نەخۆش بوو؟..

بێجگە لەقسەکانی سالار، ئەوانی دیکەش بەم جۆرە قسەیان بۆ دادگا کرد:

مامی وتی:

-برازاکەم تەواو نەبوو، بەهۆی ئەو نەخۆشییە دوابڕاوەوە لەماڵ و مێرد هەڵی نەکردو تەڵاق درا.

فەریدەی خوشکی وتی:

-بەدبەختە، دووچاری نەخۆشی دەروونی بوو بوو، بەهۆی ئەوەشەوە دەنێردرایەوە ماڵی من و دواجار مێردەکەی تەڵاقی دا..

زەینەب خانی دراوسێی دڵسۆزیان وتی:

-کڵۆڵە نەخۆشی لەگەڵدا بوو.. کوێرایم دایە بۆی، ئەقڵی تێکچوو بوو.!

## ئەی رەوشتی چۆن بوو ؟..

ئـەو ماوەیـەی پێکـەوە ژیـان، سـالاری مێـردی سـەرنجی لەسـەر هەڵسوکەوتی نەبوو، بەڵکو زۆر باش هەڵی سەنگاندووە، مامیشی بەهەمان شـێوە بەرەوشـت جـوان باسـی کردبـوو، فەریـدەی خوشکیـشی شـانازی بەوەنەوشەوە دەکرد..هەروەها دایکی و سامانی برای.

زەینەبی دراوسێشی وتبووی:

-رەوشـتی زۆر جـوان بـوو، سـێ سـاڵ دراوسـێ بـووین، رۆژێ لـەرۆژان کەسێك لەگەڕەکدا وشەیەکی لەسەر نەوتووەو شتێکی خراپیان لێ نەدیوە، تـەنیا کەسـێك رەخنـەو سـەرنجی لەسـەری بـووبێ، هـەر ئـەو کەسـە بـوو کەوەنەوشەی بە(سەر شۆڕیی )خێزانەکەیان دەزانی و دواجاریش بەدەستی ئەو رەوانەی مەرگ کرا، ئەویش میرانی برای بوو.!

## میران، بەویستی خۆی کوشتی و دان بەتاوانەکەیدا دەنێ..

میرانی ٢٦ساڵ، هەر لەلێکۆڵینەوی سەرەتاییدا دانی بەتاوانی کوشتنی خوشـکەکەیدا نـاو دواتـریش بـەوردی و راسـتگۆیی قـسەی بـۆ دادگـا کـرد..بـەوەش دایکـی لەبازنـەی گومـان دوورکەوتـەوەو دواتـریش بـەبڕیاری دادگـا ئـازاد کـرا، بـەلاَم مـیران بـاجی تاوانەکـەی دەدات... مـیران بـەمجۆرە بەسەرهاتی تاوانەکە دەگێڕێتەوە:

-بەڕێزینە، من بەتـەواوی ویـستی خۆمـەوە دانـی پیـادەنێم کەوەنەوشـەی خوشـکم ئابـەم دەسـتانەم خنکێنـرا، دەزانـن چۆن..لەبازاڕی قاچاخـچییەکان

ـوودەرزی ڤالیۆم (١٠)م کڕیو ئەو شەوە (مەبەستم لەشەوی لەناوبردنی وەنەوشەیە)لەنیوەشەودا دەرزییەکانم شکاندو کردمە نێو کوپە چاکەیەوە، هەر بەخواردنەوەی خەوی لێکەوت، کەدایکم نووست پارچە قوماشێکم هێناو خستمە سەردەمو لووتی،بەهێزی خۆم هەناسەم لێ بڕی.. ئیتر گیانی سپاردو دواتر بەمردنی ئەو زانرا،جا بابۆتانی بگێڕمەوە من ئەوەم بۆ کرد..

دوای ئەوەی خوشکەکەم ماوەیەکی کورت لەگەڵ مێردەکەیدا ژیا، بەهۆی نەخۆشی دەروونییەوە، لەو ماوەیەدا کەلەماڵە مێردی خۆیدا دەژیا حەبی مەنعی بەکاردەهێنا، کەچی دوای تەلاق دانیشی هەر دەیخوارد!! بەر گوێم کەوتبوو کەپەیوەندیی خراپی هەیە، کەلێم پرسی دانی بەپەیوەندیی خراپی خۆیو کوڕێکی گەڕەکی خۆماندا نا، بەڵێ پەیوەندیی ناشەریفانەیان هەبوو، بۆ ئەوەی بەجارێ حەیامان نەچێ‌و لەپێناوی ناوبانگی خێزانەکەماندا بڕیارم دا لەناوی بەرم، لای کەس قسەم نەکردو شەوی ١٥ ٨ ١٩٩٣لەکاتێکدا زۆربەی خەڵکی لەخەودا بوون وەنەوشەم خنکاند، دیارە ئەو پەیوەندییە خراپەی خۆی دانی پیادا ناو حەبی مەنعەکەی بەڵگەی تەواون، هەر کەبە مردوویی دیم لەهۆش چووم‌و دوایی کەبەئاگاهاتمەوە بەدایکمم وت وەنەوشە مردووە، ئیتر ئەوە بوو پۆلیسی سلێمانی خۆم‌و دایکمیان گرت.

## داوای بەزەیی....

پارێزەری بەرگریکەر لەمیرانی گومانلێکراو، رۆژی دادگایی کردن وتی:

-بەتەنیا قسەی میران خۆی بەدەستەوەیە بۆ چۆنێتی تاوانەکە، خۆ ئەگەر ئەم قسەی نەکردایە لاشەکەی وەنەوشە کەدەرهێنرابوو تێك چوو بوو، پزیشکیش هۆکاری مردنەکەی دیاری نەکردبوو..

میران پێشتر تاوانی نەکردووەو خاوەنی خێزانە، تکا دەکەم دادگای پایەبەرز لەسزادانیدا بەچاوی بەزەییەوە تێی بڕوانێ...

## میران.... بەرەو زیندان...

ڕۆژی ١٩٩٤/٣/٢٢دادگـای جنایـاتی سـلێمانی دادگـایی مـیرانو دایکـی کـرد، خـاتوون بـەرگریی لـەخۆی کـرد، شـایەتەکان قـسەیان کـرد، مـیران لەهــەموو ئیفادەکــانی لەوەوبــەری پاشــگەز بــووەوە، بــەڵام لای دادوەری لێکۆڵینــەوە بــەئیمزای خۆیــەوە چــۆنێتی تاوانەکــەی تۆمــار بــوو، دادگــا خاتوونی دایکی ئازاد کردو میرانی بە(١٥)ساڵ حوکم دا..

## ڕازێک...

وا (١٠)مــانگو(٦) ڕۆژی تــەواوە وەنەوشــە لــەگۆڕە خامۆشــەکەیدا ڕاکشاوەو.. منیش دەپرسم:

-دەشێ گومانی میران لەجێی خۆیدا بووبێت؟

-ئەدی لەپێناوی ئاڵتوونەکانیدا ئەوەی نەکردووە؟!

-تۆ بڵێی نەخۆشیی ئەو کڵۆڵە هۆکاری یەکەم نەبووبێ..؟

بەڵام یەك وەڵامی ڕاستو ڕەوانم لەلایەو دەڵێت:

-وەنەوشە ئەڵقەیەکی دیکەی تراژیدیای ژنانی ئەم وڵاتەیەو دیمەنێکی دیکەی دواکەوتوویی کۆمەڵی ئێمەیە.

رۆژی ١٥ی شوبات، ژنێك لەگەڕەكی ( ه) بەلەشی زامدارو خوێناوییەوە خرایە ئوتومبێل‌و بەرەو نەخۆشخانەی سلێمانی برا، ئەو شەوە لەحاڵەتی بێ هۆشیدا، لەشی بەچەقۆ كون كونی تیمار كرا، بەلام بەهۆی زامەقووڵەكانی سنگ‌و سك‌و شانیەوە بۆ رۆژی دوایی گیانی لەدەست داو گوێزرایەوە بۆ مەیتخانە، لەوێ زانرا ناوی(ئەختەر)ەو تەمەنی شتێك لەچل ساڵ زیاترەو، هەروەها لەراپۆرتی پزیشكدا نووسرا بوو:

– دیزداشەیەكی شینی لەبەردابوو، بەعەباكەی پۆشرابوو، پێڵاوی لەپێدا نەبوو، بالای مام ناوەندی‌و قژی رەش‌و پێستی گەنم رەنگ بوو، ١٨زامی قووڵ لە لەشیدا بووەو بەهۆی خوێن بەربوونی زۆرەوە مردووە.

لەهەمان كاتدا، بكوژی ئەختەر خۆی دەداتە دەستی بارەگای یەكێك لە لایەنەكان‌و پێیان دەڵێ من كوشتوومە..

### بكوژەكەی ئەختەر لاوێكی تەمەن ٢٦ساڵ بوو..

شایەتەكان وتیان چی؟.

رۆژی ١٩٩٢/٧/٢٠، لەبەردەم دادگا سێ شایەت دەربارەی (ئەختەر)قسەیان كرد:

*یەكەمیان، خوشكێكی گەورەی بوو، بەدادگای وت:

–ئەختەر لەدایكەوە خوشكم بوو، ماوەیەك بوو لەدەمی خەڵكیم دەبیست كەگۆڕراوەو رەوشتی بەرەو نزمی چووە، بەتایبەت لەو كاتەوەی لەمێردەكەی هەڵاتبوو، نازانم شووی بە(دۆستە)تازەكەی كردبوو یان نا..

*ئەوی تریان، خوشکێکی لەخۆی بچووکتری بوو، وتی:

-من لەکەرکوک دەژیم، ئاگام لەکوژرانی باجیم نەبوو، دوایی هاتمە ئێرەو بەرێــژەی رووداوەکــەم زانــی، بــەڵام دەمزانـــی مـــاڵ و مێــردی خــۆی بەجێهێشتووەو، کاری خراپ دەکات، هەروەها بیستبوم بەگوێی کوڕەکەی نەکردووەو نەگەڕاوەتەوە لایان..

*دوا شایەتیش کەحەمە رەشیدی خزمی ئەختەر بوو، وتی:

باشە ئەختەر بەو هەژاری و بێ موچەییە لەکوێی بوو ژوور بگرێ و خۆی بژێنێ، ئەی چۆن لەگەڵ کابرایەکی نەناسدا لەو ماڵەدا ژیاوە؟! مەحاڵە ژنێک تەلاق نەدرابێ بتوانێ شوویەکی تربکاتەوە، دیارە بۆ وای کردووەو چۆن چۆنی خەرجی ژیانی خۆیی پەیدا کردووە، هەرگیز ئەختەر ژنێکی بەشەرەف نەبووە..

## حیکمەت بوو ئەختەری دایە بەر چەقۆ!.

ئەو کوڕەی خۆی دا بەدەستەوە، حیکمەت بوو، کەبەکاسبی کردن دەژیا، هەر زوو دانی بە تاوانەکەیدا ناو لەو پێنج مانگەی لەبەندیخانەشدا بردیە سەر تارۆژی دادگایی کردنی یەک جار پەشیمانی یان نائارامی ویژدان بەلایدا گوزەری نەکرد، چونکە باوەڕی وابوو ئەو کارەی لەپێناوی پاراستنی ناوبانگ و ناموسی خۆی و براکانی و باوکی و خێزانەکەیدا کردووە، جا بائەوەی بەدەستی خۆیشی لەناوچوبێت نزیکترین کەسی بوو بێت!

حیکمەت، زۆر بەهێمنی بەسەرهاتی تاوانەکەی بۆ دادوەر گێڕایەوەو وتی:

-کوژراوەکە دایکی خۆم بوو، من بووم بەم دوو دەستەم دامە بەرچەقۆ، بەو چەقۆ تیژەی بۆ ئەو مەبەستە خستبوومە گیرفانمەوە، دەبا بۆتانی بگێڕمەوە چۆن دەستم چووە خوێنی دایکمو ئەو تاوانەم بۆ چی کرد؟ ئێمە خەڵکی کەرکوکینو لەئەسڵدا گەرمیانین، باوکم ماوەو ئێستا لەگەڵ برا بچووکەکانمدا لەئێران دەژین، دایکم ئێمەی بەجێهێشتو دەستی دایە بەدڕەوشتی، بۆ دامرکاندنەوەی حەزەکانی جارێك چووە ئێرانو دوای چەند مانگێك هاتەوە سلێمانی، دەمزانی هیچ ڕێزێك بۆ مێردەکەیو ئێمە دانانێو کاری ناشرین دەکات، بەڵام من هەر ترسی خوام لەدڵدا بوو، هەر دەمووت دایکمەو دەبێ بیخەمە سەر ڕێگای ڕاست، لەسێ ساڵی رابردوودا بەردەوام بوو لە سەرکردەوەی دزێوی، گەڵێ جار ئامۆژگاریم دەکرد، بەڵام سوودی نەبوو، دەیوت:

-باوکتان منی جێهێشتووەو دەستی لێهەڵگرتووم، ئیتر هەقی منتان چییە؟

خۆ باوکم ئەوی تەڵاق نەدابوو، کردەوە ناشرینەکانی منی شێتوهار کردبوو، کەخزمێکمانم دەبینی دەبوومە دڵۆپێك ئاو، سەرتان نەیەشێنم ماوەیەك هەر لەم شارەدا بزر بوو، نەمدەزانی لەکوێ دەژی، ڕێکەوت جێگەو هەواری نوێیان پێ وتم، کەسۆراخیم کرد زانیم لەماڵێکدا ژوورێکی گرتووەو دۆستێکی ناموبارەکی ناوناوە(مێرد)و لەگەڵیا دەژی!..

ئەوە بوو ماڵەکەم دۆزییەوەو لەقاپیم دا، خاوەن ماڵ وتی (لێرە نییە، بەڵام دەگەڕێتەوە)، لایان دانیشتم، وتم (ئەختەر دایکمە).. گەڕایەوە، هەرچەندە ماوەیەکی زۆر بوو یەکترمان نەدیبوو بەڵام ڕوویەکی وەهاو

سۆزێکی ئەوتۆی نەدامێ، ئەو لەدایك نەدەچوو، لەگەڵ دانانی رەوشتیدا هەموو شتێکی تریشی لەدەست دابوو، چووینە ژوورەکەی خۆی و قسەمان کرد. من زۆرم وت و ئەو کەمی بیست، پێم وت خوا بناسەو وازبێنە، باوکم ماوەیەکە گەڕاوەتەوەو بەشوێنتا عەوداڵە، وەرە بگەڕێوەو لەگەڵیا بژی..پێم وت دایە بگەڕێوە دەنا زەرەردەکەی!.. هیچ سوودی نەبوو، ئەو دەیویست لەگەڵ دۆستەکەیداو لەزەلکاوی خراپەکاریدا بژی.. ئیتر بەبیانوویەك لەماڵەکە بردمە دەرەوەو خوارتر لەکۆڵانێکدا فرسەتم لێهێناو بەچەقۆکەم گیانیم هەنجن هەنجن کرد..

پاش ماوەیەك بێدەنگی، حیکمەت رووی کردە دادوەرو وتی:

-گەورەم، لەئاکامی بێ نامووسی ئەودا من تاوانم کرد، لەپێناوی شەرەفدا ئەو کارەم کرد، خوا ئاگادارە لەمەوبەر هەرگیز تاوانم نەکردوەو بەم دەستانەی من چۆلەکەیەك نەکوژراوە..

## تەنیا ساڵێك زیندانی کردن..

بەڕای دادگای بەڕێز، کێشەکانی ئەم تاوانە سەلماندوویانە کەئەختەر رەوشتی لەدەستداوەو بۆ دامرکانەوەی ئارەزووە سێکسییەکانی ماڵ و مێردو منداڵی جێهێشتووەو بێباك بووە بەرامبەریان..

ئەو کەسەش کەلەدواییدا لەگەڵیا ژیاوە بەرەسمی مێردی نەبووە.. حیکمەتی کوڕیشی، لەپێناوی رەوشت و خێزانەکەیانداو پاراستنی ئادابی گشتی ئەو کارەی کردووە..

هەر بۆیە دادگا بڕیاری زیندانی کردنی حیکمەتی دا بۆماوەی یەك ساڵو ماوەی دەستگیرکردنەکەشی کەدەکاتە پێنج مانگ حساب دەکرێت..

بەو بڕیارەی دادگای جنایاتی سلێمانی، پەردە لەسەر بەسەرهاتی ئەو تاوانە دادرایەوەو حیکمەت لەزینداندا مایەوە، تا باجی کوشتنی مرۆڤێك بدات کەسەرکێشی خۆیو دواکەوتوویی کۆمەڵ ئەو ژیانەی بەنسیب کرد بوو.

رۆژی ٢٠٠٢/٤/٢٨، ژنێکی تەمەن (٢٠)ساڵ بەشەرمەوە لەبەردەم دادگای کەتنی سلێمانی راوەستا، چاوەکانی روو لەزەوی بوون‌و جارجارە سەرێکی هەڵدەبڕی‌و سەرنجێکی دەموچاوی دادوەری دەدا..

ئەو ساڵێك‌و دوو مانگ بوو لەزیندان بوو. لەوێ روو لەخوداو پێنج فەرزە لەسەر بەرماڵ دەپاڕایەوە کە لەگوناهە زۆرەکانی پاك بێتەوە.. دادگا سەرقاڵی دیتنی ئەوراقەکان بوون‌و ئەمیش بەجەستەی نیوەمردووەوە چاوەڕوانی قسەیەکی دادوەر بوو.. جارجارە هەر لەدڵی خۆیدا دەیووت: (خوای گەورە بمبەخشە.. خەتای خۆم نەبوو، رەبی ئەوانە نەحەسێنەوە لەژیانی خۆیان کەوەکو دڕندە پەلاماری ژن دەدەن..).

لەپڕێکدا دەنگی دادوەری بەڕێز هێنایەوە هۆش، هەموو گیانی هەست‌و گوێگرتن بوو لەدادوەر، بەشەرمەوە سەری هەڵبڕی‌و چاوە بچووکەکانی بڕییە ئەو، ئەویش دوای تەماشایەکی ئەم‌و نووسەرەکەی بەردەمی، گوتی بنووسە:

-دوای سەلماندنی ئەوەی هەموو بەڵگەکان کەدژی تۆمەتبار (بەهرە عەبدوڵڵا)ن، بەپێی ماددەی (٤) لەیاسای قەلاچۆکردنی لەشفرۆشی بڕیارماندا بەتاوانبارکردنت‌و حوکمدانت بەحەپسکردن بۆ ماوەی یەك ساڵ، دیارە ماوەی گرتنت لە٢٠٠١/٣/٣٠ تا ٢٠٠٢/٤/٢٧ لەو حوکمە حساب دەکرێ، لەبەرئەوەی بۆ ئەم دادگایە سەلماوە کە بەفیعلی ئەو ساڵەت لەزینداندا بردووەتە سەر، هەر بۆیە بڕیارماندا بەئازادکردنت بەمەرجێ هیچ رێگرێکی دیکەی یاسایی نەبێت لەبەردەمتا.

(بەهرە) تەماشای دادوەری دەکردو لەبەرخۆیەوە گوتی:

-خوا پاداشتت بداتەوە، خوایە سەد گوناهو یەك تەوبە..

## لەشەوە درێژەکانی زینداندا

سێ ژن بوون لەژوورەکەدا، یەکیان لەگۆشەیەکدا هەمیشە مات و مەلوول و لەگەڵ بەبادانی دووکەڵی جگەرەیەکدا کاتەکانی دەبردەسەر، بەهرەو ئەوی یەکەمیش دۆشەکەکانیان جووت دەکردو دەکەوتنە هەڵڕشتنی بەسەرهات و سکالایان بۆیەکتر..

جارجارە ژنەی ئەوسەر سەرزەنشتی دەکردن و دەیووت:

-ئەرێ شەویلگەتان شل نەبوو.. ئەرێ کاکیلەتان نایەشێ، دەرۆڵە بەسەو بنوون. واخەریکە رۆژدەبێتەوە..

ئەمانیش دەیانووت:

-خەمت نەبێ زۆر رۆژی تریش دەکەینەوە، تۆ بنوو خەمی ئێمەت نەبێ..

هەموو شەوێ کە دەستیان ئەنایە ژێرسەرو چاویان دەبڕیە یەکترو سەرەتای بەسەرهاتی پڕ لەمەینەتی ژیانی خۆیان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە، بەدووسێ رستە (ئەختەر) قسەی دادەمەزراندو دەیگووت:

-نەوەڵلا هەرگیز پەشیمان نیم، گەر جارێکی تریش راست بێتەوە دەیکوژم و لاری دەکەمەوە.. مێردێ زوخاو بکات بەگەرووتا، لەبری بردنە سەیران و گەڕان دارکاریت بکات بۆچی باشە.. ئەرێ وەڵلا هەر کەگیرام و پرسیارم لێکرا یەکسەر بەدەنگی بەرز هاوارم کرد بەڵێ من کوشتم، بەم دەستانەی خۆم کوشتم..

بەهرە لەسەرخۆ قسەی پێدەبڕێ و دەڵێ:

-خۆزگە هەر جیابوویتایەوە لێی و ئەو تاوانەت نەکردایە..

-نا کچی خۆم.. کوڕو کچی گەورەمان هەبوو هەزارو یەك قسەی دەخستە شوێنم.. ترسی خوای لەدڵدا نەبوو، بەزەیی بەمن و منداڵەکاندا نەدەهاتەوە.. هەر کەرۆژێ لەبازاڕ گرفتێکی بوایە یان زەرەرێکی بکردایە ئیتر بەمنی دەڕشت..

نا کچی من لۆمەم مەکە.. چاکم کرد.. خوا خۆیشی عەفووم دەکاتو چاوی بەزەیی لەزوڵم لێکراوانەوە دەبێ..

## بەهرە بۆ وای بەسەرهات؟

ئەو نەخوێندەوار بوو، واتە نەیدەزانی هیچ بنووسێ و بخوێنێتەوە، تەمەنی تەنیا ١٠ ساڵ بوو کەلەهەولێر خودا پێکەوە دایكو باوکی بردنەوە بارەگای خۆیو لەنازی ئەوان بێبەش بوو، بەو منداڵییە لەگەڵ پوورێکیدا چوونە ئێرانو لەوێ لەشارێکی کوردنشیندا جێگیربوون..

دوای سێ ساڵ بەهرە وەك نەمامێکی هەڵکشاو هەندێ گەورەتر خۆی دەنواندو زوو زوو پورەکەی پێی دەگووت (عەیار.. تەماشا بوویتە ژنێکی گەورە!.) هەندێ جاریش دەیاندا بەگوێیداو دەیانووت (بەهرە وەختی شوویەتی..)، لەنێوان شەرمو راماندا نەیدەزانی چۆن وەڵامیان بداتەوە..

کابرایەکی خاوەنی جووتێ ژن چاوی تەماعی بڕییە بەهرەو لەدەرگای ماڵیانی داو بووە یەکەمین خوازبێنیکەر، پوورەکەی ویستی پاڵی پێوەنێ، هەواڵیان نارد بۆ برایەکی بەهرەو ئەویش رازی بوو..

بەهرە برایە ماڵە مێردو تا دووسێ مانگ هەر بەواقی وڕماوەوە تەماشای پیاوەکەی دەکرد.. هەمیشە لەجەستەیەکی بێگیان دەچوو لەبەردەم باڵندەیەکی هاردا.. هەمیشە دڵگەرمو سەر پڕلەئێش لەبەردەم قسەو بۆڵەی دوو ژنی تردا.!

پیاوەکەی بەجنێوو قسەی ناشرین دەیدواند، ژیانی ژنو مێردیی ئەو روویکردە ساڵێکی تەمەن، پیاوە خراپتر بوو لەگەڵیو زۆرجار ئەو کچۆڵە بێنازە دەکەوتە بەر چنگو بەر شەقی ئەوو بەلاشەی ماندووەوە فرمێسکە گەرمەکانی چاوی دەسڕی..

رۆژێك هەڵات و چووەوە لای پوورەكەی، لەوێ وتی:
-پووریێ خراپن لەگەڵم، ناچمەوە لایان و ژیانی وام ناوێ.. من هەر لای تۆ دەبم. نانە رەقێكم پێبدەی لەپارووی چەورو گەرمی ئەوان باشترە..
-ناكچی خۆم نابێ، ئەیەڕۆ حەیامان دەچێ.. كاك حەمەڕەشی پیاوی چاكەو تۆی خۆشدەوێ.. بۆ ناتەوێ سەرلەخۆت و منیش تێك بدەیت!!
بەزۆر ناردیەوە، وایدەزانی بۆ دۆزەخ دەبرێتەوە، چەند رۆژێكی تر دانی بەخۆداگرت.. لەسەر تۆرانەكەی زۆری پێكراو زۆری لێدرا.. ناچار بڕیاریدا سەری خۆی هەڵگرێ و دوور دوور بڕوات.. دوور لەچاوە زیتەكانی مێردەكەی و دوور لەتانووت و قسەی ناخۆشی هەردوو ژنەكەی تری حەمەرەشی لەشوێنێكدا ئارام بگرێ.. بەڵام..!

## پیاوەكانی تر !

لەشەوێكی درێژی زینداندا، درێژ وەك خەمەكانی بەهرەو تاریك وەك دەروونی مات و خامۆشی ئەختەر، بەسەرهات دامەزرابوو..
بەهرە بەسەرهاتی راكردنی خۆی دەگێڕایەوە. بەهرە وتی:
-باجی ئەختەر، هەرچۆنێ بوو خۆم گەیاندە كۆیە، لەوێ چوومەماڵی خزمێكی زاواكەمان.. چەند رۆژێ لەوێ مامەوەو بۆ نەگبەتی (دلێر) ناوێكی ناسیاویان هاتە ماڵەكەو منی بینی و منی ناسی..
سەرەتا نەمدەزانی بۆچی وا زوو زوو ئەو دلێرە دەهاتە سەردانیان، دوایی زانیم دەیەوێ زۆرتر من بدوێنێ و لێم نزیك بێتەوە..
-ئەی ژن و منداڵی نەبوو؟
-با.. بەرێ وەڵڵا هەیبوو.. جارێك هێنانی بۆ كۆیەو لەگەڵ خۆیاندا بردمی بۆ بازاڕو تەنوورەو بلوزێكی بۆ منیش كڕی..
هەر لەو سەفەرەیاندا خۆی و ژنەكەی هاتنە بن كلێشەم و دایان بەگوێمدا كە لەگەڵیاندا بچمە سلێمانی، سەرەتا رازی نەبووم، بەڵام بەزۆری ئەوان و

بەو بیانووەی کە لەوێ ژیانی خۆشتر دەبەمە سەرو با بەچاوی خۆم ببینمو تاقی بکەمەوە، هەڵیانفریواندمو چووم..

-ئەی ماڵەکەی ئاشناتان..

-چی بڵێن، وتیان بەینێك لەگەڵ خۆمان دەیبەین، ژنەکەی دلێر وتی وەکو خوشکی خۆم سەیری دەکەم.. دلێر خۆیشی پێی وتن ئێمەو ئێوە یەك ماڵین.. ئێ ئەوانیش چ مەجبوور بوون خزمەتی منێکی کلۆڵو چارەڕەش بکەن!

ئەمە روویداو کاك عوسمانی خاوەن ماڵ لەوێ نەبوو.. واتە کە لەگەڵیان رۆیشتم ئەو لەماڵ نەبوو..

-چوونە سلێمانی؟

-بەڵێ لەگەڕەکێکی دەرەوەی شار بوون، کرێچی خانوویەکی بچووكو چوار سەرخێزان بوون، واتە دوو کوڕی بچکۆلەشیان هەبوو..

ئیتر لەوێ هەر لەسەرەتاوە ژنەکەی دلێر هەندێ شتی سەیری بۆ باس دەکردم.. دەیدا بەگوێمدا کەپیاوانیش بناسم ئاساییەو دلێر قسەناکات..

-خوایە تۆبە.. ئێ پاشان..

-دوای چەند رۆژێ کابرایەك بووە میوانیان، هەر دلێر خۆی بەزۆر رازی کردم لەژوورەکەی ئەودیو لەگەڵی بنووم.. زۆرم هەوڵدا ئەوە روونەدات، بەڵام بەزۆری خۆیو ژنەکەی رازییان کردم.. بەیانی کەپیاوەکە رۆی ١٠٠ دیناری دامێ.. ئەوە یەکەمجار بوو پارەی شتی وابێتە گیرفانی بەتاڵمەوە..

-ئەی نەگبەتی چارەڕەش..

-دەتۆ بوەستە بابۆتی باس بکەم.. دووسێ رۆژ دوای ئەوە دلێر خۆی هات بەلامدا.. وتم عەیبە کاك دلێر چۆن شتی وا دەڵێی، وتی کەرە ژنەکەی خۆیشم شتی وادەکات.. رازی کردم.. چەند جارێ تەعەدای لێ کردم..! ژنەکەشی ئاگاداربوو.. تەنانەت رۆژێك کوڕێکی لەگەڵ بوو کە بەپیکابێکی

دەبێ کابینەوە هاتنەوەو کوڕەکە کلاشینکۆفیشی پێبوو.. شەو پێکەوە خواردیانەوەو لەگەڵ منو ژنەکەی دلێر رایبوارد..

پاش هەفتەیەك کاك عوسمانی خزمی مێردی خوشکەکەم هاتە دوام، وتی دەبێ بڕۆینەوە ماڵی خۆمان.. دلێر نەیهێشت، وتی من مارەی دەکەمو بەپێی شەرع دەبێتە حەڵاڵم، هەرچەندە زۆری وت ئاخر لەکوێ دوو ژنت بۆ بەخێودەکرێو چۆن دەژین، سوودی نەبوو..

کابرای رازی کردو لەوێ مامەوە.. پاش ماوەیەك لەزەرگەتە خانوویەکی دوو هۆدەیی بەکرێ گرتو گواستمانەوە ئەوێ..

چەند جارێ کاری بێڕەوشتی دووبارەبووەوە، من ناچاربوومو ناچاردەکرام.. ئەگینا بەو خوایە حەزم بەوانە نەبوو.. شەوێك دووسێ کەس هاتن لەگەڵیان بچینە دەرەوە منو ژنەکەی دلێر ناڕازی بووین، دلێر خۆیشی ئەوەی دەویست، بەڵام ئێمە هەر ناڕازی بووین، دەمانچەیان لێ راکێشاینو لەو شەوە درەنگەدا کردیانە تەقەو پێکەوە ژنەکەی دلێرو کوێرایم دایەت دوو کوڕە بچکۆلەکەیان کوژران..

-ئێ دوایی.. ئەی ئێوە چیتان کرد؟

-خەبەری پۆلیسمان دا.. ئێمەش گیراین، بەڵام کە دادگایی کراین لەتاوانی کوشتنی ئەواندا ئێمە بێ گوناه بووین.. ئیتر دادگا بڕیاری دا بەجیا لەوانە بپرسنەوە کەخوێنی دایكو کوڕەکانیان رشت..

-تۆ خۆت بەساڵێك حوکم درایت؟

-بەڵێ، بەڵام بەتاوانی لەشفرۆشی، ئەو تاوانەی کە بەهۆی پیاوەکان خۆیانەوە پێی تاوانبارو بەدناوو بەدڕەوشت کرام..

-دەئیتر بنوو سەرت لەقوڕنێن.. بنوو واخەریکە رۆژبێتەوە.

مەلا بانگیداو ئەختەر چاوەکانی لێکناو خەوت.. بەڵام بەهرە هەر بێدرابوو، ئەو بەرەبەیانەو زۆر کاتی تری نێو زیندان خەیاڵی دەیبردەوە بۆ ماڵە پڕ لەئاژاوەکەی ئێرانی، یان ساتەکانی نان خواردن لەگەڵ خزمەکانی

کۆیــەی، یــاخود ئەوکاتانــەی پیــاوە نــەدیوو نەناســراوەکان وەکــو درنــدە بەردەبوونە گیانی.. بەدرێژایی ڕۆژی دواییش بیری لەوە دەکردەوە وا ئازاد دەکــرێ‌و ڕوو لــەکوێ بکــات، ئــاخۆ یــەکێ لــەو ســەنتەرانەی بــۆ ژنــانی بەشمەینەتی وەك ئەم دانراون‌و توێژەری کۆمەڵایەتی زیندانەکە باسی بۆ دەکرد بتوانێ دالّدەی بدات‌و تیایدا هەناسەیەکی بەختەوەری هەڵمژێ.. نەیدەزانی وادەبێ.. یان نا!!

**خورپەیەك بۆ ئەو بەهرەیەو بەهرەکانی تر..**

ئەو ناوی بەهرەیە، بەڵام هیچ بەهرەیەکی ژینی بەنسیب نەبووە، ئەو جوانە، بەڵام جوانییەکەی نەبووەتە گوڵێکی سەر ڕێگای.. ئەو ڕەگەزی مێیە، بەڵام سروشت‌و ڕۆژگارو دەوروبەر پێکەوە دڵڕەق بوون لەگەڵیا..

لێرەدا پرسیارێ دێتە پێشەوەو دەڵێ:

-بەهرەکان خەتای خۆیانە یان بەرامبەرەکانیان گیرۆدەیان دەکەن؟!

ئەو لەزیندان ئازاد دەبێ، بەڵام ئاخۆ خەونەکەی دێتەدی‌و سەنتەرێك دەبێتە ماڵی نوێی..

دەشێ بەو خەونە بگات، بەڵام دڵنیام دڵی هەمیشە خورپەیەکی تێدایەو خۆیشی نازانێ کەی ئەو خورپەیە کۆتایی پێ‌دێت..

منیش وەك زۆرجاری دیکە، دڵ پڕ لەخورپەم بۆ ئەو بەهرە بەدبەختەو بەهرەکانی تر کەژیان هەرگیز یارو یاوەریان نەبووەو خۆشیان ساویلکەو کاڵفام بوون‌و کەشتیی نێو ڕووباری تەمەن چۆنی ویستبێ لەگەڵ خۆیدا بردوونی..!

رۆژی ١٩٩٦/٨/٥كـه دوا دادگـايـی ژنێـك كـرا، بـاجی خونـچەی تەمـەن (٦٠)سـاڵ پرچـە سـپییەكانی كـردەوە بـەژێر سەرپۆشـەكەیداو بەچـاوی پـڕ لەفرمێسكەوە قسەی بۆ سەرۆكی دادگا كرد، باجی خونچە وتی:

-بـەیانی زوو بـۆ كاسـبی كـردن كوڕەكـەم لـەماڵ دەرچـوو، ئـیتر هـەر ئـەو رۆیـشتنە بـوو و نەگەڕایـەوە، وەكـو هـەموو ئێـوارانی تـر دەرگـای مـاڵی نەكردەوە، شەو تابەیان منو باوكە كلۆڵەكەی بێدار بووینو خەو نەچووە چاومان، بانگی بـەیانیی فـەرموو و جـەمال هـەر نەهاتـەوە، بۆ رۆژی دوایـی نزیك نیوەڕۆ هەواڵیان هێنا كەجەمال كوژراوە..هاوار وزریكەی منو گریـانی باوكە پیرەمێردەكەی دنیـای خرۆشان.. بـەڵام چـی بكـەم، جـەمالم رۆیـشتو نەمدیەوە.!

كـوێرایم دایــە، كــەماڵی جێهێــشت قەمــسەڵە تازەكــەی لەبــەردابوو، دەمانچەكەیو چەند هەزار دینارێكی پێ بوو..

من داواكارم سزای ئـەو تاوانبارانە بدرێو تۆڵـەی كوشـتنی كوڕەكـەمیان لێبسێنرێ، هەروەهاچییان بردوە بۆمانی بگێڕنەوە..

## ئاشكرابوونی كوژرانی جەمال..

شـەو درەنگـانێ، سـەركەوت لەگـەڕەكی (ك)خـۆی كـرد بـەماڵی خاڵیـدا، شـپرزەو هەناسەسـوار، بەرلـەوەی پـشوویەك بـدات خـاڵی بـانگ كـردە لاوەو پێی وت:چی روویداوە؟

سەركەوت وتی:

-خاڵە گیان، كوڕێكیان كوشتو من ئاگام لێی بوو..

خاڵی لێی پرسی:

-مکوێ. کەی.. ئەی تۆ چیت دەکرد لەوێ؟!

بەحنگی تاساوەوە وەڵامی دایەوە:

-مگەرەکی(ا)پاش نیوەڕۆ کوشتیانو شەوێ لاشەکەیان فرێ دا، ئیتر من

ـ کسیە بەکرێ گرتو هاتم بۆ ئێرە، من ماڵی بکوژەکانی ئەو کوڕە دەزانم..

خانی سەرکەوت پرسی: ناوی چی بوو؟

-جەمال.. جەمالی ناو بوو..

کەمێ سەرکەوتی هێور کردەوە، پاشان پێی وت:

-کەواتە بۆمی باس بکە، بزانم بۆچی کوشتیان، بەیانی زوو ئاسایش

ـگادار دەکەین..

خوشکەزا رەنگ پەڕیوەکەی، دەستی کرد بەگێڕانەوەی چۆنێتی

ـوانەکە..

## جەمال چۆن کوژرا؟

دوای نیوەڕۆ بوو، لەبازاڕێکی سلێمانی، هەر کەجەمال گەیشتە ئاسیاوەکانیو سلاوی لێ کردن، دەمانچە ستارە گەورەکەی بەرپشتێنەکەی سەرنجی (کاوە)ی راکێشا، کاوە وتی:

-جەمال، ئادەی دەمانچەکەتم بدەرێ..

دایە دەستیو ئەویش یەدەکی فیشەکەکانی لێ دەرهێناو رایکێشاو پەنجەی پیا نا، کەمێ لێی ورد بووەوە، ئینجا دایەوە دەستی..

کاوە بەجەمالی وت:

-لەماڵەوە تفەنگێکی جوانمان لایە، گەر دەتەوێ با لەگەڵ سەرکەوتو جەزا بچینەوەو بیبینە..

جەمال بێ دوو دڵی وتی:

-زۆر باشە، بابڕۆین..

هەر خۆی دەستی لەئوتومبیلێکی کرێ راگرت و بەرەو گەڕەکی (ا) کەوتنەڕێ، دابەزین و چوونە ماڵ، دایکی کاوە بەخێرهاتنی گەرمی لێکردن، لەسەرێ دانەنیشتن و یەکسەر رووەو ژێرزەمین ملیان نا.. هەرچواریان (کاوەو سەرکەوت و جەزا لەگەڵ جەمال) بەقاڵدرمەکانی ژێرزەمیندا شۆڕبوونەوە، لەوێ کلاشینکۆفێکیان دایە دەستی جەمال، بەرلەوەی وشەیەکی لەدەم بێتەدەر، هەرسێ زەلام پەلاماریاندا، دووانیان گوریسێکیان جەڕاندە ملی و ئەوی دیکەیان بەتانیەکی نایەسەر دەم وچاوی.. هەناسە لەگەروویدا خنکاو کاتێ دەستیان لێ بەردا رۆحی تیا نەمابوو..

لەسەر زەوییەکە کەوت و کاوە دەمانچەکەی لێ کردەوەو کردی بە بەرپشتێنەکەی خۆیدا، راستیان کردەوەو قەمسەڵەکەیان لەبەردا داکەند..

دواجار، هەر کاوە دەستی کرد بەگیرفانی کراسەکەیداو چی پارەی تیابوو دەریهێنا.. لاشەی کوژراوەکەیان جێهێشت و چوونەوە سەرێ، لەهۆڵەکەدا دانیشتن، دایکی کاوە چای بۆ هێنان، پێدەچوو ئاگاداری تاوانی کوڕەکەی و میوانەکانی بێت، هەر بۆیە پرسیاری هیچی نەکرد.. تاشەو داهات لەماڵ مانەوەو پاشان سەرکەوت پرسی:

-چی لەلاشەکەی دەکەن؟

کاوە وەڵامی دایەوە:

-ئەوە گرفت نییە، هانێ تۆ جارێ بگرە..

لەپارەکەی جەماڵی کوژراو یەکی ٢٠٠دیناری دایە دەستی سەرکەوت و جەزا..ئینجا رووی کردە دایکی:

-ها بیگرە، ئەو ٢٠٠ دینارەش بۆ تۆ..

کاوە وتی:

-بەڕاست چی لەم کوڕژاوە بکەین؟!

جەزا وەڵامی دایەوە:

-خەمتان نەبێ، ماڵی خزمێکم لێرەوە نزیکەو(حفارە)یان هەیە، دەچم دەیهێنمو بەوە دەیگوێزینەوە..

جەزا ڕۆیشت، کاوە سەرنجی دایە سەرکەوت و پاش ماوەیەك پێی وت:

-چییە کوڕی باش، دەترسیت؟

سەرکەوت دەیویست کۆنترۆڵی خۆی بکات..

-ها.. نازانم..نەء،نەء..

پاش ماوەیەك جەزا گەڕایەوەو خۆی کرد بەژووردا.. ڕووی تێکردن و وتی:

-خزمەکەمم دەست نەکەوت، بەڵام(لادا)ی برادەرێکم هێناوە، دەی گورج کەن بابیبەین..

## بەڕێکردنی جەمال !

هەرسێ تاوانبار چوونەوە ژێر زەمینەکەو دایکی کاوەش لەبەر دەرگاکەیدا ڕاوەستا، لاشەی جەمالیان خستە نێو گونییەکی گەورەوەو هێنایانە سەرێ،سندووقی تاکسییەکەیان بۆ کردەوەو خستیانە ناوی..

جەزا سلفی لێ داو دایکی کاوە لەپێشەوە لایەوە سوار بوو، کاوەو سەرکەوتیش لەدواوە، بەرەو شەقامی شەست مەتری کەوتنەڕێو لەولا بەنزیخانەکەوە ڕاوەستان، سندوقەکەیان هەڵدایەوەو لاشەکەیان فرێدا..!

کاوەو دایکی برانەوە ماڵێ‌و لەوێشەوە سەرکەوت دابەزیو، جەزا ئوتومبێلەکەی بردەوە بۆ خاوەنی..

ئەو شەوە، دایکی جەمال خەو لەچاوی نەکەوت‌و، بەتەنیا هەر مانگەشەویش ئاگاداری لاشەی کوڕە بەزوڵم کوژراوەکەی بوو..

پەیمانی(مانگ)ی زیوین ئەو شەوە وابوو بۆ تەنیا چرکەیەکیش جەمالی بێ گوناهـ فەرامۆش نەکات..

گەر ئەو مانگە بەوەفایە زمانی ببوایە ئەوا هەمووخەڵکی رادەچڵەکاندو تەرمەکەی جەمالی نیشان دەدان..

## سزای تاوانبارەکان..

دایکی کاوە، بەتەنیا تاوانی بەشداریی شاردنەوەی تەرمی کوژراوەکەی بەسەردا ساغ بوەوە، هەربۆیە حوکمی دووساڵ زیندانی کردنی بەسەردا درا.. تاوانبارەکانی دیکەش، سەرکەوت بە١٥ساڵ زیندانی کردن حوکم درا، دووانەکەی تریش چونکە لەدادگا هەڵاتوون کێشەکانیان ماوەتەوە..

بێجگە لەو حوکمانەی یاسا:

*داخۆ جەرگی سووتاوی دایکی جەمال چی لەو ژنە ٤٤ساڵە دەکات کە زۆر بێ بەزەیی بەشداریی فڕێدانی لاشەی مرۆڤێکی کرد کەبە(میوانی) هاتەماڵەکەی؟!!

رۆژێکی نەورۆزی، دنیا جوانتر لەجاران و سروشت رازاوەتر، (سوعاد) دەیڕوانییە شەقامە سەرەکییەکەو جارجارەش لەبەرخۆوە قسەی بۆ کوڕە یەك ساڵەکەی دەکرد..

-کوڕی شیرینم تۆش گەورەدەبی و دەخوێنی و دەبیتە پیاوێکی تەواو.. تۆش وەك ئەو خەڵکە ئوتومبێلت دەبێ و ئەوسا دایکت لەتەنیشت خۆتەوە دادەنێیت و دەیبەیت بۆ سەیرانی دوکان..

ئە رۆژە یەکەم رۆژی بەهاری ساڵی پار بوو، ئوتومبێلە رەنگاوڕەنگەکان هەندێکیان تیژڕەوو خێرا، هەندێکیش لەسەرخۆو هێدی، شەقامەکەو بەرچاوی (سوعاد)یان جێدەهێشت..

وەك ئەوەی شتێکی بیرکەوتبێتەوە لەپڕێکدا بانگی کردە کوڕە بچکۆلەکەی:

-سامان.. سامان چیت لێهات..

ئیدی بەدوایدا چووە ژوورە بچووکەکەیان، ئەو ژوورەی زۆربەی کاتەکانی دووساڵی رابردووی ژیانی ژن و مێردیی خۆی بەدڵتەنگی و بەئاژاوەی خۆی و قالەی مێردی تێدا بەسەربردبوو..

## ژیان لەگەڵ ماڵە خەزوور..

نیو سەعاتێ رێگا، دوور لەشار، لەکێڵگەیەکی گەورەی پیاوێکی موڵکداردا دەژیان، هەموو جێگاو رێگایان دوو ژوور بوو، تەنیا دوو ژوور بۆ دوو ماڵ، ئەمان، خۆی و مێردەکەی و منداڵەکەیان لەژوورێکداو ماڵی خەزوورەکەشی باوکی قالەو دایکی و برایەکی لەخۆی بچووکتری لەژوورەکەی تردا دەژیان..

قالە بەرۆژ دەچووە شار بۆ کاسبی سەرپێ یی، دوو ساڵ بوو ماڵە باوانی جێهێشتبوو بەنیازی پێکهێنانی خێزان و ژیانێکی باشتر بوو بووە

ـێـی قالـه.. بـەڵام دوو سـاڵ بـوو کـەم رۆژ بێگرفـت بـوون.. هەمیـشە دادو
بیـداد‌یان بوو لەدەست یەکتر..

سوعاد لای کەسوکاری خۆیو ماڵی خەزووری دەیووت:

-خراپە لەگەڵم، واسواسەو دڵی پیسە لێم.. کەقسە لەگەڵ کەسێك بکەم
حـیوە پێدەداتو دەستی وردبێ لێشم دەدات..

قالەش بەدایكو باوکی خۆیو ژنبراکانی دەووت:

-ئافرەتێکی بێگوێو بێتەربێتە.. بەقسەم ناکاتو ئیحترامم ناگرێ، من
گومانی خراپیشم لێی هەیە..!

جاری واهەبوو ژنـە دەتـۆرا.. پـاش چـەند رۆژێـك دەهێنرایـەوە، قالـە
سوێندی بۆ دەخوارد کەئیتر بەئاسوودەیی بژینو ئیتر دڵی لێی پیس نەبێو
عەزیـەتی نـەدات.. بـەڵام قـسەکانی زۆری برنـەدەکردو دەبـووەوە شـەڕو
قەرتەنەیان..

رێدەکـەوت تـەواو هەڵدەچـوو بـەجارێ ژنەکـەی تۆمـەتبار دەکـردو
لەبەرچاوی دایكو باوکی دەیووت:

-سوعاد.. تۆ تەواونیت.. تۆ حەبی مەنع دەخۆی، ئەمانیش دەزانن کەتۆ
بێرەوشتیت..

باوکی بەڕقەوە تەماشای دەکردو دەیووت:

-دەك لەشت داوەشێو خوا لەمنت بستێنێ.

دایکیشی دەیووت:

-خوایە تۆبە بێ.. کورم عەیبە، نابێ ئاگات لەدەمت بێ، تۆ چۆن قسەی
وادەکەی!

قالـە مـاڵی جێدەهێـشتو بـەوەش کـەمێك بەرچـاوی لێڵـی سـوعاد
روناکدەبووەوە..

## لەنەورۆزدا چی قەوما؟..

هەتاوی ئەو رۆژە بەهارییە کێڵگەکەو بەرژوورەکانیماڵی قالەو باوکی و هەموو ئەو دەشتە سەوزەی دەوروبەری گرتبووەوە..

پاش نیوەڕۆ، دوای ئەوەی ماوەیەکی باش قالە خۆی خواردەوەو سەرنجی ژوورەکەی خۆیانی و ئەوی ماڵی باوکی دا، بەجوڵە جوڵی بەردەوامو دەموچاوی گرژومۆنی خورپەی خستە دڵی ماندووی سوعادەکەی..

هێشتا هەر ئوتومبێلە جوانەکان تاك تاكو دوو دوو، بەرەو سەیرانی نەورۆزی ساڵی پار بەمەبەستی دوکان ئەو ناوەیان جێدەهێشت..

باوکی قالەو براکەی لەژوورەکەیان هاتنە دەر، دوای تەماشایەکی قالە، بەرەو خوار داگەڕان، بەدوایاندا دایکی رووەو بەلوعەی ئاو چوو، قالە بەپڕتاو چووە ژوورەکەی باوکی و پاش چەند چرکەیەك بەکلاشینکۆفەکەی ئەوانەوە هاتە دەرێ، لەبەردەرگاکەدا میلی هێنایەوە، سوعاد کەمێ لێی دوورکەوتەوەو بەدەنگێکی نزمو پاڕانەوەوە پێی وت:

–نەکەی.. لەڕێی خودا نەمکوژی.. منداڵم وردە، گوناهت دەگات.

قالە نەئاوڕی بۆ دایەوەو نەوەڵام.. لەولاترەوە دایکی بەواقی وڕماوەوە سەرەنجی دەدایە قالە، وایدەزانی تەقە لەباوکی و براکەی خۆی دەکات.. ئەوان دوورکەوتبوونەوە.. قالە رووی تفەنگی کردە دایکی.. یەكو دوانو سیان.. بەدەنگدانەوەی تەقەی فیشەکەکانی، ئەو ناوە خامۆش بوو، تەنانەت باڵندەی ئاسمانیش شتاقیان دیارنەمان..

گەر بێجگە لەسوعادی تۆقیو، دایکانی تر ئاگایان لەکەوتنی (رەحمە) بوایە، ئەوا بەدەنگی بەرز هاواریان دەکرد قالە:

*چۆنت دڵت هات تەقە لەدایکت بکەیت.. سەرت لەقوڕنێی ئاوا پاداشتی دایکت دایەوە.. هەر خوا خۆی دەزانێ چیت بەسەردێنێ..

رەحمەش، تائاگای لەخۆی مابوو بەنووزە نوزێکەوە وتی:

–رۆڵە.. ئاوا چاکەی دایکت دایەوە؟!

## ڕەحمە چی لێهات؟

دوای ئەوەی ئەو چەند وشەیەی لەدەم هاتەدەر، تەماشایەکی خوێنی بەرپێی کردو بەلادا هات.. بەنیمچە بێهۆشییەوە گەیەنرایە نەخۆشخانەی سلێمانی..

لەوێ تەماشای کراو خێرا بەفریایەوە چوون، پزیشکەکان بینیان پاژنەی پێی ڕاستی بریندار بووەو لەئەنجامی ئەوەدا ئێسکی ئەو قاچەی شکاوە..

چەند ڕۆژێ لەنەخۆشخانە مایەوە، هەر کەمێردەکەی سەردانی دەکرد، یان کوڕە بچکۆلەکەی، یان سوعادی ژنی کوڕە تاوانکارەکەی، دوای چاک‌وچۆنی لێی دەپرسین:

-قالە چی بەسەرهات.. نەدۆزرایەوە.. ئەی پۆلیسی لای خۆمان دەڵێن چی؟

قالە دوای هەشت ڕۆژ، لەگوندێك کەماڵە خزمی لێبوو، لەڕۆژی ٢٠٠١/٣/٢٩دا دەستگیرکرا..

هەر لەلێکۆڵینەوەی سەرەتایی پۆلیسدا دانی بەتاوانەکەیدا نا.. پاشانیش لەدادگا دووبارە دانی نایەوە بەتاوانەکەدا.. ئیدی بووە میوانی زیندان..

چاوەڕێی ڕۆژی دوا دادگایی کردنی دەکرد.. هەمیشە ماندوو، بێتاقەت، ڕقی لەهەموو شتێك، تەنانەت لەخۆیشی دەبووەوە، هەردووکیان داوایان لەدادگا کرد سزای کوڕەکەیان بدات.

## پێنج ساڵو مانگێک زیندانی کردن..!

ڕێك هەفتەیەکی مابوو بۆ سەری ساڵ، ڕۆژی ١٢/٢٤ قالە برایە دادگا.. یەکەمجار بوو دوای ئەو ٩مانگە چاوی بەدایكو باوکی بکەوێت.. هەر تەماشای دەکردن‌و تاس دەیبردەوە.. پاش ئەوەی هەریەك لەدایكو باوکی ئیفادەیان دا، دووبارەیان کردەوە کەبێ هۆ قالە تەقەی کردووەو سێ فیشەکی بەدایکییەوە ناوە، هەروەها داکۆکییان لەهەڵسوکەوتی بووکەکەیان کردو وەك کچی خۆیان لێی دەدوان..

بەڵام قالە سووربوو لەسەر قسەکانی لەوەوبەری، قالە بەدادگای وت:

-من لەسەر مەسەلەی شەرەف ئەوەم کرد.. من دڵنیام لەقسەکانم، من هەرگیز نەمویستووە دایکم بکوژم، بەڵکو ویستم بیترسێنم، ئیتر ڕێکەوت بەرقاچی کەوت..

سوعاد لەوەوەبەریش داکۆکی لەخۆی کردبوو، لەئیفادەی خۆیدا وتبووی:

-مێردەکەم لەشێت دەچوو، کەهار دەبوو دۆو دۆشاوی تێکەڵ دەکرد.. هەرچییەك دەخاتە پاڵم درۆدەکاتو هەمووی بوختانە پێمی دەکات..

دادگای بەڕێز، وێڕای ڕاگەیاندنی بێسفەتیو بێئەمەکی کوڕێك بەرامبەر دایکی خۆی، وێڕای بڕوای تەواوی بەوەی کەقالە تەقەی لەمەزنترینو بەنرخترین کەسی خۆی کردووە، ئەوەی لەبەرچاوگرت کەیەکەمجارە تاوانێ بکاتو ئەنجامی تاوانەکەشی بەبریندارێ تاوان لەگەڵداکراو شکاوەتەوە، هەربۆیە بەپێنج ساڵو مانگێك زیندانی کردن بڕیاری بەسەردا دا..

## جارێکیتر ڕوو لە دادگا..

سەرەتای ئەمساڵ، نزیکەی بەر لەمانگێك، جارێکی تر قالە برایەوە دادگا، بەڵام ئەمجارەیان بۆ دادگای تاوانەکان نا، بەڵکو بۆ دادگای کاروباری کەسێتی، قالە لەزیندانەوە برا، ئەمجارە شکاتکەر دایکی نەبوو، باوکیشی نەبوو، بەڵکو سوعادی ژنی بوو کە بەمنداڵە بێنازەکەیەوە هاتبووە دادگاو داوای جیابوونەوەی دەکرد لەو مێردەی ڕۆژێك سەرفرازی نەکرد، ئەو مێردەی کەدەستی چووە گیانی دایکی خۆی، لەگەڵ سوعادا دایكو باوکی قالەش هاتبوون، پشتگیرییان لەداواکەی بووکەکەیان دەکرد.. دادگای ڕێزدار بۆ لێکۆڵینەوەی تەواو لەو کێشەیە بڕیاریداوە ڕۆژی١٩ی ئەم مانگە دوابڕیار بدا، ئەگەری زۆریش هەیە لێکیان جودابکەنەوە..

ئەم بۆ ژیانێکی تاڕادەیەك چارەنووسی نادیار، ئەویش بۆ زیندانە تەنگو تارەکەی..

نیـوەڕۆی ڕۆژی ٢٠٠٠/١١/٣٠، لەگـەڕەکێکی دووره شـارو لـەماڵێکی دڵتـەنگی وەك دڵـە تەنگەکـەی (حەپـسه)دا، وەك زۆر ڕۆژی تـرو زۆر کۆبوونەوەی دەوری سفرەی نان خواردن، قسەو دەمەبۆڵێی (مارف) دەستی پێکردەوە، ئەو نیوەڕۆیـە کـچەکانی تریـان کەبەسـەردان هاتبوونـەوە ماڵی باوکیان، ئەوانیش لەوێ بوون.

ئەو، باوکی کوڕوکچی گەورە بوو، بەڵام هەر کەدەمی دەکردەوە جنێوی ناشیرین ناشیرینی ئاڕاستەی دایکی منداڵەکانی دەکرد.

ئـەو نیوەڕۆیـە حەپـسە بەچـاوی تـەڕەوە دەسـتی لەقاپەکـەی بـەردەمی کێشایەوەو لەگـەڵ تەماشـاکردنی منداڵەکانـدا پارووەکـەی دەمـی جـووی و پـەرداخێ ئـاوی کـرد بەسـەرداو ئینجـا کـەمێ چـووە دواوەو پـاڵی دا بەدیوارەکەوەو چاوی بڕییە مارفو بەدڵی پڕ لەحەسرەتەوە پێی وت:

–باشـە ئـەوا قوزەڵقورتەکەشـم نـەخوارد، نـازانم بـۆ هـەردەبێ هەمیـشە خواردنەکەم لێبکەیتە ژەهری مار، بۆ دەبێ هەمووجارێ لەسەر نانخواردن بیانووم پێبگری!.

لەگەڵ گلانی پارووەکانیدا بێئەوەی سەری بۆ هەڵبڕێ وەڵامی دایەوە..

–نایخۆیت چش.. هەردوو چاوت دەردەهات.

حەپسە دووبارە کەوتەوە قسە بۆ کوڕو کچەکانی..

–نـازانم چـیم کردبـوو خـودا بـەختی گرێـدام بـەم پیـاوە زمـان پـیسو ڕەزاگرانـەوە.. چـیم کردبـوو ئـاوا بەشـم هـەر مانـدووبوونو هەمیـشە نەحەسـانەوە بێـت، ئـاخر ڕۆژ دەبێتـەوە خـەریکی ئیـشی مـاڵم.. دوو مانگـە ئەڵێم واپشتم شکاو واچەمیمەوەو بمبەرە سەر دکتۆرێكو گاڵتەی پێدێ..

نەگەر ئەمانە نەدەبوون هەر لەوكاتەوەی ئەو جوانەمەرگە چووە جێی حۆی. ئەم كاولبووەم بۆ جێدەهێشتی، ئەو كلۆڵەی هەر تۆ بوویتە سەبەبی عر-نی..

بەرقەوە مارف تەماشای دەكات و دەقیرێنێ:

-بەسە چەنەبازی مەكەو بهێڵە نانەكەمان بخۆین..

ئیدی حەپسە ژوورەكەیان بۆ جێدێڵێ و وەك زۆر رۆژی تر گۆشەگیر لێی دادەنیشێ و پاش ماوەیەكی باش دڵدانەوەی لەلایەن یەكێك لەمنداڵەكانی، ئینجا دێتەوە ناویان.

## ٢٩ ساڵ ژیانی پڕ لەكوێرەوەری

ئەوان عومرێكی دوورودرێژیان پێكەوە بەسەربردو، ٢٩ ساڵ بوو حەپسە ماڵەكەی باوكی جێهێشتبوو ببووە هاوسەری ئەو پیاوەی هەرگیز روویەكی خۆشی پێ نەدەدا..

ئەوان دایك و باوكی دوو كوڕو دوو كچی گەورە بوون، هەر كەمارف لەسەر بیانوویەك پیایدا هەڵشاخایە، یان كاتێ خۆی گرفتێكی ببوایە دەكەوتە وتنی قسەی ناشیرین بەدایكی منداڵەكانی..

جاری واهەبوو پەلاماری دەداو دوای هات وهاواری ژنە یەكێك لەمنداڵەكان دەبوونە فریادڕەسی و لەچنگی بەهێزو بێبەزەیی باوكەكەیان رزگاریان دەكرد..

ئەو كاتانەش كەمارف دەچووە سەر ئیشەكەی، یان بەكارێ ماڵەكەی جێدەهێشت، حەپسە هەر نیگەران و غەمبارو بێدەنگ دۆش دادەما، زۆرجار یەكێ لەمنداڵەكانی دەیانویست بەگاڵتەیەك بیهێننەوە قسەو پێیان دەووت:

-چییە حەپسەخان دەڵێی پاپۆڕەكەت نوقم بووە!

ئەویش دەیووت:

-رۆڵە دەمێکە پاپۆڕی من نوقمی ژێر ئاو بووەو سەرنشینەکەی خنکاوە!

یاخود پێیان دەووت:

-دایکە هەموو ژنو مێردێ دەنگەدەنگیان دەبێ، گوێی مەدەرێ..

ئەمیش پێی دەوتن:

-ئەمە مێردە خوابیباتەوە، مێردە یان پیاوێکی شێتوهار..!

## • سوێی زامێکی قووڵ

ساڵی ١٩٩٧ ئاگرێك جەستەی بێنازی کچە ناوەنجییەکەی مارفی سووتاندو ئەو ئاگرە بەربووە دڵودەروونی حەپسەو دەروونی دوو خوشكو دوو براکەی تری (پەروین)و تا ئەو رۆژە گڕی ئاگر کوژانەوەی بۆ نەبوو.

ئەو ئاگرەی دڵی هەر پێنجیان زامێکی قووڵی جێهێشتبوو بەهیچ شتێك سارێژ نەدەبوو، بەتایبەت بۆ دایکی جگەرسووتاوو بۆ کاوەی برای پەروین، کە هەم براو هەم هاورێی بوو.

ئەو کچە نەگبەتە ئولفەتی تەواوی بەدایکییەوە گرتبوو، هەمیشە وەك منداڵێکی بچکۆلە لەگەڵ دایکیدا دەخەوتو هەر لەگەڵ ئەودا خۆی دەشتو لەگەڵ ئەویشدا لەماڵ دەترازا..

هەرچەندە باوکیان پەلاماری دایکیانی دەدا یان جنێوبارانی دەکرد، پەروین لەناخەوە دەکولاو دەگریاو دەکەوتە هاوارکردن.. گەلێ جار لەسەر دایکی بەرپەرچی باوکی دەدایەوەو ئەویش هەڵمەتی بۆ دەبردو بەقژە درێژەکەی رایدەکێشاو کوڵمەکانی بەزللە سووردەکردنەوە.

ڕۆژێکی مانگی مایسی ١٩٩٧ لەناکاوێکدا پەروین ئاگری بەردایە خۆیو ـەگەڵ سووتانی جلەکانیو پێستو گۆشتو لەشیدا پڕ بەو ماڵە زریکاندی ـەداخی تۆ خۆم سووتاند.. لەداخی تۆ دەمرمو خۆم رزگار دەکەم..).

وەك زۆر مەرگی تر بەدوایدا قسەو قسەلۆك لەگەڕەكو شاردا پەیدابوو، جەستەی قەرەبرووتی کچەی خێرنەدیو برایە نەخۆشخانەو دوای فەحسکردن بینرا هەر بەکچی گیانی سپاردووە.

ئەوکاتە حەپسەو منداڵەکان شکاتیان لەمارف کردو وتیان ئۆباڵی مەرگی پەروین وا لەئەستۆی باوکیدا، مارف گیراو دادگایی کرا، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی وای لەسەر نەسەلما کەپێی تاوانباربێ بۆ مردنی کچە سووتاوەکەی، هەر بۆیە ئازادکراو هاتەوە ناوماڵو بەرچاوی حەپسەو منداڵەکانی تری.

## ئەو ئێوارەیەی مارفی تێدا کوژرا

سەرلەئێوەی رۆژی ٢٠٠٠/١١/٣٠، دوای ئەوەی نیوەڕۆ دڵی ژنەکەی رەنجاندو لەسەر خواردنەکەی تۆراندی. وەك هەموو جارێکی تر ژنە گرژو بێدەنگ، ئەمیش هەراسانو دەم بەجنێو، تەنیا کاوەی کوڕیان لەماڵ بوو، حەپسە بەدەم ئامادەکردنی خواردنی ئێوارەوە خەریك بوو، مێردەکەشی لێی نزیك بووەوە، دوای جنێوپێدانی بەوپەڕی تووڕەییەوە بەشەقێك مەنجەڵە پڕلەئاوە گەرمەکەی پیادا کردو ئەویش لەتاو قاچی سووتاوی کەوتە هاوارو لاڵانەوە..

کاوە چاوەکانی بوونە دوو پشکۆی سوور، بەپرتاو رایکردە ژوورەوەو کلاشینکۆفی برا گەورەکەی داگرت، گەڕایەوە بەردەم موبەقە بچووکەکەی

حەوشـــەو میلـــی تفـــەنگی هێنایـــەوە.. یـــەك و دووان و ســـیان و چـــوار.. فیشەکەکانی ئاراستەی باوکی کرد، ئەویش دەستبەجێ کەوت..

حەپـــسە وەك باڵندەیـــەکی زامـــدار لەســـەر زەوییەکـــە بەحەپەســـاوییەوە گرموڵـــە بـــوو بـــوو.. دراوســـێ گەیـــشتنە ســـەریان و مارفیـــان فڕانـــد بـــەرەو نەخۆشخانە..

لەنەخۆشخانە کەوتنە چارەسەری مارف، بینیان لەئەنجامی فیشەکەکاندا ناوسـکی بەرکـەوتووەو هـەناوی بـەدوو فیـشەك پێکـراوەو تووشـی خـوێن بەربوونی زۆر بووە، هەروەها باڵی راستی پێکراوەو شکاوە..

بەرلەوەی گیان بسپێرێت، بەپۆلیسەکانی وت:

-لەئـەنجامی لەیەکترنەگەیـشتن و شـەڕێکی بـچووکی مـن و دایکـی وای لێکردم، کاوە بەتفەنگەکەی کاکی وای لێکردم.!

## ئەوانیتر وتیان چی؟

لەلێکۆڵینەوەی دوای مردنی مارفدا، هەموو قسەی خۆیان کرد، براکەی مارف وتی:

-خۆم تاوانەکەم بەچاوی خۆم نەدیوە، بەڵام کوڕە گەورەکەی مارفی برام ئاگاداری کردم کەبراکەی قەوماندوویەتی و باوکی خۆی کوشتووە.

کوڕە گەورەکەی مارف وتی:

-من کاتی رووداوەکە لەماڵ نەبووم، کەهاتمەوە بینیم بەر ماڵەکەمان قەرەباڵغە، ئینجا زانیم چی قەوماوە، وتیان کاوەی برام بەهەڵە فیشەکی لەدەست دەرچووەو باوکمی بریندار کردووە، ئیتر خۆم گەیاندە نەخۆشخانەو لەوێ پاش ماوەیەك باوکم وەفاتی کرد.

هەردوو کچەکەی مارف وتیان:

- کاوە هیچی لەگەڵ باوکمدا نەبووەو لەوەوبەر گرفتێ لەنێوانیاندا ڕووی نەداوە، بەڵام وەك هەموومان ئەویش بەئازاردانی دایکمان ئازاری دەی و خەمی پێدەخوارد، هەمیشە باسی پەروینی جوانەمەرگیشی دەکردو بۆی دەگریا..

حەپسەی دایکیشیان وتی:

-بەو خوایە لەگەڵ خۆمو کچەکەم خراپ بوو، پەروین خۆی رزگارکردو چووە جێگای حەقی خۆی، من مابوومەوە بۆ مەینەتی زەمانە، ئەو رۆژەی ڕووداوەکە لەنیوەڕۆوە شەڕی پێدەفرۆشتم، ئێوارەکەشی ئاوی گەرمی پێداکردم، ئیتر کاوەی کوڕیشم دانی بەخۆدا بۆ نەگیراو بەتفەنگەکەی براکەی باوکی کوشت..

## کاوە چۆن باسی تاوانەکەی کرد؟

لەدادگا کاوە بەسەرهاتی کوشتنی باوکە ٥٨ ساڵەکەی خۆی بەم شێوەیە گێرایەوە:

-ساڵی ٩٧ پەروینی خوشکم لەداخی باوکم خۆی سووتاند، لەوەوبەرو دوای ئەو ڕووداوەش لەگەڵ دایکم خراپ بوو، لێی دەداو جنێوی پێدەدا، ئێ منیش دایکمەو خۆشمدەوێ، من لەگەڵ باوکم هیچم نەبوو، بەڵام لەداخی خوشکە جوانەمەرگەکەمو لەداخی دایکم بەتفەنگی برا گەورەکەم کوشتم.. هەمووش دەزانن، کاکمو دوو خوشکەکەی تریشم دەزانن کەچەندە پیاوێکی تووڕەو خراپ بوو.

## بڕیاری دادگا

ڕۆژی ١٤/١٠/٢٠٠١ دادگای تاوانی سلێمانی دادگایی کاوەی کرد، بەبڕوای دادگا نەدەبوو لەسەر شەڕی نێوان دایکیو باوکی ئەو تاوانە بکات، ئەو کارەی کاوە لادانە لەبەها بەنرخەکانی مرۆڤ، لادانە لەدابونەریتی کۆمەڵو ئەو ڕێزگرتنەی دەبێ کوڕ بۆ باوکی خۆی هەیبێت، چونکە خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا باسی مەزنی دایكو باوکانی کردووە.

کاوە کەدەستی چووەتە خوێنی باوکی خۆی مەترسیی بۆ سەر کۆمەڵو خەڵکانی تر هەیە، هەر بۆیە تاوانەکەی بەپێی مادەی ٤٠٦ دادگایی دەکرێت، بەڵام ڕەچاوی تەمەنی دەکرێت، کەکاتی تاوانەکەی ٢٠ساڵی تەواو نەکردووە.

دادگا بڕیاری دا بەزیندانیکردنی هەمیشەیی کاوەو دەستگرتن بەسەر تفەنگی براکەیدا..

ئەو برایەوە بۆ زیندانو دایکیشی گەڕایەوە بۆ زیندانە هەمیشەییەکەی خۆی.. بۆ ئەوماڵەی چەندین ساڵ بوو ئازاری تێدادەدیو کچەکەی تێدا سووتاو مێردەکەی تێدا کوژراو کوڕە خۆشەویستەکەشی لێوەی برا بۆ زیندان..

سەر لەبەیانی رۆژی ١٩ی کانوونی دووەم تەلەفۆنێك بۆ بنکەی پۆلیسی رزگاری کراو تیایدا قسەکەر رایدەگەینێت کە لە پاڵ دیواری قوتابخانەکەی گەرەکی (ز)ی سلێمانی لاشەی مردوویەك فڕێ دراوە!! یەکسەر ئەفسەری بنکەکەو چەند پۆلیسێك دەگەنە ئەوێ‌و دەبینن کوڕێکی کوژراو خراوەتە گونیەوەو بەتانی تێوە پێچراوە، هەندێ خوێن لای سەریەوە ڕژاوەو لەتەنیشتییەوە پێناسەی ئەحوال مەدەنی کوژراوەکە تووڕ دراوە، کەتیایدا نووسراوە:

–بەکر..

–لەدایك بووی ساڵی ١٩٧٠

–خەڵکی ناوچەی شاربازێڕ

دەست بەجێ هەڵیدەگرن‌و دەیخەنە ئوتومبێلەوەو بەرەو نەخۆشخانە دەکەونە ڕێ، تا بزانن ئەمە کێیەو بۆچی‌و چۆن چۆنی کوژراوە!..

## میوانێکی ڕەزا گران.. !

وەکو پیشەی هەموو ئێوارەکانی دیکە،(دایکی زارا) نان‌و چای دەدا بەمنداڵەکانی، فەرەیدونی کوڕە گەورەی ئاگاداری کرد کە ئەمشەو(بەکر)ی زاواو خوشکەزای دایکی زارا بۆ مەسەلەکە دێتەوە ماڵیان...!

چەند ساڵێ بوو ئەو بێوەژنە کلۆڵە باری گران‌و خەمی قورستر بوو بوون، هەموو جار لەگەڵ گەردووندا سکاڵای دەکردو دەکروزایەوەو دەیووت:

–بەدرێژایی چل ساڵی عومرم خۆشیم نەدی، بەمنداڵی هەراشەوە بێوەژن کۆشی لەچارەم نووسرا...!

زارا)ی کـچه گـەورەی دابـوو بەشـوو، بـەلام شـوویەکی ئـەوتۆ بـوو بەرێژایی شەش مانگی رابردوو خۆی و کچەکەی بەدەست زاواوە پەرێشان بوون...!

زارا خۆشەویستی دایکی بوو، هەربۆیـە بە دایکی زارا ناویـان دەهێنـا، لەتەمەنی زارادا کوڕێك و یەکێکی تر لەو بەرەو خوارتری هەبووکە بەکارو کاسبی رۆژانە نانیان لەقوڕگی شێردا دەردەهێنا... لەوانیش بچووکتر کچ و کوڕێکی تری هەبوو.

بەکری زاواو خزمی نزیکیان لەلای ئەمان چارەی خۆی تاڵ کردبوو، لەو ماوەیەدا لای ژنەکەی یان ئەمان بۆ تەنیا ساتێ ئەو کوڕەیان نەچوو بوو بەدڵدا.. بـەکر بەچـەند کردەوەیـەك خـۆی ناشـرین کردبـوو، بەرلـەوەی لەمزگێرانەکەی بگوێزێتـەوەو بـەبێ رەزامەنـدی خـۆی کردبـووی بـە(ژن)، کـە دایکی زارا بەوەی زانیبوو خێرا پێی گواستبووەوە.

لـەماوەی (٦)مـانگی رابـردوودا هـەر کـاتێ بـەکر دەروونـی ئـاڵۆز بووایـە بەسەر ژنە داماوەکەیدا دەینەڕاند:

-تۆ ئافرەتێکی خراپیت، بەر لەمن کردبوویانی بەژن...!

یان بەژنە بیست ساڵەکەی دەووت:

-دەزانم، باش دەزانم دڵت بەکێی تر داوەو لەپشتی منەوە چی دەکەیت، شەرت بێ حەیات بەرم و بتکەمە پەندی رۆژگار.

ماوەیەکیش بوو شەوو رۆژ داوای بە شەکەی زارای دەکرد لەخانووەکەی ماڵی باوکیداو دەیووت: دەبێ بفرۆشرێ و بەشەکەی زارا بدەن بەمن!!

زوو زوو بەژنەکەی دەووت!

-دەبێ (١٥) هەزار دینار لەدایکت بستێنی و بەوەش هەقت لەو خانووەدا نامێنێ.

زاراش ئەوەی بەدایکی دەووت و لە هەڵسوکەوتی مێردەکەی ئاگاداری دەکرد، دایکیشی دەیووت:

-جا لەکوێی بێنم، بەو دوابڕاوە بڵێ خوا ئاگادارە(١٥) دینارم نییە بیدەمێ، پێی بڵێ با لەخوا بترسێ، با کەمێ ویژدانی بێ.

بەکر خۆیشی بۆ ئەو مەبەستە چەند جارێ چوو بووە سەری کەپوورو خەسویشی بوو، تەنانەت هەڵەی لە رووی ئەو و هەردوو کوڕەکەیدا کردبوو.

شەوی ١٩٩٤/١/١٨، بەکر بەخۆی و کلاشینکۆفەکەیەوە چووە ماڵی خەسووی، ژنەکەی نەبردبوو، بەتەنیا هەر خۆی میوان بوو، میوانێکی رەزا گران..!

## لەو شەوەدا چی وترا؟...

شەو لەناوەڕاستیدا بوو، منداڵەکان لەدەوریان کۆبووبوونەوە، کوڕە گەورەکە(فەرەیدون) بەهێمنییەوە رووی دەمی کردە بەکر:

-کاکە بەکر، تۆ بەتەمەن لەئێمە گەورەتریت، باشە ئێمە ئەم خانووە بفرۆشین ئەی لەکوێ دا بژین؟! تۆ پێویستت بەپارەیە، خوشکەکەمان و ئێمە گوناهمان چییە، ئەی ئیتر بۆ وادەکەی، بۆ قسەی بەرزو نزم لە رووماندا دەکەیت، عەیبە ئێمە پورزای یەکین.

بەکر بایەخی بەقسەکانی ئەو نەدا، فەرەیدون بەبێزارییەوە هەڵساو چووە ژوورەکەی خۆی، شەو درەنگی کرد، منداڵەکان بەلاداهاتن و دایکیان دایپۆشین، جێگای بۆ بەکریش داخست،ئینجا رووی تێکردو وتی:

-رۆڵە باپێتی بڵێم، کوڕەکان لەبەر من نەبێ لێتی قبوڵ ناکەن، ئەوان بیستوویانە چ تۆمەتێکی ناڕەوات خستۆتە دوای خوشکەکەیان، وا بۆ

ـ‌ـ‌رەش قسەی سووکمان پـێ دەڵێت، تۆزێ پیاو بەپیاو، کەمێ حەیات ـمخۆتەوە بێت.

بەکر بەگرژییەکی زۆرەوە بەخەسووی وت:

-بەچیتانەوە داوای حەیا لەمن دەکەن، بە(زارا)وە کەبەر لەوەی بچێتە ‌ی مێرد کرابوو بەژن؟

دایکی زارا لێی راپەڕی:

-تۆ وات لێ کرد بێ شەرمی بێ غیرەت، تۆ وات لێ کرد، کچی من لەگوڵ پاکتر بوو...

بەکر وتی:

-شەرت بێ ئەمی تریشت وا لێ بکەم...!

ئەو رستەیە وەك بروسکە دای لەسەری دایکی زارا. لەجێی خۆی مت بوو... رەنگی زەرد هەڵگەڕا... کچە بچووکەکەی تەنیا (١٠) ساڵ تەمەنی بوو، چەپ و راستی خۆی نەدەزانی، لەجێگای خوشکێتی و چۆن دەبێ ئاوا ناوی بەرێت؟ لێی نزیك بووەو تفێکی کردە ناوچەوانی و پێی وت:

-هەر خۆت بەخۆت بی، هەی بێ نامووس...

بەکر لەجێگای خۆیدا راکشا، بەدەم خۆداپۆشینەوە وتی:

-بۆ دواجار پێتی دەڵێم، دەبێ سبەینێ ئەو پارەیەم بۆ پەیدا بکەیت، دەنا خۆتان دەبیننەوە...!

## دوای نیوەشەو...

ژوورەکە خامۆش و دەرەوەش نەبای هەبوو نەباران، شەوقی گڵۆپەکەی حەوشە کەمێ ژوورەکەی دەگرتەوە، بەکر لەخەوێکی قووڵدا بوو، منداڵەکانیش بەهەمان شێوە.. دایکی زارا بێدار بوو، هەر ئەمدیوو ئەو

دیوی دەکرد، دەنگی بەکر لەگوێیدا دەزرنگایەوەو رەفتارەکانی دەهاتنەوە بەرچاوی...

*شەش مانگو چەند رۆژێك لەمەوبەری هاتەوە بەرچاو کەزارا بەسەری کەچەوە دەیپروانییە زەوییەکەو بۆ دایکی باس دەکات کە بەکر چۆن بەفێڵ بردوویە ژوورێکی ماڵی خۆیانو چی لێکردووە...

*مانگێ لەوەوپێشی هاتەوە بەرچاو بەکر لەماڵەکەی خۆیدا لەبەردەم ئەمدا دەیقیژاندو دەیووت "شەرت بێ زارا، بەهەموو خەڵکی بڵێم تۆ ژنێکی خراپیتو رادەبوێری، تۆ بەرلەمن کردبوویانی بەژن، من بۆیە رازی بووم چونکە پوورزامی، بەلاّم چی تر دان بەخۆمدا ناگرمو تەلاّقت دەدەم، برۆ با دۆستەکەت بتهێنێ..!"..

*هەر ئەمشەوی هاتەوە بەرچاو کە بەقسەی ناشیرینەوە داوای پارەی خانووەکەی لێدەکرد..

*یەك دوو سەعات لەوەوبەری هاتەوە بەرچاو کەدەیووت"شەرت بێ کچە بچووکەکەشت (وا)لێ بکەم!"..

دایکی زارا وەك شێت راپەری، لەبەکرو تفەنگەکەکەی تەنیشتی نزیك بووەوە، کەمێ بۆی وەستاو بەرەو دوا کشایەوە، چووە دەرێو خۆی گەیاندە ژوورەکەی تر کە کورە گەورەکەی لێ خەوتبوو...

-فەرەیدون... فەرەیدون... هەڵسە کورم، هەڵسە....

-چییە دایکە، خێرە؟

-هەڵسە کورم، وەرە لەگەڵمدا، دەمەوێ بەکر نەجات بەم، وەرە بابیکوژینو ئێمەو کلۆڵەکەی خوشکت لەدەستی رزگارمان بێ...

فەرەیدون پەشۆکاوو حەپەساو وەلاّمی نەبوو، لەجێی خۆی نەبزوا، دایکی دەرگاکەی جووت کردەوە، هاتە حەوشەکەو وچانێکی بۆدا، لەپڕ

ـەت بیری کەوتبێتـەوەو رووەو ژووره ساردی گەرماوەکه هەنگاوی نا، لەو
ـەر هاته دەرو تەورێکی بەدەستەوە بوو... گەڕایەوە ژوورەکە، بەپیرەتەور
کەوتە سەری بەکر، هەر لەوێدا کوشتی، هەردوو کوڕە گەورەکەی بەئاگا
هێنـاو لـەو کـارەی ئاگـادارکردن، پێکـەوە هێنایانـە دەرەوە، خـوێنی سـەر
جێگاکـەی پـاك کردەوە،خـستیانە گونییەکـەوەو لەبەتانییەکیانـەوە پێـچا،
کوڕەکان کوژراوەکەیان کێش کرد بەرەو دەرەوەو دایکیشیان دەستی دایە
تفەنگەکەی بەکرو شوێنیان کەوت... دوور لەماڵی خۆیان و لەنزیك دیواری
قوتابخانەکەوە فڕێیان داو پێناسەکەی نێو گیرفانیشیان لای سەریەوە دانا..
نـەملاترەوە لەکۆڵانێکـدا تفەنگەکەشـیان فڕێـدا... گەڕانـەوە ماڵـەوەو بـە
ـەروونی ئالۆزو وروژاوەوە سەرنجی یەکتریان دەدا.

## رۆژی دادگایی کردن...

ئەو رۆژەی دادگایی گومان لێکراوان (دایکی زارا)و هەردوو کوڕەکەی
کرا رۆژی ١٩٩٤/٨/٣٠بوو، داواکار(زارا)خۆی بوو، راستو رەوان باسی
مێردەکەی بۆ دادوەرە بەرێزەکان گێڕایەوە، هیچیشی لەبکوژی مێردەکەی
نەویستو بەوحاڵە رازی بوو... دایکی زاراش باسی بەکری بۆ کردن و
چۆنێتی کوشتنی ئاشکرا کرد، هەردوو کوڕەکە بێ گوناهیی خۆیانیان
راگەیاند، دایکیان پشتگیری لێکردن.

دادگای سلێمانی بەرامبەری ئەو کێشەیە بڕیاری دا:

١- دایکی زارا بۆماوەی دوانزە ساڵ زیندانی دەکرێت.

٢- هەردوو کوڕەکەی ئازاد دەکرێن.

٣- تەورەکەش لەناو دەبرێت.

بەلاَم دادگای تەمیزی کوردستان رۆژی ١٩٩٤/١٢/٦دوای رەزامەندی نیشاندان بەرامبەر بڕیارەکان ئەو بڕگەیەشی بڕیاردا (کە هەردوو کوڕەکە بەرامبەر بەتاوانی فڕێدانی لاشەکەی بەکر دەدرێنە دادوەری لێکۆلینەوە)

## هەمیشە دڵ لەلای زارا..

دایکی زارا چووە نێو زیندانەوە، نێو ئەو ژوورەی (٨) مانگی رابردووی تیا بەسەر بردبوو، هەموو کات دلی لای زاراو منداڵەکانی تری بوو، زاراش گەڕایەوە زیندانە فراوانەکەی دەرەوە. زۆربەی کات بە هەناسەی ساردەوە فرمێسکی گەرمی بۆ چارەنووسی بەدبەختی خۆی هەلدەڕشت.

بەوەش کۆتایی بەبەسەرهاتی ئەو تاوانەش هات کەئاستی شێواوی کۆمەلآیەتی و باری شپرزەی ئابووریی خەلکیی، هۆکاری خولقاندنی بوون.

(کنێـر) تەمـەنی حەڤدە بەهار بوو، کـەبیری لەمنـداڵیی خـۆی دەکـردەوە لــەبری ئــەوەی شــادییەك، خۆشــییەك ببێتــە میــوانی، خــەم دایــدەگرت و چاوەگەشەکانی فرمێسکیان لێ دەهاتە خوار...

ئـەو زۆر منـداڵ بـوو کەدایکـە میهرەبانەکـەی مـرد و کنێـر لەسـۆز و نـازی دابـڕا، هەمیـشە دڵخۆشـی خـۆی بەنەنکـە پیرەکـەی دەدایـەوە، نەنـە لـەبری دایك و هەموو کەسێکی بوو.

کنێـرو نـەنکی لـەماڵێکی بـچووکی (هـەولێر)دا دەژیـان، هـەواری منـداڵی کنێرو، ئەو ماڵەی دایکی دوا کۆچی تێدا کرد لەگوندێکی نێوان هـەولێرو کۆیـەدا بـوو، کـەباوکی دەهـات بەدوایـداو دەیـبردەوە، یـاخود لەگـەڵ نەنکـە پیرەکەیدا دەچووەوە ئەو گوندە، بەرچاوەکانی رەش دەبوون و تروسکەیەکی بەختیاری لا نەدەما..

ئـەو دایکـی بیردەکەوتـەوەو لـەوەش ناخۆشـتر دوو بـاوەژنی لەماڵەکـەدا دەدی، کەبەچـاوی رق و بێـزارەوەوە دەیانڕوانییـە کنێـر... بـاوکی دوو ژنــی هێنابووەوە، بە وشەیەکی شیرین و رازێکی گەرم کنێری جوانیان نەدەدواند! ئـەمیش حـەزی بـەوان نـەبوو، گـەر زۆر ناچـار نەکرایـە سـەری نـەدەکردەوە بەکاولبوەکەیاندا!!

(کنێـر) هـەولێرو ماڵـە خنجیلانەکـەی نەنـەی بەبەهەشـت دەزانـی، بـەڵام نەیانهێشت لەو بەهەشتەدا بژی... ئەمجارەیان بەشێوەیەك پەلی گیراو لـەماڵ برایە دەر، کەسەری پیانەکاتەوە!

# بەرەو دۆزەخ..!

چێشتەنگاو بوو باوکەکەی هاتە ماڵو بێ ئەوەی لەهەواڵی بپرسێ وتی:

-ئەی کنێر، برۆ جلەکانت ئامادەکەو هەر ئێستا دەڕۆین...

بەبێ دەنگیو واق وڕماوییەوە، تەنیا بەچاو لەباوکی پرسی(بۆ..بۆ کوێ" باوکی هاواری لێ کرد:

-چییە، دەڵێی بتی ڕاوەستاوی، خێراکە، دەتبەمەوە لای خۆم!

نەنکی کنێر وتی:

-بۆ دەیبەیت.. خوا هەڵناگرێ منیش تەنیابم...لێی گەڕێ باهەر بێردەبێت...

بەتوڕەییەوە وتی:

-نا..دایە..نا...گەورە بووەو لێی دەترسم، خەڵکی خراپ زۆرن، دەیبەمەوە لای خۆمو بائێمە چۆن دەژینو چی دەخۆین بەشدارمان بێت..

پاش ماوەیەك...کنێر بەجانتاکەی دەستیەوە شوێن باوکی کەوت، لەسەری کۆڵانەکە ئاوڕی دایەوەو ڕوانییە بەردەرگاکەیان، ئەو بەردەرگایەی ساڵانێکە کنێر هەناسەی لاهەڵدەڕێژێ.. دواتر سەرنجی دایە دەرگای داخراوی ماڵەکانو دوکانە بچووکەکەی گەڕەكو قەستی بوو پڕ بەدەنگی هاوار بکات:

-دە مەهێڵن بمبات، لەوێ جووتێ دڕندە دەژینو دەمکوژن، ئەوێ دۆزەخە... مەهێڵن بمبات.

ئینجا ڕاست لەبەردەم دوکانەکەدا ڕاوەستاو گەر باوکی نەبوایە دەیووت:

-دەتۆ مەهێڵە بمبات، ئەی لەمەودوا کێ سابوون و شانەو بنێشتت لێ بکڕێت؟!

باوکی ئاوڕی دایەوەو وتی:

-خێراکە، کچەتیو، ئەوە بۆ ناڕۆیت!

## بەرەو نادیار..!

ئەو چەند شەوو ڕۆژەی کەلەماڵی باوکیدا بوو بۆیەک سات خۆشییەك بەدڵ و دەروونی کنێردا گوزەری نەکرد!

ئەو هەمیشە دڵتەنگ و غەمبار بەچاوی بیرومێشکی(نەنە)ی دەدی، ئێواران لەگەڵ دەستە خوشکە هاوسێکانیدا دەدواو جارجاریش دەچووە دوکانەکەی گەڕەك...

باوەژنەکانی بەتوانج و قسەی ناخۆش لەگەڵیا دەدوان، باوکەکەشی دەسەڵاتێکی ئەوتۆی نەبوو... ئەو چەند ڕۆژە ئازار چوو بەگەروویدا... تاڵاو چوو بەناو سکیدا.. بەیانییەك زوو بڕیاری سەفەری دا... بۆ کوێ؟ خۆیشی نەیدەزانی، بڕیاری دا ئەو ناوە جێ بهێڵێ و دوور بڕوات...

## ناسینی خەڵك..!

دەمەو نیوەڕۆ گەیشتە کۆیە، لەئوتومبێل دابەزی وبەبێ شوێنێکی دیاریکراو، بەبێ ناسینی کەسێکی ئەوتۆ هەنگاوەکانی ڕووەو گەرەگێکی خواروو بوو، کچێك سەرنجی ڕاکیشا، لەبەردەمیا ڕاوەستاو ڕوانییە چاوەکانی... وەك دۆستێکی دێرین پێشوازی لێ کرد، بەسۆزەوە بردیە

ماڵەوەو ژوورەکەی، کەناسی و بە بەسەرهاتی زانی ڕێزی گرت، بەزەیی پێیدا هاتەوەو وتی:

-دەتوانی لێرەبیت، من خۆشەویستی دایك و باوکی خۆمم، خزمەتت نەکەین..

وشەی دایك رایچڵەکاند... ئەو شەوە لەماڵی (نەناسیاو)چاوە پڕ شەرمەکانی بەرز نەکردەوە... هەرچەندە کچەو دایکی لەگەڵیاندا وت، بێ سوود بوو.. سبەینێ زوو کنێری کڵۆڵ و شپرزە ئەو ناوەی جێهێشت و بەئوتومبێلی کرێ بەرەو (سلێمانی) کەوتە ڕێ.

لای حەسیب ساڵح دابەزی... بەشەقامی مەولەویدا هات، لای بازاڕێکی قەرەباڵغ کەمێ راوەستا، ئاسمانی مانگی تەمووز ئاگری دەباراند، لەرێگادا دیارە چەند بڕیارێك بەمێشکی شڵەژاویدا هاتبوون.. دوا بڕیاریان چوونە (رانیە)بوو بۆ ماڵی خزمێکیان...

کەمێ ئارەقی دەموچاوی سڕی و هەر لەخۆیەوە خۆی بەدوکانێکدا کرد...

-کاکە گیان تۆزێ ئاوم بدەرێ و...

ئاوەکەی خواردەوەو فەرمووی لێ کرا، دانیشت و وتی:

-دەتوانی رێگای نەقلیاتی رانیەم پێ نیشان بدەیت؟

کوڕە زانی کچێکی نائاساییە، پاش ئەوەی لەتەوقی سەرەوە تا بەری پێی سەرنجی داو بەحاڵی ئاشنابوو پێی وت:

-نەخێر، با جارێ بچین بۆ ماڵی خۆمان، تەنها خۆم و دایکمین، تۆ وەکو خوشکی من وایت، تا کەسوکارت دەدۆزینەوە ناهێڵین بچیت بەهیچ لایەکدا.

ئینجا پرسی:

-باشە نەتتوانی لەگەڵیاندا بژیت؟

-نەخێر، ئەوان بەجنێو دەیاندواندمو باوکیشم لێی دەدام!

کوڕە هەڵساو پێی وت:

-من ناوم(خەسرەو)ە، سەریَ لەعوسمانی هاوڕێم دەدەمو ئێستا دێمەوە.

## لەماڵی خەسرەو..!

ئەو کاتەی کنێر چووە (ئاسایشی سلێمانی)و زوخاوی بەدبەختی خۆی هەڵڕشت، وتی:

-لەگەڵ خەسرەودا ڕۆیشتم، بردمیو چەند کۆلاَنێکی پێکردم، دیاربوو دەیویست کەس نەیبینیَ، نازانم گەڕەکی کویَ بوو، پاش ماوەیەك لەدەرگای ماڵێك چووینە ژوورەوەو هەر کەچووینە ناو ماڵەکە پاڵێکی پێوەنامو دەمانچەیەکی لیَ دەرهێنامو وتی((گەر قسەبکەیت دەتکوژم))، لەویَ یەکێکی تری لیَ بوو کەعوسمانی هاوڕێی بوو، توومەس ئەمە ماڵی عوسمانەو ئەوکاتە خەسرەو چووە لای تابینێرێتەوە ماڵیَ. ماڵەکە ماڵی عوسمان بوو.. عوسمان دەمانچەکەی لەدەست سەند... خەسرەو بەپەرۆیەك هەردوو دەستی بەستمەوەو بەعوسمانی وت:( بڕۆ چەند فلیمێکی رووتو برایم تاتڵساس بهێنەو وەرەوە)...

بردمیە ژوورێکەوە، گریامو سوودی نەبوو، پارامەوەو سوودی نەبوو، بەزۆر عەزیزییەکەی هەڵدامەوەو تەعەدای لیَ کردم، هەر بە زۆر تەعەدای شەرەفی لیَ کردم... خوێن لەلەشم هاتو کردمیە ژن... سەرم گێژی

ـحـوردو كـەوتم... نـازانم خـەوتبووم يـان بێهـۆش بـووم.. دەمـەو عەسـر عوسـمـان پـەلی گـرتمو بردمیـە ژوورەکـەی سـەرەوە، لـەوێ بەڤیـدیۆ شـریتە ـووتەکانی لێدا، بەزۆر سـەیری پێکردم... ئەویش خـوای نەناسـیو رووتو قووتی کردمـەوەو کـاری خـۆی کـرد...دواتـر خواردنیـان هێنـاو.. ئیتر شـەو ـەمیانی خـەریکم بوون...خـوا هـەقی منیـان لێ بستێنێ.. ئـەو شـەوە خـوێنی ـووری دەسرێو لەبەرچاوم هەموو دنیا سوور هەڵگەڕابوو...

بەیانی بەتاکسییەك عوسمان بردمی لەبازار فڕێیدام، وای دەزانی وازیـان ـێنم. نەیزانی دێمە ئاسایشو بەگرتیان دەدەم...

## رۆژە رەشەکان..!

کەباوکی کنێر زانـی کـچەکەی هـەڵاتووەو دوای سـۆراخی زۆر دۆزییـەوەو وەك باڵندەیـەکی لەقەفـەز هـەڵاتوو گرتـیو بردییـەوە (قەفەزەکـەی)و خێـرا دەرگای لەسەر داخست...

رۆژەکـانی رەش بـوون.. تـانووتو قـسەی سـووکی باوەژنـان لـەولاوە بوەسـتێ، هەمیـشە هەناسـەی حەسـرەتی هەڵدەمـژیو هـەرگیز شـەوە سوورەکەو خەسرەوو عوسمانی لەبەرچاو ون دەبوون...

دادگـای بـەرێز، ئـەو رۆژەی دادگـایی هـەردوو تاوانبـاری کـرد بڕیـاری دا عوسمـانو خەسـرەو بەهەمیـشەیی زینـدانی بکـرێنو هەریەکەشـیان بـڕی دەهـەزار دینـار بدەنـە (کنێـر)،هـەروەها دەسـت بەسـەر دەمانچە(تارقـە)ەکـەی خەسرەویشدا بگیرێ..

کنێـر هەمیـشە بەچـاوی خـەیاڵ کۆڵانەکـەی مـاڵی نەنـە دەبینـیّو لەگـەڵ دەسـتە خوشـکەکانیدا دەدویّ.. پێکـەوە دەچـنەوە دوکانەکـەو شـت دەکـڕنو دەگەڕێنـەوە، لەبـەردەرگای مـاڵی نەنـەدا دەوەسـتنو دەدوێـن، بـەڵام هـەرگیز کنێر باسی شەوە سوورەکەو دڕندەکانی ئەو شەوەیان بۆ ناکات!..

جیاوازی نێوان تەمەنیان(٣٢)ساڵی ڕەبەقەو کەچی وا (٦)مانگی تەواوە لەژوورێکی زینداندا تۆفیق و عومەری کوڕی شەوگارو ڕۆژگاری تاریک پێکەوە دەبەنە سەر، بەدڵەڕاوکێ و ترسەوە یەك بەیەکی ساتەکان دەبژێرن، سبەینێ دادگایەو مەسەلەی(تاوانەکە)بەلادا دەخرێ.. بەر لە چەند ڕۆژێك پارێزەرەکە دڵخۆشی تۆفیقی دابووەوە، بەڵام بۆ عومەر هیچی نەوتبوو.. شەش مانگە زستان و بەهاری ئەو خەڵکە ئازادە تێپەڕیو واهاوینەو ئەمان هەر لەژوورەوەن.. ئەوا میلی سەعات بەرەو دوانزەی نیوەشەو دەچێ، شەش مانگ لەو شەوە شوومەدا، لەنیوەشەوی "٨"ی شوباتدا عومەر تاوانێکی گەورەی لەدەست قەوما.. لەچەمچەماڵ، لەشەوێکی ئاسمانی ڕەش و زەویی سپیدا، لەوکاتەی نمە نمە باران دەرژایە سەر بەفرێکی زۆر، بەخوێنی (جوامێر) زەویی سوور بوو.. سبەینێ دادگایەو هەموو شتێك روون دەبێتەوە...

## کوڕەکەی من بێتاوان بوو..

لەبەردەم دادگادا، یەکەمین قسەکەری شکاتکەر دەروێش فەتاحی باوکی جوامێر بوو، ٦٥ساڵ تەمەن و تاڵ و سوێری ژیان پشتی وەك گۆچان چەماندبووەوە، بەڵام مەرگی کوڕە (٢١)بەهاریەکەی بەجارێ کاری تێ کرد بوو، بەقوڕگێکی نووساوەوە وتی:

-کە کوڕەکەم کوژرا من و دایکی جوامێر لەسلێمانی بووین، چونکە ئێمە لەوێ دادەنیشین، ئەو زۆرجار لەچەمچەماڵ دەمایەوەو بەتەنیا لەخانووەکەی ئەوێماندا دەژیا، سەر لەبەیانی دوای ڕووداوەکە لەگەڵ مەلا بانگاندا خزمەکانی خۆمان و هاوڕێکانی جوامێر دەچنە سەر جەستەی ساردەوە بووی وشك هەڵاتووی نێو بەفر.. کە چوونەتە ژوورەوە بۆیان

ـــلماوەو دڵنیابوون کە جوامێر لەژوورەکەی خۆیدا کوژراوەو پاشان ـکێشراوەتە کۆڵان.. لەوێ فیشەکیان پێوەناوە تا چاوو ڕاو لەپۆلیس و ـنگا بکەن، کوڕەکەی من بێ تاوان بوو..داوای خوێنی بەناهەق ـ؟اودەکەم..

## کوڕی من دڵی بەگەلاویژەوە نەبووە..

بەچاوی پڕ لەفرمێسکەوە، بەکەمێ شەرمو کەمێ جورئەتەوە قسەی بۆ ـادوەر دەکردو جار جارە قژە سپییەکەی لەسەر رووی لادەداو جار جارەش بێ دەنگ رادەما..

–گەورەم، خوا ئاگای لێیە نێوان ئێمەو ماڵی وەستا تۆفیق زۆرباش بووە، چونکە دراوسێ بووینو یەك دیوارمان بەین بووەو زۆر تێکەڵ بووین، نازانم عومەری دوابڕاو چۆن دەستی چووەتە گەردنی جەرگەکەی منو چۆن لەخوا نەترسا.. کوڕی من هەرگیز دڵی بەگەلاوێژی وەستا تۆفیقەوە نەبووە، ڕۆژێ لەڕۆژان باسی ئەوەی نەکردووەو کەسمان خوازبێنیمان نەکردووە.. بەعەقڵی من ئەوان بۆ پارەو چەکەکانی کوڕەکەم ئەوکارەیان کردووەو تەماع ئەوەی پێ قەوماندوون..

## شایەتەکان وتیان چی..؟

دوو ئامۆزاو خزمێکی جوامێرو دووان لەهاورێکانی بەیانی تاریكو روون ئەو هەواڵەیان پێدەگاتو ئەوانیش چەکەکانیان دێننو دەوری هەردوو ماڵەکە دەگرن، واتە ماڵی جوامێرو ماڵی عومەر، لاشەی جوامێر بەکەمێ خوێنەوە دەبینن !!کەدەچنە ژوورەکەی دەبینن هەموو شتێ پەرشو بڵاوە.. خوای گەورە بەو نیوەشەوە چۆن ئەمە روویدا؟ دەبینن سەرینەکەی جوامێر

چـەند دڵۆپـەخوێنێکی پێوەیـەو لەسـەر جێگاکـەی چـەند مـەخزەنێکی کلاشـینکۆفی لێیـە بـەڵام چەکەکانی(تفـەنگ‌و دەمانـچە چـواردە خۆرەکـەی دیارنین )، هەروەها پارەکانی.. لەو لاوە دەبینن پێڵاوەکانی لەوێیە! کەدێنە حەوشە لەسـەر بەفرەکە جێگا پێی دووسـیّ کـەس بـەدی دەکـەن کـەرووەو ماڵی وەستا تۆفیقە.. کەدەچنە ئەودیو هـەمان جێگە پـیّ بەباشـی دەبیـنن.. بۆیـە دەمـودەس گومـان دەخەنـە سـەر (عومـەر).. هـەروەها ئاسـەواری راکێـشانی لاشـەی جـوامێر بەحەوشـەکەدا رووەو کـۆڵان‌و بەرماڵەکـەی ئـەو بەریان بەروونی دیار بوو،یەکێك لەخزمەکانی جوامێر دێتەوە بیری:

–ئای لەو ناڕەسەنە، خۆ رۆژیّ بەر لەتاوانەکەی هـەزار دینـاری لـەجوامێر قەرز کرد!

یەکێکی تریان دەڵیّ:

–هەرگیز جوامێر باسی خواستنی گەلاوێـژی نـەکردووە، ئەو برامـان بـوو هیچی لەئێمە نەدەشاردەوە!

## تفەنگەکەی جوامێر تاوانباریان دەداتە دەست..!

هەر ئەو بەیانییە، کە خزم‌و برادەرانی جوامێر(شایەتەکان) پۆلیس بانگ دەکـەن‌و دەچـنە مـاڵی عومـەر بـۆ پـشکنین، سـەرەتا وەسـتا تۆفیـق رێگایـان نادات بەڵام ئەوان گـوێی پێنـادەن‌و رووەو ژوورەکـان دەچن، ئەوان دەگەڕێن بۆ پارەو چەکەکانی جوامێر، تـەنیا تفەنگەکـەی نـەبیّ چـی دی نادۆزنـەوە، تفەنگەکە لـەناو بـەرمیلی گەنمـدا شـاردراوەتەوە دوای ئـەوەی قۆناغەکەشـی شـکێندراوە، یـەك لـەبرادەرانی جـوامێر تـەنیا بەخوێندنـەوەی ژمارەکـەی دەیناسێتەوە. ئیتر عومـەر بـەرەنگی زەرد هەڵگەڕاوو نیوە زمانێکـەوە رووەو پۆلیسخانە پێشیان دەکەویّ..

## بۆلای گەلاوێژ لەنیوەشەودا..

*گەلاوێــژی وەســتا تۆفیــق، تــەنیا شــایەتی کــاتی ڕووداوەکــە، ئــاوا مەسـەلەکەی باس کرد:

-ئێمە هاوسێ بووین، هیچ پەیوەندییەك لەنێوان منو جوامێردا نەبوو، تەنیا ئەوە نەبێ دەیویست بمخوازێ.. بەڵام بەهۆی وەفاتی دایکمەوە ئەو مەسە دواخرابوو..کاتی ڕووداوەکە لەنیوەشەودا هاتە حەوشەکەمان، کە بەوەمزانی بانگم لێکرد، لەدەنگی من کاکە عومەرم لەخەو ڕاپەڕی، چوو بۆی و لەحەوشەکەدا کردیانە شەڕ، کاکم تفەنگەکەی لێسەندو ئەویش ڕووەو دەرەوە هەڵهات، لەو کاتەدا باوکیشم بەخەبەر هات بەڵام نەچووە دەرێ. ئیتر نازانم دوای ئەوە چی قەوماوە..

ئەوە هەموو قسەکانی گەلاوێژی کەیبانووی ماڵ بوو، ئەو کچەی چوار ساڵ لەجوامێر گەورەتر بوو..

باوکیشی وتی:

-بــەفرێکی زۆر بــاری بــوو.. بــەر لــەوەی بنــووم بارانێــك دایکــرد، لەنیوەشــەودا لــەدەنگی چــەند تەقەیــەك لەخــەو ڕاپــەریم، لەپەنــجەرەکەوە ڕوانیمە دەرێو تەنیا گەلاوێژو بووکەکەمم بینی.. دوای گەڕانەوەی عومەر زانیم کە جوامێری کوشتووە، ئەو لەپێناوی پاراستنی شەرەفماندا ئەو کارەی کرد.. جوامێر چەند جارێ داوای کچەکەمی کردووە، لەو شەوەدا نەچووینەتە ماڵی تا دەستی لێ بوەشێنێنو ئاگام لەتفەنگەکەشی نییە!!

## ئەی عومەر چۆن باسی تاوانەکەی دەکات؟

-گوێم لەدەنگە دەنگ بوو وبەوە لەخەو هەڵسام، چوومە دەرێ، دەبینم جوامێر پەلی خوشکەکەمی گرتووەو دەیەوێ پەلاماری بدات، منیش هەڵمەتم بۆ بردو بووە شەڕمان، ئەو تفەنگی پێ بوو، تۆانی خۆی بگەیەنێتە کۆڵان و منیش دوای کەوتم، لەدەرەوە دووبارە بووەوە شەڕە دەست و توانیم تفەنگەکەی لێ بستێنم، لەو بەرمانەوە تەقەم لێکردو بەچەند فیشەکێ کوشتم، نەمهێشت لەدەستم دەرچێ، من ئەوەم بۆ بەرگری لەشەرەفی خۆم و خێزانەکەم کرد..

نەچوومە پۆلیسخانە تا مەلا بانگدان پۆلیس و پێشمەرگە هاتن و منیان گرت.. من لەدووریی (١٥) مەترەوە تەقەم لێ کردو بەهیچ جۆرێ ئەوە راست نییە کەچووبینە مالّی و لەوێ خنکاندبێتمان، ئینجا رامکێشابێتە کۆڵان و لەوێ فیشەکم پێوەی نابێت.. من لەوەوبەر پارەم لێ قەرز نەکردووە، تفەنگەکەشم بۆیە شکاندو لەو شەوەدا شاردمەوە وتم نەوەك خزمەکانی بێن و ئاشکرا ببم و بمکوژن..

## راپۆرتی پۆلیس..

ئەفسەری پۆلیسی چەمچەماڵ، لەراپۆرتەکەیدا بۆ کەشفی کوشتنی (جوامێر فەتاح)ی تەمەن ٢١ساڵ، بالاّ مام ناوەندیی رەنگ ئەسمەرو قژو چاو رەش نووسیویەتی:

١. ژوورەکە بەو وەزعە شپرزەیە بینراوە.

٢. کەمێ خوێن لەژوورەکەدا ئاسەواری دیار بووە.

٣. جێگای پێیەکان بەباشی لەحەوشەدا بینراوە.

## ئەی راپۆرتی پزیشک؟

د. نەوزاد لەراپۆرتەکەیدا نووسیویەتی:

-تەقەکان، بەرەو رووی ئاڕاستەکراوە، واتە رووەو کوژراوەکە.

-شکان لەئێسکی لاشەویلگەی خوارەوەدا.

لەدادگایی کردنەکەدا، داواکاری گشتی دوو داواکاریی هەبوو:

سزادانی عومەرو ئازادکردنی باوکی.

*دادگا بەر لەراگەیاندنی بڕیاری حوکمەکە، رای بەم شێوەیە بوو:

-هەردوو گومان لێکراو عومەرو تۆفیقی باوکی نێردراون بۆ ئێرە بەتۆمەتی کوشتنی جوامێر فەتاح تا بەپێی ماددەی یاسایی ٤٠٦/١مەحکەمەیان بکەین.. بۆ زۆربەی ئەندامانی دادگا دەرکەوت، پەیوەندی دڵداری لەنێوان جوامێرو گەلاوێژدا هەبووە، جار جارە لەجێگەی ژوانێکی دوور لەبەر چاو بەیەك گەیشتوون، بەو پێیەی دراوسێ بوون نیوەشەوی١٩٩٢/٢/٨جوامێر لەدیوارەکەی نێوانیانەوە بازی داوەتەماڵی گەلاوێژ بەو نیازەی پێی بگات، کە هەردووکیان لەحەوشەکەدا دەبن عومەر پێدەزانێ و دەبێ بەشەڕیان و دوای ئەوەی چەکەکەی لێ دەستێنێ و ئەویش رادەکا، ئەمیش شوێنی دەکەوێ و دەیکوژێ.. بۆ رۆژی دوایی لەلێکۆڵینەوەدا دان بەتاوانەکەیدا دەنێ و، دواتریش لێرە ئەوە دووپات دەکاتەوە، ئەو نیازی درینی تفەنگەکەی نەبوو دەنا نەیدەشکاند.. تاوانە کە کتوپڕ روویداوەو لەوەوبەر پیلانی بۆ دانەنراوە.. لەبەر ئەوانە دەبێ عومەر بەپێی ماددەی ٤٠٥سزا بدرێت، بەڵام هیچ دەلیلێ نییە بۆ بەشداریی تۆفیق لەتاوانەکەدا.. شایەتەکان هەموو دوای تیپەڕبوونی ماوەیەك ئیفادەیان داوەو هیچیان بەچاوی خۆیان رووداوەکەیان نەدیوە، دادگا باری شەخسی

گومان لێکراو لەبەرچاو دەگرێ، هەروەها تەمەنی و رابردووی و ئەوەی کەیەکەمجارە لەژیانیدا تاوانێکی وابکات.. بۆیە شایانی بەزەییە..

## رای جیاوازی ئەندامێکی دادگا...

*یەکێ لەدادوەرە بەرێزەکان رای لەگەڵ زۆربەدا نەبوو، ئەو وتی:

-من بەوە قایل نیم کەگومان لێکراو بەپێی ماددەی ٤٠٥دادگایی بکرێت و حوکمی کەمی ئەو مادەیەی بەسەردا بدرێت، چونکە:

١/باوك و دایکی جوامێر لە هەموو ئیفادەکانیاندا وتویانە کە لەماڵەکەی خۆیاندا تاوانەکە بۆ مەبەستی دزینی پارەو چەکەکان ئەنجام دراوە، ئەو بالۆرەیەشیان بەدرۆخستۆتەوە کەجوامێر یان ئەمان رۆژێ لەرۆژان خوازبێنی گەلاوێژیان کردبێت.

٢/هەر هەموو شایەتەکان و پۆلیس جێگا پێی تاوانبارەکانیان دیوە، هەروەها ئاسەواری تاوانی خنکاندنی لەژوورەکەداو خوێن بەسەر سەرینەکەیەوەو ئاسەواری راکێشانی بۆ دەرەوە..

٣/هەندێکیان کەمێ خوێنیان لەشوێنی لاشەکە بینیوە، واتە لەکۆڵان، هەرچەندە ژمارەیەکی زۆر فیشەکی پێوە بووە، کەواتە بەمردوویی فیشەکی پێوەنراوە.

٤/بەگوێرەی راپۆرتی پزیشك لاشەویلگەی کوژراوەکە شکاوەو دواتر فیشەکەکانی لەبەرامبەرەوە پێوەنراوە.

٥/ناکۆکی لەئیفادەکانی تۆفیق و عومەرو گەلاوێژدا بەروونی هەستی پێ دەکرێ، هەر بۆ نموونە گەلاوێژ رۆژی٢/٩(رۆژی دوای تاوانەکە)وتویەتی: لەسەر داوای جوامێری خۆشەویستی چووەتە ئەودیو، واتە ماڵی جوامێرو لەحەوشەکەدا دانیشتوون(واتە لەبەفرداو لەبەر باراندا!!)، باوکی و براکەی

هاتوون بەسەریانداو ئیتر زۆر بەئاسانی عومەر جوامێری چەك كردووەو هەروا لەسەرخۆ رایكێشاوەتە دەرەوە!!!

یان هەر خۆی رۆژی ٣/٢٦وتویەتی: لەنیوەشەودا كاتێ بەكارێكی پێویست چوومە دەرەوە دەبینم جوامێر لەحەوشەكەماندایە.. كەدیویەتی قیژاندوویەتی(هەرچەندە دوو ساڵە پەیوەندی دڵدارییان هەبووە)!! كەچی دواتر پێ لەو پەیوەندییە نانێت!!.

٦/بەڵگەكان ئەوە دەردەخەن كەلەلایەن ئەوانەوە جوامێر لەژوورەكەی خۆیدا خنكێنراوە.. ئینجا براوەتە كۆڵانو تەقەی لێكراوە بۆیە داوادەكەم دادگای بەرێز بەپێی ماددەی ٤٠٦ حوكمی بدات..

## پارێزەریش بەرگری دەكات..

پارێزەری بەرگری عەرزی دادگای كرد:

-عومەر بەپێی دابو نەریتی عەشایری ئەو كارەی كردووە، چونكە ئەو كوڕی لادێیە.

-دان پیانانی بەتاوانەكەیدا بەو دەستو بردییەو راستگۆییە، یارمەتیی عەدالەتی داوە.

-باوكی هیچ بەڵگەیەكی ئەوتۆی لەسەر نییە كەبەشداری تاوانەكە بێ..

-قسەی شایەتەكان(بێجگە لەگەلاوێژ) هیچ بەهایەكی یاساییان نییە، چونكە خۆیان تاوانەكەیان نەدیوە..

-عومەر گەنجەو تاوانی تری نەكردووەو داوای بەزەیی دادگا دەكەم

## بڕیاری دادگا..

١/حوكمی زیندانی كردنی عومەر بە(٧)ساڵ بەپێی ماددەی ٤٠٥و دەبێ لەو كاتەوەی گیراوە(كە٦مانگە) لەو حوكمە حساب بكرێت.

٢/ئازاد كردنی تۆفیقی باوكی تاوانبار.

٣/دەبێ تاوانبار(٢)هەزار دینار بداتە دایكو باوكی كوژراوەكە.

٤/تفەنگەكە دەنێردرێت بۆ بنكەی پۆلیسی چەمچەماڵ.

٥/ماندووبوونی پاریزەری بەرگریكەر بە ٤٠دینار دەخەملێنرێو لەخەزێنەی دەوڵەت بۆی سەرف دەكرێت.

رۆژی ١٩٩٣/٧/٥ لەکۆبوونەوەیەکی دادگای تەمیزی هەرێمی کوردستاندا داوای ژمارە(٤٩/ج/١٩٩٣)خرایە بەر باس و لێکۆڵینەوە کەلەدادگایی کردنێکی رۆژی ١٩٩٣/٢/٨ی دادگای جینایاتی کەرکوکدا کەبۆ هەردوو گومان لێکراوو جووتە خوشك(نەرمین)و(نازە) ئەنجام درابوو وبەپێی بڕیاری دادگای بەرێز یەکەمیان ئازاد کرابوو، دووەمیشیان بەپێی مادەی٤٠٥و دوو دەلالەتی بە شەش مانگ حەپس کردن حوکم درابوو، دادگا ئەو بڕیارەی لەلاپەسەند نەبوو، لەرۆژی ناوبراودا داوای لەدادگای کەرکوك کرد کە سەرلەنوێ دادگایی جووتە خوشك بکاتەوە، بەتایبەت کەتاوانەکە تاوانی کوژرانی مرۆڤێکەو دەبێ ئەمجارە لەچۆنیەتی تاوانەکەو پێشینەی و خواستی شاردنەوەی جەستەی کوژراوەکە بکۆڵنەوەو بڕیاری شیاو بەسەر(پیاو کوژەکاندا)بدەن، ئەوە بوو دادگای ناوبراویش سەرلەنوێ و لەرۆژی ١٩٩٤/٤/١١دا داواکەی هێنایەوە پێشی و دادگایی گومان لێکراوانی کردەوە، بەلام بەرلەوەی لەبڕیاری دادگا و چۆنێتی هەڵسەنگاندنی تاوانەکەو چارەنووسی خوشکان(نازەو نەرمین)بدوێین، بابزانین تاوانەکە چۆن کراو کێ کردی و چۆن ئاشکرا بوو؟

## کەکورەکەم کوژرا من لەوێ نەبووم...

حاجی عەلی تەمەنی سەروو شەست بوو بەلام باری سەختی ژیان و دەرامەت ناچاری کردبوو بەفەلاحەتەوە خەریك بێت، ئەو رۆژە(١٩٩٣/٥/٢٨) بەیانی زوو بۆ کاروباری نێو کێڵگە لەماڵی خۆی(لەچەمچەماڵ) دەرچوو بوو لەگەڵ منداڵەکانیدا رووەو مەملەحەی نزیك سەنگاو بۆ سەر زەرعاتەکەیان چوو بوون، رۆژی دوایی ئەوکاتەی حاجی بۆ پشوودان لەژێر کەپرەکەدا

ـ رەقەی ماندوێتی دەسپی بەگەیشتنی(هەواڵێك) جەرگو هەناوی کەوت!
ـیری خوشکەزای بەشپرزەییەوە پێی وت:

-خاڵەگیان، ئەمشەو کاك سەرکەوت کوژراوەو وادەیبەن بەرەو سەرقەبرانو بۆ ناشتنی چاوەڕێی تۆ دەکەن...

حاجی بەدادگای وت:

-کە ئەو هەواڵە جەرگبڕەم بیست دەست بەجێ بەرەو چەمچەماڵ گەڕامەوە، لەسەرقەبران (سەرکەوت)ی کوڕم دی لەدارەمەیتدا راکشابوو، کاتێ گڵیان بەسەردا دەدا لەیەك دوو کەسی نزیکی خۆمم پرسی کێ کوشتی؟ لەکوێ کوژرا؟

پێیان وتم: نەرمینی ژنیو نازەی ژنخوشکی لەماڵی لەتیفی ئاوەڵ زاوایدا کوشتیان!!

## ئەی لەتیف وتی چی؟

-من بەچاوی خۆم نەمدیوە سەرکەوت بەدەستی نازەی ژنی منو بەهاوکاریی نەرمین کوژرابێ، بەڵام چۆن تاوانەکە ئاشکرا بوو، بابۆتانی بگێڕمەوە، ئەو رۆژەی خوێنی تیاڕژا سەرکەوتو ژنەکەی هاتنە ماڵمانو دوای بەخێرهاتنی گەرمم لێیان، بەمەبەستی چوونە راوی باڵندە مۆڵەتم لێ وەرگرتنو وتم ئێوە لەماڵی خۆتاندان، ئەوان شەو نەرۆیشبوونەوەو لەماڵی ئێمە مابوونەوە، من بۆ بەیانی رۆژی داهاتوو گەڕامەوە، هەر کەلە تارمەکە دانیشتم بینیم ئاسەواری فیشەك بەسەقفەکەوە دیارە، پرسیم ئەمە چییە؟!
نازە وتی: هێمن یاریی بەتفەنگەکەت کردو فیشەکی لەدەست دەرچوو...
منیش وتم: تۆ بڵێی ئەو کوڕە بچووکەم ئەمەی کردبێت، سەیرە!! بەڵام هەر کەچوومە ژوورەوە دەبینم جێگای چەند فیشەکێکی دیکە بەدیوارەکەوە

دیاره! کەوتمە گومانی تەواوو تورەیی گرتمی، نازەو نەرمینی خوشکیم بانگ کردو وتم:

-بەبێ درۆ پێمی بڵێن چی روویداوە؟

ئەوانیش بەترسەوە کەوتنە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەو دواجار گۆڕی سەرکەوتیان نیشاندام، بەجارێ حەپەسام، ئەمە چۆن روویدا؟ ئەی بووە گۆڕ لەحەوشەی ماڵدا هەڵکەندرێ؟ چۆن خەڵکی لەحەوشەدا دەکرێ بەژێر گڵەوە؟؟ هەنگاوێکم کرد بەدووانو بەڕاکردن چووم خەبەرمدا.

## سەرکەوت چەند فیشەکی پێوە بوو؟

هەر ئەو رۆژەی کەلاشەی سەرکەوت برایە نەخۆشخانەی سلێمانی بۆ (تشریح) پزیشکی پسپۆڕ لەراپۆرتەکەیدا لەهۆکاری مردنی دەدوێو دەنووسێ:

-دوو فیشەك بەرسەرەوەی رانی چەپی کەوتووەو ئێسکەکەی شکاندوە وهەردووکیان دەرچوونو بوونە هۆی خوێن بەربوونی، چوار فیشەك بەر سکی کەوتووەو ریخۆڵەکانی گرتووەو خوێنی زۆری بەربووە، هەر چواریان لە پشتییەوە دەرچوون، دوو فیشەکی تر بەرلای چەپی سنگی کەوتووەو لەپشتەوە دەرچوونو لەوێشدا بۆتە هۆی خوێن بەربوون... لەگەڵ ئەوانەشدا بەچەقۆ ملی بریندار کراوەو ویستراوە دوای کوشتنی سەریشی ببڕن..!

## نازە چۆن دەستی چووە خوێنی زاواکەی؟

نازەی تەمەن(٢٢)ساڵ کەیبانووی ماڵ، ئاوا بەسەرهاتەکەی بۆ دادوەر گێڕایەوە:

-پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەی کارەساتەکە تیایدا ڕوویدا، نەرمینی خوشکم و سەرکەوتی مێردی هاتنە ماڵی ئێمە، لەپێشدا لەتیفی مێردم لەماڵ نەبوو، عەسر بوو هاتەوەو دوایی بۆ ڕاو چووە دەشت و ئەو شەوە نەگەڕایەوە، تفەنگەکەی لەتیف لەپشتی سەلاجەکەماندا دانرابوو لەژوورەوە، نەرمین ویستی بڕۆنەوە ماڵی خۆیان، بەڵام سەرکەوت ڕازی نەبوو، وتی بۆ خۆمان ئەمشەو لێرە دەبین..!

ئێوارە بوو، لەمەتبەخ خەریکی ئامادەکردنی خواردن بووم سەرکەوت هاتە ئەوێ و یەکسەر پێی وتم: نازەگیان خۆشم دەوێی، حەزم لێتە...! منیش بەجارێ حەپەسام، بەتایبەت کەمن و خوشکەکەم لەسێ مانگ لەوەوبەرەوە گومانمان لەسەرکەوت هەبوو کەبەدەستی خۆی و براکەی و خوشکەکەی کە(براژنی خۆمان بوو) و لەبەر پارە نامەردانە باوکم و دایکم و مامیان کوشتبێ! دووبارە وتی: نازە من شێتی تۆ بووم، هەر لەبەر تۆ خوشکەکەتم هێنا تا بەتۆبگەم...

من بەجارێ وڕبووم و ئەویش دەستی گرتم و لێم نزیک کەوتەوە، پێم وت: شەرم ناکەی، داناوەشێی، تۆ وەکو برامی چۆن شتی وا دەڵێی، ئەی ئەگەر ژنەکەت پێ بزانێ؟!!

سوودی نەبوو، هەر لەوێدا پەلاماری دام و ویستی ئاوەڵکراسەکەم داکەنێ و کاری خۆی بکات، منیش بۆ ئەوەی ڕزگارم بێ بەدرۆ بەڵێنی ئەوەم پێدا کەشەو دەچمە باخەڵی و چی بوێت بەدزییەوە بەگوێی دەکەم... لێم دوورکەوتەوەو چووە ژوورەوە، کەهاتمە دەرێ نەرمینم بینی کەلەحەوشەکەدا خەریکی ئاو دەرهێنان بوو لەبیرەکەدا بەماتییەوە تێی ڕوانیم و بەچاو پێی وتم (ئاگادارم، ئاگاداری ئەو دڕندەیەم چی لێت دەوێت خوشکەکەم!!!). دوای نان خواردن، دەمڕوانییە چاوەکانی سەرکەوت و بیری

قسەکانی و پەلاماردانیم دەکەوتەوە، بیری ئەوەشم دەکەوتەوە کەدەستە رەشەکانی بەشداربووە لەکوشتنی دایك و باوك و مامە بێ تاوانەکەم... هەر بۆیە بڕیارم دا...

## سەرکەوت چۆن کوژرا؟

دوای نیوەشەو کاتی خەوێ، نازە دوای ئاگادارکردنی نەرمین و دوای خەوتنی منداڵەکان، بەڵێنەکەی خۆی بەجێهێناو چووە جێگای سەرکەوتی زاوای، بەڵام بەدەستی بەتاڵەوە نەچوو، بەرلەوەی بچێتە ژوورەوە دەستی دایە کلاشینکۆفی مێردەکەی و میلی هێنایەوە، سەرکەوت لەجێگای خۆیدا وشك بوو، نازە پێی وت: هەر ئێستا تۆڵەی کەسوکارە بێ تاوانەکەمت لێ دەکەمەوە، تۆ بوویتە هۆی نەمانی نزیکترین کەسمان، هێشتا دەتەوێ شەرەفی خۆم و کەسوکارم نەوی کەیت؟

سەرکەوت دەپاڕێتەوەو نازە بەفیشەك وەڵامی دەداتەوە، یەك و دووان و سیان و.. لەخوێنی خۆیدا دەگەوزێ، لەگەڵ نەرمیندا چەقۆ دێنن تاسەریشی ببڕن.. ئینجا رایدەکێشنە حەوشەو پاش ئەوەی چاڵێکی وەکوگۆڕی بۆ هەڵدەکەنن دەینێژن، هەر ئەو شەوە خوێنی سەرکەوت دەشۆن و ژوورو تارمەو حەوشە خاوێن دەکەن، بەڵام بەسەقف و دیوارەوە جێگای فیشەکەکان دیار دەمێنێ...!

## نەرمین چۆن دانی بەتاوانەکەدا نا؟

بۆ رۆژی داوایی، کەلەتیف دەگەڕێتەوە، دوای سۆراخی ئاسەواری فیشەکەکان و تووڕەبوونی، نەرمینی ژنی ماڵ و تەمەن(٣٢)ساڵ لەسەرخۆ بەلەتیفی زاوای دەڵێ:

-برای بەڕێزم، بۆ خۆت باش دەزانی مێردەکەم و کەسوکاری ـو ٦٠ هەزار دینار بوونە هۆی نەمانی باوک و دایک ومامەمان، لەوەش خراپتر ـیرەکەی من تەماعی کردبووە ژنەکەی تۆ کەبەخۆشکی دەشیٚ، ئەی وا ـبوو نازە، وانەبوو؟! (نازە کەوتە قسەو درێژەی بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە)، ـەرمینیش وتی:

-ڕاست ئەکات، کاتیٚ ئاوم لەبیرەکەدا دەردەهێنا گوێم لەدەنگی ئەم بوو بەسەرکەوتی دەووت: (عەیب ناکەی، تۆ وەکو برای من وایت!!)، ئێمە کاریٚکمان کردووە کە دەبوو بیکەین، دڵنیام خوا لێمان دەبووریٚ چونکە هەر خۆی ئاگاداری هەموو شتێکە.

## بڕیارەکانی دادگا...

سەرەتا دادگای بەڕێز لەئەنجامی وەرگرتنی ئیفادەی گومان لێکراوو شایەتەکان، بەبڕیارێك نەرمینی ئازاد کردو نازەش بە(٦) مانگ حوکم درا کەئەویش بەماوەی گرتنەکەی تەواو بوو بوو، هەربۆیە ئازاد کرابوون...

بەڵام کەوەڵامی دادگای تەمیز هاتەوە، تیایدا نووسرابوو:

-لەبەر ئەوەی تاوانەکە بەتەگبیرو لەسەرخۆ ئەنجام دراوەو بەرێکەوتنی هەردوو خوشك، دوای ئەوەش کە سەرکەوت کوژراوە هەوڵی سەربڕینیشی دراوە، پاشان بەهەردووکیان لە حەوشەدا لەگۆڕیان ناوەو ئەو ناوەیان شتووەو چی پارەش بەکوژراوەکە بووە هەموویان بردووە بۆ خۆیان، نازەی گومان لێکراوی یەکەم هۆکاری تاوانەکەی بەوە دەردەخات کە بکوژی دایك و باوکی ویستویە بەزۆر شەرەفی لەکەدار بکات، بەڵام ئەمە ڕێی تیٚ ناچیٚ و مەنتیق قبوولٚی ناکات، ئایا کەسیٚ بڕوا دەکات کابرایەك لەماڵێکداو لەمەتبەخدا پەلاماری ژنخوشکی بدات و ئاوەڵکراسەکەی داکەنیٚ و ژنەکەی

خۆیشی لەحەوشەبیٚ؟!! کەواتە پەنابردنە بەر دەلالەتی هەردوو مادەی ١٢٨و١٣٠لەیاسای سزادان بۆ ئەم گومان لێکراوە نابیٚو راست نییە، هەروەها بڕیاری ئازاد کردنی (نەرمین)یش دیسان رەوا نییە، چونکە بەکردەوە بەشداری تاوانەکەی کردووەو خۆیشی دانی پیادا ناوە، هەروەها دەبوو جووتە خوشک بەتاوانی دزی کردنیش مەحکوم بکرانایە، بۆ تفەنگەکەش دەبوو رەوانەی دادگای لێکۆڵینەوە بکرایە نەك دەستی بەسەردا بگیریٚ، چونکە بەکارهێنانی تفەنگ بیٚ بیانوو بۆ خۆی تاوانێکە.

## دوا بڕیاری دادگا

رۆژی ١٩٩٤/٤/١١ دادگای جنایاتی کەرکوك لەبەرتیشکی بڕیاری دادگای تەمیز دادگایی بۆ ئەم داوایە ساز کردەوە بە(غیابی) حوکمی بەسەر گومان لێکراوان (نازە)و (نەرمین)دا بەم شێوەیە دا:

-زیندانی کردنی نازەو نەرمین هەریەك بۆ ماوەی(١٥)ساڵ بەپیٚی مادەی ٤٠٦.

-زیندانی کردنی نازەو نەرمین هەریەك بۆ ماوەی (٥)ساڵ بەپیٚی مادەی ٤٤٦.

-ئەو ٨٣٦٠دینارەی لە سەرکەوتیان دزیوە لەلایەن دادگاوە دەدرێتەوە کەسوکاری کوژراوەکە.

ئەم بڕیارەش جارێکی تر رەوانەی تەمیز کرایەوەو هەردوو حوکم دراویش بە"رۆژنامەکان"لەحوکمیان ئاگادار دەکرێنەوە.

# بەپێخاوسیماڵی جێهێشتو
# بەبێوەژنی گەڕایەوە بۆی !

ڕۆژی ٢٠٠٠/٤/٢٩ لاشەی (حەمەعەلی) برایە نەخۆشخانە، ئەو بەیەك فیشەك گیانی سپاردبوو، فیشەكی دەمانچەی كەسێكی نزیكی خۆی، نزیك لەخزمایەتیدا، بەڵام دوور لەپەیوەندیی و خۆشویستندا... ئەوان كەمجار بەیەك گەیشتبوون، مەگەر بۆنەیەك، یان نەخۆشییەك، یان ڕێكەوتێك وای بكردایە پشكۆ بچوایەتەماڵی، ئەگینا چارەی یەكتریان نەدەویست، بەتایبەت پشكۆ، كەئاگاداربوو حەمەعەلی زوخاوی دەكرد بەگەرووی نزیكترین كەسیداو زۆرجار بەردەبووە گیانیی و شلكوتی عومری دەكرد..

ئەو ڕۆژە لەنەخۆشخانە لەراپۆرتی پزیشكدا نووسرا:

-حەمەعەلی، تەمەن ٤٣ ساڵ.

-باڵا مام ناوەندی، گەنم ڕەنگ، قژ ماش و برنجی، چاوڕەش...

هەروەها نووسرابوو:

-فیشەكێك لای چەپی سنگی گرتووەتەوەو لەسنگیدا ماوەتەوە، لەنەخۆشخانە دەرهێنرا، بەهۆی خوێنبەربوونی زۆرەوە مردووە.

## حەمەعەلی كێ بوو.. بۆچی كوژرا؟!

حەمەعەلی زاوای پشكۆبوو، واتە مێردی (پاكیزە)ی خوشكی گەورەی كەحەوت ساڵ جیاوازی تەمەنیان بوو.. ئەو دایكی چوار منداڵ بوو، هەمیشە ناكۆك و ناتەبابوو لەگەڵ حەمە عەلی مێردیدا، زۆرجار بەتۆراوی دەچووەوە لای كەسوكاریی و كلافەی خەمەكانی لای پشكۆی برای دڵسۆزی دەكردەوە..

گەلێكجار پشكۆ ئامۆژگاری زاواكەی دەكردو پێی دەوت:

-پیاوی چاك بەو مەهێڵە دەنگتان بچێتەدەر... ئاخر تۆ بۆ وادەکەی..

هەرجارە حەمەعەلی بەبیانوویەك قسەی رێك دەخستو زۆربەی جار دەیووت:

-خەتای پاکیزە خانە، خۆ هارنەبووم.. خۆشێت نەبووم!

دواجارو دوادیداری پشکۆو زاواکەی قسەیەکی وای تیانەکرا، بەڵکو بەفیشەکێکی دەمانچەکەی ساردی کردەوەو هەر خۆیشی چوو ئوتومبێلی بۆ بهێنێت تابیگەیەنێتە نەخۆشخانە.!

## ئەو رۆژەی تاوانەکەی تیاکرا.!

رۆژی ۲۰۰۱/٦/۱۰ لەگەڵ ئەوەدا کەرۆژێکی یەکجار گەرمو ناخۆش بوو، بۆ (پشکۆ)ی میوانی ساڵ زیاتری نێو زیندان گەلێ درێژبوو، کۆتایی نەدەهات، سبەینێ دادگایی دەکرێو بەرامبەر کوشتنی زاواکەی حوکم دەدرێت..

ئەو رۆژەو شەوەکەی پشکۆ لەگەڵ حەمەعەلیو خوشکەکەی خۆیدا دەژیاو لێیان جیانەدەبووەوە..

شێوەی ئەو زاوایەی کە ۱۵ ساڵ زیاتر بوو تێکەڵیان بووبوو، بەرچاوی جێنەدەهێشت، بیری چووەوە بۆ ئەو جارانەی کەناکۆکی دەکەوتە نێوان حەمەعەلیو پاکیزەی خوشکیو هەموو جار ئەم دەکەوتە نێوانیان، هەموو جارێکیش پارەی دەدا بەخوشکەکەیو منداڵەکانی..

ڕێک ئەو ڕۆژە هاتەوە بەرچاوی کە سەرلەبەیانی پاکیزەی خوشکی بەپێی پەتی لەتاکسییەک دابەزی، ئەمیش نووسینگەی کارکردنەکەی جێهێشت و لێی نزیک بووەوە:

–چییە، دەموچاویشت خوێناوییە، چییە بۆچی منداڵەکانت زەردهەڵگەڕاون.. چی قەوماوە؟

لەسەرخۆو بەدەنگی نزم و قوڕگی پڕ لەگریانەوە وەڵامی دایەوە:

–دوابڕاوەکەی مێردم هەر پێنجمانی کردە دەرەوە..

–دەی گوێ مەدەرێ.. ئێستا بەرەو کوێ..

–نازانم پارەشمان پێ نییە، تۆ شتێکمان بەرێ بۆ کرێی تاکسییەکە..

–بەسەرچاو ئێوە بڕۆنە ماڵی دادە.. نیوەڕۆ دێم بۆ لاتان..

ڕۆیشتن بەرەو ماڵی خوشکی گەورەیان.

پشکۆ هەڵچوو، دەماری جولا، ئاخۆ چ ڕەوای هەقە هەموو جارێ ئەو کابرایە سەروچاوی خوشکەکەی بهێنێتە خوار.

لەنووسینگە پەلاماری کلاشینکۆفێکی دا.. بەتاکسییەک ڕووەو ماڵی زاواکەی لەکارێزەوشک کەوتەڕێ.. دابەزی، بەپێپلیکانەکاندا سەرکەوت.. هاواری کرد.. وەڵامی نەبوو، لەوێ نەبوو، گەڕایەوە نووسینگە.. کلاشینکۆفەکەی دانا..

–من دەمانچەیەک بکڕم باشە.

نیوەڕۆ چووە لای پاکیزە، بەسەرهاتی دواشەڕیانی بیست، بەخوشکی وت:

–بابچینە بنکەی پۆلیس و شکاتی لێ بکە..

چوونە بنکەو هانای خۆی بردە لای ئەوان.. پاکیزە لەپۆلیسەوە بۆ یژنەی پزیشکی نووسراوی بۆکرا، تاکو بزانن ئاخۆ لێدانی مێردەکەی چەند کاری کردووەتە سەر..

پاش نیوەڕۆ چووە بازاڕو دەمانچەیەکی میکارۆفی بەهەزارو پێنج سەد دینار کڕیو هەڵیگرتو چووەوە بۆ ماڵی حەمە عەلی، ئیتر لەوێ قەوماو بەدەستی پشکۆ زاواکەی ساردبووەوە..

ئەو رۆژە هەموو ئەو شتانە هاتنەوە بەرچاوی پشکۆ.. شەوەکەی هەر خەو لەچاوی نەکەوتو رۆژی کوشتنی حەمە عەلی هەراسانی کردبوو.. بۆ رۆژی دوایی نزیك نیوەڕۆ برایە دادگا وەك بکوژی زاواکەی دادگایی کرا..

## بەمەبەستی قسەکردن چوومە ماڵی

رۆژی ٢٠٠١/٦/١١ دادگایی پشکۆ کرا، دوای پرسیاری دادوەر، پشکۆ قسەی بۆ دادگا کردو وتی:

-من بڕیارم وابوو قسە لەگەڵ حەمە عەلی بکەم، نیازم بوو گلەیی لێ بکەمو پێی بڵێم: چ رەوایە ژنێك بەپێ خاوسی بەچوار منداڵەوە بکەیتە دەر؟ پێی بڵێم: خوشکەکەم چی کردووە، ئاخر بۆ لێی دەدەیت، تۆ بۆ لەخوا ناترسی؟!

بەڵام ئەو بواری نەدامو بەقسەی سووكو جنێودان وەڵامی دامەوە، خوا ئاگادارە دەمانچەکەم بۆ ئەوە بردبوو تائەگەر پەلاماری دام بەرگریی لەخۆم پێ بکەم..

ئەو پەلاماری دامو ویستی لێمبدا. بەدەرنەفیسێك پەلاماری دام، من هەر دەمووت پیاوبەو لەسەرخۆبە.. عەیبە ئێمە خزمین.. سوودی نەبوو هەر شالاوی بۆ دەهێنام، ناچار بۆ بەرگریی لەخۆم، دەمانچەکەم دەرهێناو تابیترسێنم هێنامە سەرێ، ئەو پەلاماری دام، تا لێمی بسێنێ، زەخت چووە سەر پەلەپیتکەو فیشەکێ تەقی، بۆ نەگبەتی بەر ئەو کەوت.. ماوەی نێوانمان هەر مەترێك دەبوو، کەوتە سەر زەوی، رامکردو چوومە دەرێ تا تاکسی بێنم، باشە گەر ویستی من کوشتنی بوایە دەچووم ئوتومبێلی فریا خەم تابیگەیەنمە نەخۆشخانە؟

گەر حەمە عەلی لەگەڵمدا هێمن بوایە هەرگیز ئەوە رووی نەدەدا، بەڵکو هەر ناچاریش نەدەبووم دەمانچەکەم دەربهێنم..

*دواجار پشکۆ بەدادگای بەڕێزی وت:

-من ژنم نەهێناوە، بەڵام دایکمو برا بچووکەکانم بەخێودەکەم، من هەرگیز تاوانم نەکردووەو هیچ کاتێك نەگیراوم، من هەر ناشزانم چۆن چۆنی چەك بەکاردێ.. دوای ئەو رووداوە دەمانچەکەم لەنزیك قوتابخانەکەی کارێزەوشك فڕێدا..

## ئەوە کەی ژیان بوو.. دۆزەخ بوو دۆزەخ.!

هەر رۆژی دادگایی کردن پاکیزە قسەی بۆ دادگا کردو وتی:

-من فەرمانبەرم، هەمیشە لەکارەکەمدا دڵسۆز بووم، دەمویست خێزانەکەشم بەبەختەوەری بژین، بەڵام کوا بەدەستی ژنە.. من ٢٤ساڵ بووم کەدرام بەحەمە عەلی، خوا دوو کچو دوو کوڕی دایێ، منداڵە گەورەکەم

تەمەنی پانزە ساڵە، ژیانم هەمووی ناخۆشی بووە، بەڵکو بەجارێ دۆزەخێ بوو بۆخۆی، گرفتمان یەکجار زۆر بوو، هەمیشە قسەی پێدەوتم و گەڵێ جار لەخۆم و منداڵەکانمی دەدا..

رۆژی رووداوەکە، حەمە عەلی لێیدام، لەسەرئەوەی شەوی رابردوو لەماڵی خوشکم مابووینەوە، سەرەتا بەدەست لێی دام و دوایی چوو داری هێناو سەرو گوێلاکی پڕکردم لەخوێن و کەوتە گیانی منداڵە قوڕبەسەرەکانیش.

خوا عافووی کات، نەیهێشت نانی بەیانی بخۆین، بەپێ خاوسی لەماڵ کردمییە دەر، خۆم و منداڵەکان چووینە لای پشکۆ، وەك وتی: ئەو رەوانەی ماڵی باجیمی کردین، کوێرایم دایە لەوەتەی شووم کردووە بووم بەسەرچاوەی ئاژاوە بۆ ژیانی پشکۆ، بەقوربانی بم لەجێی هەموو کەسم بووە، هەمیشە ئەو فریام کەوتووە..

ئەو رۆژە ئێوارە زانیم بەمردنی حەمە عەلی، دوایی زانیم پشکۆ ئەوەی لەدەست قەوماوە، خوشکی کوێربێت، بۆ ساڵێك و دوو مانگ دەچێ گیراوە، لەسەر تاوانێ کەهەرگیز نیازی ئەنجامدانی نەبووە، ئەو بێگوناهە، من تازە باوکی منداڵەکانم لەدەستچووە، بەڵام لەچارەنووسی براکەم دەترسم، برای من هەرگیز هەڕەشەی لەحەمە عەلی نەکردووە، خوائاگادارە سەرەتا خۆشی دەویست، بەڵام لەگەڵ من ئەوەندە خراپ بوو، ئەویش زوو زوو دەکەوتە نێوانمانەوە.. تکاتان لێدەکەم لێی ببورن.. پشکۆ بەردەن و باچیتر ئازاری زیندان نەبینێ..

## بڕیاری دادگا..

هەر ئەو ڕۆژە دادگا قەناعەتی خۆی خستەڕوو، بەبڕوای دادگا پشكۆ بەمەبەستی كوشتنی زاواكەی دەمانچەی كڕیوە، هەر بەو مەبەستەش چووەتە سەری لەماڵەكەی خۆیدا..

دادگا بڕیاریدا بەزیندانی كردنی هەمیشەیی پشكۆ، واتە بە(مۆبد).

بۆ حەوت مانگ دەچێ ئەو بڕیارە بەسەر پشكۆدا دراوەو پاكیزەی خوشكی بەدبەختیشی بەبێوەژنی گەڕاوەتەوە نێو ماڵەكەی، ئەو ماڵەی هەرگیز تیایدا ئاسوودە نەبووە.

رۆژی ٢٠٠٢/١/١٢، لەبەردەم دادوەری لێکۆڵینەوەی شارەزووردا، (عەزیز)ی تەمەن ٥٥ ساڵ بەدڵی گەرمەوە کەوتە قسەو وتی:

-من بەڕەگەز ئێرانیمو خەڵکی ناوچەی جوانڕۆم، لەشەڕی عیراق-ئێراندا ئاوارەی ئەمدیو بوومو لای (زەڕایەن) گیرسامەوە، ساڵی ١٩٨٨ ئەم (سەبیحە)یەی خێزانم خواست، پاشان چووینە شاری رومادیو لەئۆردوگای ئێرانییەکان ١٠ ساڵ ماینەوەو ئینجا گەڕاینەوە کوردستان، ماوەیەك لەشارەزوور لەگەڵ ماڵی خەزوورم بووینو ئیتر چووینە ئەودیوو لەجوانڕۆ ماینەوەو کاسبیم دەکرد، ئێمە (٥ )کەس بووین، منو سەبیحەو دوو کچمو کوڕێك، بەینێ لەمەوبەر بەنیازی سەردانی ماڵی باوکی ژنەکەم منداڵەکانی هێناو هاتنەوە ئێرە، زروفم نالەبار بوو تابێمەوە بەشوێنیاندا، لەم دواییەدا هەواڵم پێگەیشت کە(شۆخە)ی کچی گەورەم کوژراوە، وتیان ماڵی خەوزوورم کوشتویانە، ئیتر یەکسەر هاتمو من سکاڵام تەنیا دژی سەبیحەو (جەبار)ی برایەتی، چونکە ئەوان کوشتویانە، ئیتر هیچ شکاتێك لەنەزیرەی ژن خوشکمو خەزوورو خەسووم نییە.

*پاشان عەزیز بەدادوەری وت:

-داواکارم فەرمان بدەن کوڕو کچەکەی ترم پێبدرێتەوەو خواهەڵناگرێ بێگوناە لەگەڵ دایکیاندا لەزینداندا ژیان بەرنە سەر.. من نازانم بۆچی کچە گەورەکەم کوژراوە، هیچ شتێکی خراپیشم لەژنەکەم نەدیوە، بەڵام من پیاوێکی هەژاربوومو بەکرێکاری خێزانەکەم دەژیاند، گەر خوانەخواستە لەپشتی منەوە شتێکی کردبێت ئەوا نازانم.

## لێدان.. دامرکاندنەوەی حەزێکی شێتانە !

شۆخە تەمەنی ١١ ساڵ بوو، دووانەکەی تریشیان، کوڕە چوار ساڵو کچە بچکۆلەی یەك ساڵ بوون، شۆخە کەماڵی باوکی لەرومادی بوو فامی کردبووەوەو، چونکە زۆر هۆگری باوکیشی بوو هەموو قسەیەکی بۆ دەکرد، هەروەها لەئێرانیش دایکی لێی دەدا، ئەو دەگریاو ئەمیش دەیووت (سەرت لەقوڕنێن، من دەبێ قسەیەك لەگەڵ یەکێك بکەمو ئێوارە باوکت بیزانێ!).

کەگەڕانەوە لە شارەزوور لای نەزیرەو جەبار چەند جارێك باسی خراپیو زۆربلێیو فیتنەیی (شۆخە)ی بۆ دەکردن، سەبیحە دەیووت:

-ئا ئەم کچە بەدفەساڵە مایەی مەینەتیی من بوو، نەیدەهێشت لەگەڵ عەزیزدا بگونجێین، ئەم دەم ڕەشە بەهەقو ناهەق شکاتی لێدەکردم، ئەم بوو بەلێدانی دەدام.. هەر ئەمیش بوو شیرازەی ماڵی لێ تێکداین.. ئەم بەمنی دەووت (خراپ)..

ئیتر دەکەوتە ژێر چنگی بێبەزەییانو هەموو گیانی شینو مۆر دەکرایەوە، زۆرجار نیوەمردوو دەبوو، بەتایبەت بەدەستی خاڵە هارەکەی.. هەندێ جار دایکی بێڕەحمیشی لێی دەدا، هەندێ جاری دیکەیش پورە نەزیرەیشی ترسی خوای لەدڵدا نەبوو، پەلاماری ئەو بەستەزمانەی دەدا. هەموو ئەو جارانە دایكو باوکە پیرەکەی سەبیحە بێدەسەڵاتو بێدەنگ بوون.. جارێك پیرەژنەکەیان وتی (ڕۆڵە بۆ وای لێدەکەن، گوناهتان دەگات، ئەو کچە چی کردووە؟)، سەبیحە وەڵامی دایەوە (ئەمە سەرەخۆریە، ئەمە بوختانی بۆ هەڵدەبەستم..)، کچە گوێی لەوەبوو بەترسەوە وتی (بوختان نەبو، ستم دەکرد). ئیتر پەلاماری درایەوەو سەرولوتی شکێنراو خوێن بەدیر- سەکەیدا هاتەخوار.

## ئەو ڕۆژەی بەیەکجاریی ڕەوانەی مەرگ کرا !

پاش نیوەڕۆی ٢٠٠١/١٠/١٢ جەبار بەخۆیو جانتای دەستیەوە گەیشتەوە هەڵەبجەی تازە، لەماڵەوە پشوویەکی داو هەواڵی عەزیزی پرسی:

-ئەرێ ئەو کابرایە دەنگی نییە. نیازی نییە بێتەوە دواتان؟

سەبیحەی خوشکی وەڵامی دایەوە:

-نەوەڵڵا، ناکەس بەچەیە هەر دەڵێی ژنو منداڵیشی نییەو مێش میوانی نییە.. ئەوە هەر خۆم ئەزانم چ بەرازێکە..

شۆخە بەو قسانە دڵی گوشرا.. بەدەنگی نزمەوە بەدایکی وت:

-عەیبە قسە بەباوکم دەڵێی، خوا دەزانێ گرفتاری چییە؟

بەو قسانە خاڵۆی هەڵچوو، نەڕاندی بەسەریدا..

-نەخێر گرفتاری نییە، بەڵکو خراپو نالەبارە، باوکت هەر پیاو نییە.

-دەوەڵڵا وانیە. باوکی من زۆر باشە..

خاڵۆی نەیهێشت قسەکانی تەواوکاتو پەلاماری دا، دایکیشی (ماسیحە)یەکی هێناو کەوتە کوتانەوەی سەروگوێلاکی، پورەکەشی بەشداریی کردنو بەچەپۆك کەوتە لێدانی، ئەوەندەیان لێدا لەهۆش کەوت، ئینجا دایکی چوو سەتڵێك قوڕی هێنا، هەرسێکیان پێکەوە ناودەمیان پڕکرد لەقوڕ، هەناسەی لێ بڕا، دوای چەند دەقیقەیەك ڕەنگی بەیەکجاری هەڵبزرکا.. ئینجا پێکەوە لەسەر کۆنکرێتی حەوشەکە درێژیان کرد.. دوای ئەوەی دوو سەتڵ ئاوی ساردیان پیاکردو نەبزوا، دڵنیابوون کەڕۆحی تیانەماوەو مردووە..

وەك ئەوەی مەرامیان هاتبێتە دی ماوەیەك پشوویان داو تەماشای یەکتریان دەکرد.. بردیانە ژوورەوەو لەپشتی کەوانتەرێك دانرا، تابەیانی لەوێ بوو.. دواتر نەنکی بەدادگای وت (بۆنی نەبوو.. بەڵام مێروولە تێی ئالابوون..!)... ئەو شەوە بەستەزمانە بێئەوەی کەسێك ئاگاداری بێت لەوێ

بوو. کەسوکارە دڵسۆزەکەی بۆ سبەینێ کەوتنە مشوری شاردنەوەی، جەبار عەرەبانەیەکی دەستی بە(٥) دینار بەکرێ گرت، دوای ئەوەی لەقەبرستانەکەی زەڕایەن گۆڕێکی بۆ هەڵکەند، لەگەڵ خوشکەکانی خستیانە سەر عەرەبانەکەو بردیان‌و خستیانە گۆڕەکەیەوە.

ڕۆحیانەتی بێگەردی ئەو شۆخە زوڵم لێکراوە پەردەی لەسەر نهێنی ئەوان هەڵماڵی‌و هەموویان گیران.. لەلێکۆڵینەوەی پۆلیسدا پێیان وتن: چۆن ئەوەندە دڕندە بوون، چۆن ترسی خواتان نەبوو.. دەبێ هەمووتان سزاکەی بدەن.. دەبێ ئێوە ببنە پەندی زەمانە)... هەر هەموو گیران، دایك‌و پورو خاڵ‌و باپیرو نەنکی (شۆخە) لەبەندیخانەدا بوون تارۆژی دادگایی کردن.

## دادگایی کردنی ئەوانەی پێکەوە منداڵێکیان کوشت!

ڕۆژی ٢٠٠٢/٥/١٩ دادگای جنایاتی سلێمانی لەتاوانبارەکانی پرسییەوە، دادگا بڕیاری دا:

-سەبیحەو جەبار لەسێدارە بدرێن.

-نەزیرە بەهەمیشەیی زیندانی بکرێت.

-باپیرو نەنکی شۆخە ئازادبکرێن.

کاتێ ئەم حوکمانە ڕەوانەی دادگای پیاچوونەوە کرا، دوای دوو مانگ‌و نۆ ڕۆژ بەپێی بۆچوونی دادگا کوشتنی (شۆخە) بەپلانی لەوەوبەر نەبووەو لەو ساتەدا ڕوویداوە، هەر بۆیە بڕیاریدا:

١-کەمکردنەوەی سزای (جەبارو سەبیحە) لەلەسێدارەدانەوە بۆ زیندانی کردنی هەمیشەیی.

٢-کەمکردنەوەی سزای زیندانی کردنی هەمیشەیی نەزیرە بۆ ١٥ ساڵ زیندانی کردن.

٣-ئازادکردنی باپیرەو نەنکی شۆخە.

## شۆخە لەنێو هەمووواندا..

بەرلەوەی شۆخەی ١١ ساڵ بکوژرێ، بەخۆی و باڵای مام ناوەندی و قژی رەش و پێستی گەنم رەنگیەوە ئاواتەخواز بوو لەو دۆزەخە رزگاری بێ و بگاتەوە لای باوکە ماندووەکەی.. کەسێ نەبوو گوێی لێ بگرێ. تەنانەت برا چوار ساڵەکەشی لەغەمی ئەو نەدەگەیشت.

وا ساڵێك و مانگێك و حەڤدە رۆژی تەواوە جەستەی ماندووی ئارامی گرتووەو جارێکی تر ناکەوێتەوە ژێر چنگی رەشی دایکەکەی و بەر چەپۆکی پوورەکەی و جارێکی تر خاڵەکەی بەر شەق و زللەی ناداتەوە.. ئەوجەستەیەکی ئارام و گیانێکی ئارامە، بەڵام هەمیشە باوکە کلۆڵەکەی لەخەو رادەپەڕێ و بانگی دەکات. لەزیندانیشدا بەرۆکی دایك و خاڵەکەی بەرنادات و هەمیشە ئێخەیان دەگرێت و لێیان دەپرسێتەوە.. جار جارەش سەرێکی پورەکەی دەدات و بەگلەییەوە پێی دەڵێت (خۆ من هانام بۆ تۆ دەهانی.. کەچی تۆش هەر وەکو ئەوان بوویت).

ئەوان تارماییەك لەبەرچاویاندایە کەناوی شۆخەیەو رەنگ و سیمای شۆخەی پێوە دیارە، گەر بۆ چەند چرکەیەك ئەو تارماییە دیارنەمێنێ، ئەوا دواتر دێتەوە بەرچاویان و لێیان دوورناکەوێتەوە.

ئەوان کەکوشتیان بێباك بوون، بەڵام ئێستا هەمیشە ترسی خوا تۆقاندوونی..

(تایەر) هەرچەندە کوڕی لادێ بوو، ئەوەی گوندێ بوو ئاوەدان و پڕ بەرهەم، بەڵام لەگەڵ تەخت کردنی گوندە کەیداو سووتانی ڕەزو دارەکانی، ئەمیش کەسێکی تەمەڵ و بێ کاری لێ دەرچوو بوو، بەناو کاسب بوو، بەڵام بەسکێ تێرو بەهەزار برسی، چی ڕووناکییە لەسیمای تایەردا نەمابوو، نامۆ بوو بەژیانی ئۆردوگاو لەگەڵیا ئاشنا نەدەبوو، ڕێکەوت چرایەك لەدەروونی کەیل و تاریکیا هەڵگیرسا، تۆوی هیوایەك لەدڵی غەمباریا سەوز بوو ناسینی (بەدیعە)ی هاوسێ و شۆخە کچی گەڕەك هێزو گوڕێکی چاوەڕوان نەکراوی پێبەخشی، ڕۆژان هات و ڕۆژان ڕۆیشت، ڕوانین و سەرنج بوو، بە چرپەو سلاوو ڕاز درکاندن، گەڵێ ژووان و دیتن بوونە سەرەتای عەشقی ئەو دووانە، ئۆردوگا نزیکەکەی شار لەبەرچاوی تایەردا قەشەنگ و ڕازاوە خۆی دەنواند.. بەدیعە چی تر خۆی بۆ نەگیراو دەبێ ڕازی دڵدارییەکەی لای کەسێ بدرکێنێ، بۆ ئەو مەبەستەش لە(پەخشان)ی هاوڕێ و دەستە خوشکی کەسی باشتری شك نەبرد... ئەو دەیزانی پەخشان باڵندەیەکی دیکەی لە قەفەز نراوە، دەیزانی باب و کەسوکارەکەی حساب بۆ هەموو هاتنە دەرەوەیەکی دەکەن، بەڵام ماڵ بەماڵ و قاپی بەقاپییەوە بوون، دەیتوانی چ کاتێ بیەوێ بیبینێ و کەی مەبەستی بێ گرییەکانی بۆ بکاتەوە...

زۆربەی ئێواران، لەسەربانەوە بانگی دەکردو تەنیا ستارەی نزمی نێوان بانەکانیان لەنێواندا بوو.. کاتێ بەدیعە ڕازو نیازی خۆی بۆ هەڵڕشت، بینی (پەخشان)ی جوان ئاگری عەشقێکی بڵێسەدار لەدڵ و دەروونیا دەسوتێ و بەهیچ شتێ دانامرکێتەوە، پەخشانیش ئەڤینی ساڵەوەختەی خۆی و (ئومێد)ی باڵابەرزی دڵخوازی بۆ دەگێڕایەوە...

ئومێـد چـەند جـارێ ناردبوویـە خـوازبێنی پەخـشانەکەی، بـەڵام کەسـوکارەکەی رازی نـەبوون، دواجـار بـۆ خـۆی دێتـە مـاڵ و بـێ پـەردە داخوازییەکـەی چـەند بـارە دەکاتـەوە، بـاوکی پەخـشان دەمـار دەیگـرێ و دەشیڕێنێ:

-رۆڵە، گەر بەملیۆن دینـارو ئاڵتوونی هـەموو دنیـام بـۆ بێنـی ناتـدەمێ و سەری خۆت مەیەشێنە..!

ئەو بێ ئومێد نەدەبوو، دایکە پیرەکەی دەنێرێت و پێیان دەڵێ:

-قوربانتـان بم، کـچتان هەیـەو کـوڕم هەیـە، کوڕتـان هەیـەو کـچم هەیـە، مەردی خوابن باله دووسەرەوە ببین بەخزم..

باوك و برای پەخشان رازی نابن... ئەویش شەوانە روو لەئەستێرەکانی ئاسمـان دەکـات و لەگەڵیانـدا دەکەوێتـە پرسـیارو رازو گلـەیی...لەخۆیـشی دەپرسێ:

-داخۆ چەندی تر ئومێد چاوەڕوانم بێ، تۆ بڵێی وەرس نەبێ و دەستم لێ هەڵنـەگرێ؟! لـەولاوە بەدیعـەش، بـەگرفتی خـۆی و پەخـشانی هاوڕازییـەوە دەتلایـەوە، پەیوەنـدی بەدیعـەو تایـەر لـەئۆردوگادا زانـرا، بـەر لـەوەی بێتـە پێشێ و کەسوکار بێنێتـە داخـوازیی بەدیعـە، خزم و براکـانی بەدیعە کەوتنە چاو سوورکردنەوەو هەڕەشە کردن لێی، دواجار پێیان وت:

-گەر واز لەبەدیعە نەهێنیت ئەوا دەتکەینە پەنگی رۆژگار، نەگبـەت ئێمـە لەکوێ و تۆ لەکوێ...

دەیویست بەزمانی ناسك لەمەرامی بێ گەردی تێ بگەن و پێی دەوتن:

-چ تـاوانێکم کـردووە، رێـزی خۆتـان و کـچەکەتانم لایـە، بۆیـە دەمـەوێ لێتان نزیك ببمەوە، بۆ دڵداری حەرامە؟!

دواجار پێیان وت:

-تایەر، هۆش بهێنەرەوە بەرخۆت، ئێمە کچ بەغەیرە نادەین، جارێکی تر ئەمە دووپات کەیتەوە زمانت دەبڕین...

## پێک گەیشتنی دڵداران..

هەردوو کڵۆڵ بەدیعەو پەخشان بێ یەکتری نەدەژیان، ڕۆژ نەبوو پێك نەگەنو دواجار بەغەمباری دوعاخوازیی لەیەکتر نەکەن، بەهۆی ئەوانەوە هەردوو ناکام (تایەرو ئومێد) بوو بوونە هاوڕێو برا، لەدوو درەختی تەنیشت یەکی گوندی دەچوون کە ڕەگیان تێکەڵی یەکتر بووبێ، بەڵام دوو درەختی، ڕەنگ لەدەست چوو، بێ دیمەن..

شەوێك لەژوورە ساردەکەی تایەردا، ئەو کاتەی بارانی تشرین بست بەبستی خاکەکەی دەشتەوە، لەگەڵ بروسکەو هەورە گرمەدا، بڕیارێکی تایەر وەك بروسکە لەئومێدیدا، چاوەڕوانی بڕیاری وانەبوو، چونکە بەجێ هێنانی زۆر بەزەحمەت دەبینی...

چەند جارێ تر تایەر بڕیارەکەی دووبارە دەکردەوە، دواجار ئومێدیش قایل بوو، بەڵام ئومێد دەیپرسی:

-باشە تایەر گیان، لەو بڕوایەدایت پەخشانو بەدیعە ڕازی بن، پێت وایە هێندە ئێمەیان بوێت بەرەو ڕێگای هاتو نەهاتو نادیاری چارەنووس شوێنمان کەون...

بەهێمنی تایەر وەڵامی دەدایەوە:

-ئا، کاکە گیان ئا، بڕوات هەبێ ئێمەیان لەهەموو کەس خۆشتر دەوێ. ئەوان بۆ مەرگیش شوێنمان دەکەون نەخوازەڵڵا بۆ ژیانو بەدی هێنانی ئاواتی خۆیان...

ـروسكە بڕیارەكەی ئەمان كەیشتە جووتە دەستە خوشك، دوای چوار
ـێ بیر كردنەوە بڕیاریاندا رەدوویان كەونو بۆ كوێیان دەویّ شوێنیان
كەون. بەڵام بەو مەرجەی بەپێی شەرع مارەیان بڕنو تا ئەو كاتەش
ـەنجەیان بەر پەنجەی ئەمان نەكەوێت..

ناوەڕاستی تشرینی دووەمی ١٩٩١بوو، ئەوان ئۆردوگایان جێهێشتو
كەوتنەڕێ، هەواڵ بەهەموو لایەكدا بڵاوبووەوە، كەسوكاری هەردوو كچ
شێرزەو شێواو وبێ ئۆقرە بوون، بەتایبەت باوكەكانیان، باوكی بەدیعە
ـستێ لەماڵەكەی دوور نەدەكەوتەوە، پێی وابوو هەر كەسێ ببینێ
ـەفرەتی لێدەكات..

ئەوانیش لەپێنجوێنەوە گەیشتنە سەرسنوور، چوون بەو دیوداو
ـەسەقز گیرسانەوە، لەوێ چوونە لای مەلاو مارەیان بڕی، پەخشان ترس
ـەموچاوی داگیر كردبوو، بەدیعە لەو باشتر بوو، لەغەریبایەتیدا بەهەژاری
گوزرانەوە، تەمەنی پێك گەیشتنو ژنو مێردییان تەنیا (٤) مانگی بڕكرد،
سوژنی دەیان پرسیار دەچوو بەدڵو دەروونی پەخشانو بەدیعەدا،
پیاوەكانیش ژیانیان زەحمەتو مەحاڵ بوو، جوامێریو چالاكیی رۆژانو
شەوانی ئۆردوگاكەی جارانیان نەما، هەردوو لایان وابوو تاوانیان كردووە،
تاوانی گەورەو بێ وێنە.!

هەرچەندە خەڵكی ئەودیو رێزیان دەگرتنو لەترسو دڵەراوكێیان كەم
دەكردنەوە، بەڵام ئومێدو تایەر لەخۆ بەدەستەوە دان زیاتر چارەسەری
دیكەیان شك نەبرد... خۆیان گەیاندە پێنجوێن، بارەگای بەرەی كوردستانی
پێشوازی لێكردنو دوای ئەوەی خۆیانو كێشەكانیان ناسی، ناردیان دوو(
بووكەكەیان)هانیو بەنووسراوێك رەوانەی دادگای سلێمانییان كردن...

## سەرلەنوێ مارەکردن !

دوای ئەوەی دادوەری لێکۆڵینەوە لەبەسەرهاتی هەرچواریان تێگەیشت، رەوانەی دادگای کاروباری کەسیی کردن بۆ مارە برین بەشێوەیەکی رەسمی، پۆلیس بردنی بۆ دادگا، رۆژی ١٩٩٢/٣/١٧بوو، چەند رۆژێکی کەمی مابوو سروشت دەست کاتە گەردنی وەرزی نوێ، لەسەر کورسییە تەختە درێژەکەی بەردەم دادگادا بەدیعە بەچرپە لەپەخشانی پرسی:

–وا خوای گەورە فریامان کەوت و چیتر گرفتمان نامێنێ.. باشە گەر منداڵتان بوو چی ناو دەنێن؟

پەخشان ترسەکەی لەوەو بەری هەر مابوو، بە زەردەخەنەیەکی ساردەوە تەماشای بەدیعەی کردو هیچی نەوت..

بەدیعە دەیویست دڵی بداتەوە، هەر بۆیە لەسەر قسەکەی رۆیشت و وتی:

– ساوەڵڵا گەر من کورم بێت ناوی دەنێم نەورۆز، گەر کچیش بوو ئەوا ناوی دەنێم بەهار...

دەنگی زوڵاڵی کابرای بەردەرکی دادگا رایچڵەکاندن، دووجار لەسەر یەک بانگی کرد:

–تایەرو بەدیعە، ئومێدو پەخشان...

پۆلیسەکە پێشیان کەوت و ئەمانیش لەدوایدا چوونە هۆڵەکە، دوای چەند پرسیارێك، دادوەر بڕیاریدا هەریەکە لەسەر(٢٠)مسقاڵ ئاڵتوون مارە بکرێن... پەخشان و بەدیعە بزە گرتنی و هاتنە دەر.. لەقەربالغی دادگا خۆیان قوتار کردو رووەو قاڵدرمەکان هەنگاویان نا، بەڵام...

## دیمەنێکی چاوەڕوان نەکراو...

سەعات ۱۲,۳۰ی نیوەڕۆ بوو، هەر چواریان‌و دوو پۆلیسەکە گەیشتنە سەر دەرگای دەرەوە، پەڕینەوە شەقامەکەی ئەوبەر، نزیک بوونەوەی چەند کەسێک لێیان هەر چواریانی شپرزە کرد، چەند چەکدارێک میلی کلاشیکۆفیان هێنایەوە، تایەرو ئومێد لەترساندا خۆیان کوتایە یەکێک لەدوکانەکانی سەر شەقامەکە، بەدیعەو پەخشان ویستیان خۆیان ون بکەن، بەلام سوودی نەبوو، بڕیاری مەرگیانەو چەکدارەکان بێ رەحمانە جێبەجێی دەکەن. فیشەکێک‌و دووان‌و سیان.. هاوارو زریکەو راکردنی خەڵکی، شوێن کەوتنی تەقەکەرێک‌و دەستگیر کردنی لەلایەن پۆلیسەکانەوە، دواجار راوەستانی ئوتومبێل‌و سوار کردنی پێکراوەکان بەجەستەی خوێناوییەوە روەو نەخۆشخانەی فریاگوزاری...

## کێ کوژراو کێ بەرکەوت؟

لەنەخۆشخانە، بەدیعەی(۱۸) ساڵ لەسەر تەختی پشکنین بەمردوویی چاوەکانی لێک نابوو، بەدیعە پێنج فیشەک بەر سەرو سک‌و سنگی کەوتبوو، وا پێدەچێ هەر لەشوێنی رووداوەکەدا گیانی لەدەست دابێ‌و قەدەر نەیویستووە وەرزی (بەهار) ببینێت، پەخشانی(۱۷) ساڵیش چەند فیشەکێک بەر سنگ‌و سک‌و پشتی کەوتووەو دەست بەجێ دەبرێتە هۆڵی نەشتەرگەری‌و بە نەشتەرگەرییەکی زەحمەت بەژیان شاد دەبێتەوە، یەکێکی دیکەیش کە رێکەوت بەرکەوتووە رێبوارێ بووە بەیەک فیشەک شانی پێکراوە...! ئەم رێبوارە بەچاوی خۆی دیویەتی کام چەکدارە تەقەی لێکردووەو دواتر کەدیویەتیەوە شکاتی لێکردووەو، ئەم رێبوارە دوای ماوەیەکی دوور درێژی تیمار کردنی ئینجا نەخۆشخانە جێدەهێڵێ..

## چەکدارە تەقەکەرەکان کێ بوون..؟

چەکدارەکان کە لەبەردەمی دادگای سلێمانیدا قەومانیان و گێران، هەر لەلێکۆڵینەوەی سەرەتاییدا دانیان بەتاوانەکەیاندا(هەریەکە بەجۆرە بەشدارییەك) بریتی بوون لە:

باوکی پەخشان(تەمەنی ٤٥ ساڵ)، برای پەخشان (تەمەنی ٢٠ ساڵ)، ئامۆزای بەدیعە(تەمەن ٣٦ ساڵ)، ئامۆزایەکی تری بەدیعە(تەمەن ٣٠ ساڵ)، دواتریش باوکە (٥٣) ساڵ تەمەنەکەی بەدیعەش دەگیرێت و لەگەڵیاندا دەخرێتە ژووری تاریکی بەندیخانەوە، بەلآم ئەمیان نکوڵی دەکات لەبەشداری کردنی لەو تاوانەدا، هەرچەندە چوارەکەی دیکە شایەت دەبن بەسەریەوەو بەدادگا دەڵێن (ئێمە هەر پێنجمان لەپێناوی کرینەوەی ناوبانگ و شەرەفماندا ئەو بریارەمان دا، بیستمان کەگیراون و ئەو رۆژە دادگا بۆ مارە کردنیان بەشێوەیەکی شەرعی، ئەوە بوو بەخۆمان و تفەنگمانەوە هاتین و ئەو کارەمان کرد...)

## رۆژی دادگایی کردن...

١٩٩٢/١٢/١٣ دادگای جنایاتی سلێمانی بەم شێوەیە حوکمی بەسەر هەر (٥) گومان لێکراوەکەدا دا:

١- باوکی بەدیعە، لەهیچ یەك لەقۆناغەکانی لێکۆڵینەوەو دادگایی کردندا دانی نەناوە بە بەشداری کردنی لەتاوانەکەدا، هەرچەندە چوارەکەی تر دەڵێن لەگەڵماندا بووە، بەلآم شایەتی گومان لێ کراو بەرامبەر گومان لێکراوێکی دیکە بەهای یاسایی نییە، هەر بۆیە دەست بەجێ ئازاد دەکرێت.

٢- بەرامبەر بەکوشتنی بەدیعە، هەر چوار تاوانبار یەکی بە(٢)ساڵ زیندانی کردن حوکم دەدرێن.

٣-بەرامبەر بەزامدار کردنی پەخشان، هەر چوار تاوانبار یەکی بە ٦ مانگ زیندانی دەکرێن.

٤- بەرامبەر بەزامدار کردنی ڕێبوارەکە، ئامۆزاکەی بەدیعە(١) ساڵ زیندانی دەکرێ...

## دادگای تەمیز بەبڕیارەکەی دادگای سلێمانی قایل نابێت...

پاش ئەوەی دەعواکە دەنێردرێ بۆ پایتەختی هەرێم بۆ ڕەزامەندی وەرگرتنی دادگای تەمیزی کوردستان، دادگای ناوبراو دوای ورد بوونەوە لەچۆنێتی تاوانەکەو بڕیاری دادگای سلێمانی، لەچەند بڕیارێکی دادگا رازی نابێت و داوای سەرلەنوێ دادگایی کردنەوەیان دەکات، بەڵام دادگای سلێمانی بڕوای بە حوکمەکەی هەیەو سوور دەبێ لەسەر بڕیارەکەی، هەر بۆیە دواجار دادگای تەمیز ڕۆژی ١٩٩٤/٢/٢٦ بەپێی ئەو دەسەڵاتە یاساییەی هەیەتی بڕیار دەدات:

١- هەر چوار تاوانبار بەرامبەر کوشتنی (بەدیعە)حوکمەکەیان لە(٢) ساڵەوە دەکرێت بە(٣) ساڵ.

٢- هەر چوار تاوانبار بەرامبەر بەزامدارکردنی (پەخشان) حوکمەکەیان لە(٦) مانگەوە دەکرێت بە(١) ساڵ.

٣- هەر چوار تاوانبار بەرامبەر بەزامدار کردنی (ڕێبوارەکە) یەکی بە(٢)ساڵ حوکم دەدرێن.

واتە هەریەکەیان بە(٦) ساڵ زیندانی کردن حوکم دەدرێن.

## لەکۆتاییدا...

-وا دووساڵو هەشت مانگە کەسوکارەکەی بەدیعەو پەخشان (هەر چوار تاوانبار) لەکونجی زینداندانو زۆری تریشی تیادەمێننەوە، ئاخۆ پەشیمان نین لەو کارەی لەبەردەم دادگایەکی شکۆداردا کردیان، یان هەر چۆن سوور بوون لەسەرڕێك نەگەیشتنی دڵخوازەکان، ئاواش سووربن لەسەر(خاوێنی)ی تاوانەکەیان؟!

-ئاخۆ پەخشان کام یەك لەبیرەوەرییەکانی لەگەڵیا دەژین، ژوانی ئۆردوگا،یان بووکێنییەکەی سەقزی، یان دوا هەناسەی بەدیعەی دەستە خوشکی، یان هەڵاتنی (ئومێدەکەی) لەو کاتەی تفەنگەکان لوولەیان تێکرد!؟

-ئاخۆ ڕێبوارەکە چی بە پاڵەوانەکانی ڕووداوەکە بڵێ، ئەوانەی نەیدەناسینو ڕۆژی روناکیان لەبەرچاو تاریك کرد؟!

-یان، ئاخۆ تایەر و ئومێد لەخۆیان دەپرسنەوەو خۆ بە بەرپرسیار دەزانن لەو خوێنە سوورەی ڕژا، یان ئەو کەسانە بەتاوانبار دەزانن کەدەرگای خوازبێنیان بەروویاندا دادەخستن؟!

-ئەی تۆ خوێنەری بەرێزم، ئاخۆ لەگەڵ مندا ئەو کۆمەڵە بە بەرپرسیار نازانیت کەژیان دەکاتە ژانو تائەمڕۆ عەشقو ئەڤین بەیاساغ دەزانێ، تائێستا ئافرەت بەبچووك دەبینێو لەزۆربەی کاتدا بڕیارەکانی پەیوەست بەژیانی خۆیشی لێ وەردەگرێ؟!!

-یاخود رای تۆ وایە ئەم کۆمەڵە رژێمێکی داگیرکەرو کۆنەپەرست شێواندیو زۆر بەهای پێ لەدەستدا،ئەی ئەو نەبوو گوندو گوڵو کانیو عەشقی کوێر کردەوەو ئۆردوگای زۆرەملێی داهێناو تا ئەمڕۆ (تایەر وئومێدو بەدیعەو پەخشان)ەکان لەگەڵی ڕانەهاتوونو نازانن تیایدا چۆن بەیەکتر شادبن...

## (١)

سـەر لەئێوارەیـەكی مـانگی تـشرینی دووەمـی ١٩٩٢، زۆرابـی بـە زۆر دەربەدەر كراو لەشاری كەركوكی باووباپیری، بەلەشی ماندوو وكۆڵێ غـەمی تاقانەكەیەوە گەڕایەوە ماڵ، ماڵ خانووە گەورەكەی جارانی نەبوو، بـەڵكو هۆدەیـەكی كرێـی خانـە خـوێی خۆیبـوو، كـەدوو ساڵی رەبـەق بـوو تیایـدا دەژیا.. زۆراب بەدرێژایی ئەو رۆژە مێشكی لای دلێری تاقانە جگەر گۆشەی بـــوو، كەنەخۆشـــییەكی كتوپڕ،ســـی رۆژ بـــوو لـــەماڵ خـــستبووی و لەقوتابخانەكـەی دابڕی بوو، زۆراب دلێـری نابەسـنگەوەو تێـر ماچـی كـرد، كـاتێ دایكـی دلێـر چـای بـۆتێ دەكـردن سـەعات بـەرەو ٨ی شـەو دەچـوو، منداڵەكـە چاوەگەشـەكانی بـڕی بـووە بـاوكی، ئالـەو كاتـەدا(تەقینەوەیـەك) هێنـدەی تـر دلێـری وڕكـردو مـاتو بێـدەنگ راكشا، دایـك پیاڵـەی لەدەسـت كـەوتو دوای پەیـدابوونی دەنگە دەنگـی خـەڵكی، زۆراب چووە دەرو پـاش ماوەیـــەك گەڕایـــەوەو وتـــی: دایكـــی دلێـــر، لـــەپاڵ دیـــواری تەنقیحەكـــەی بەرامبەرمان TNT تەقێندراوەتەوە... كەسەرنجیان دایـە دلێـر تـەواو مـاتو پەرێشان بوو، زۆراب كردیە باوەشی وتی:ئەم بەزمە هێندەی تـر كـاری كـردە سەر دلێر زۆر ترساوە... ژنەكەشی وتـی: خـوا بەهـەقی خـۆی تۆڵـە لـەو كـافر باوكانە بستێنێ، رەبی هەرچی كاری وا دەكات پەنجەكانی هەڵوەرێ..

## (٢)

بـۆ دووسـاڵ دەچـوو مریـەم خـانی جـەرگ سـوتاو لەگـەڵ ژنـی كـوڕە شـەهیدەكەیدا دەژیـا، بووكەكـەی تـەنیا یـەك سـاڵی ژیـانی ژنو مێردایـەتی بینـی، حەسـەنی كـوڕی لەراپەرینەكـەداو نزیـك ئەمنـە سـوورەكە شـەهید

کرببوو. مریەم نەیدەهێشت بووکە دڵ شکاوەکەی بۆ کاروباری ماڵ بچێتە
ـ‌ـزار. هەموو جارێ بەبەرگی رەشەوە جزدانە بچکۆلەکەی دەنایە مستی و
ـەجادەی مزگەوتی گەورەدا رووەو ناوجەرگەی بازاڕ دادەگەڕا، ئەو رۆژە
کەرۆژی ١٩٩٢/١١/٢٥بوو کات گەیشتە ٩ی بەیانی و مریەم بەئاپوورەی
خەڵکی‌دا رەت دەبوو. لەخوار مزگەوتی گەورەوە لەئاستی دوکانەکانی
بەرامبەر دەبۆکە (تەقینەوەیەك) ئەو ناوەی بەجارێ لەراندەوە. مریەم
بەلەشی خوێناوییەوە کەوت و لەتەنیشتییەوە پۆلیس جزدان و
زەمبیلەکەیان هەڵگرتەوەو بەبێ هۆشی بەرەو نەخۆشخانە برا، بەدوای ئەودا
دوکاندارێك و چوار رێبواری دیکەشیان گەیاندە نەخۆشخانەی فریاگوزاری،
مریەم برایە نەشتەرگەری و کاتێ شیرینی بووکی پێی زانی و گەیشتە لای
خەریك بوو بەنجەکەی خاو دەبووەوە، شیرین بەچاوی پڕلەفرمێسکەوە
دەیوت:

-دایە دایەگیان، دەچاو کەرەوە، گەر تۆم نەمێنی ئەوا جارێکی تر
حەسەن شەهید دەبێتەوە، دایە، دە وەڵامم بەرەوە دایە گیان..

## (٣)

پێنج رۆژ دوای تەقینەوەکەی خوار مزگەوتی گەورەی سلێمانی، لەیەکێك
لەئوتێلەکانی کەرکوکدا، بلە دۆمی چڵکاو خۆری رژێم و پیاوی رائیدێکی
ئیستیخبارات لەگەڵ سێ کەسی خەڵکی (تاسلوجە)دا تەگبیری دەکرد،
ئەوانیش بریتی بوون لە، حەمەتاڵ (تەمەن ٤٦ساڵ) و کۆنە هاوڕێی نێو
دائیرەی بلە دۆم لەسلێمانی، زەینەڵ عەلی(١٧ساڵ)، کەریم عەلی(١٦ساڵ)!
لەکۆتایی گفتوگۆیاندا بلە پارەی دا بەکەریم تا لەدوای گەڕانەوەیان RBG

بكـرن‌و شـوێنێكی دیـاری كـراو بتەقێننـەوە پێـی، هـەروەها دەمانـچەیەكی لامەی شۆڕشیدا بەهەمان ناوبراوو هەریەك لەزەینەڵ‌و حەمەتاڵ بڕێ پارەیان لێ وەرگرت،حەمـــەو زەینـــەڵ‌و كـــەریمی بـــرای لەگـــەڵ بلـــەدا دەچـــنەوە ئیستخبارات‌و لەوێ سواری ئوتومبێلی نەقیبێ دەكرێن‌و رووەو سەیتەرەكە دەكەونەڕێ، لەو ناوەدا دادەبەزن‌و سواری تاكسییەكی رێـی سلێمانی دەبن كەدوو نەفـەری تریشی تیـادا دەبـێ، نەقیبەكە پێشی تاكسیەكە دەكەوێ‌و تـادوا سـەیتەرەی رژێـم لـەنزیكی چەمـچەماڵ، بـەلایت‌و ئیشارەت نـاهێڵێ تاكسییەكە رابگیرێـت، ئـەو پـێچ بەلاندكرۆزەرەكـەی دەكاتـەوەو ئـەمانیش داخڵـــی ســـنوری هـــەرێمی ئـــازاد كـــراو دەبـــن‌و لەیەكـــەم ســـەیتەرەی پێشمەرگەدا(بەر لەچەمـچەماڵ) دوای پشكنینێكی ورد دەمانچەكە بەكەریم دەگـیرێ‌و دووپێناسـەش بەزەینـەڵ كەهیـچیان هـی خـۆی نـابن. یەكـەمیان پێناسـی پێـشمەرگایەتی خاڵۆزایـەكی، دووەمیـشیان پێناسـەیەكی ئـەحوال مـەدەنی بـەناوێكی دیكـەوە كەلـە كـەركوك بـۆی دەرهێنـراوە، لـەوێ دەبرێنـە فـــەوج، ســـەرەتا ئاشـــكرای ناكـــەن كـــەبرای یـــەكن‌و هـــەوڵی راكـــردن‌و دەربـازبوونیش دەدەن، بـــەلاَم بـــێ ســـوود دەبێـــت، دوای قسەكردنیـــشیان سەرەداوی تر دەست ئاسایش‌و دادگا دەكەوێ...

## (٤)

لەئەنجامی لێكۆڵینـەوەو دانپیانـانی هەرسـێ نـاوبراو لەبـەردەم ئەفسەرو دادوەری ئاسایش‌و پاشان لەدادگا ساغ دەبێتەوە كە:

-حەمەتاڵ بەهۆی هاوڕێیەتی کۆنی لەگەڵ بلە دۆمدا پەیوەندی دەکات ـە ئیستخباراتی شرقیە)ی کەرکوکەوەو لەوێ یەك دوو ئەفسەر دەناسێ، ـهۆی حەمەتاڵیشەوە زەینەڵ بلە دەناسێو بەهۆی ئەویشەوە رائیدێکی ـ. بەهۆی زەینەڵیشەوە کەریمی برای بەشداری کاری تاوانکارانە دەکات.

-رۆژێ لەماڵی بلەوە هەردوو ناو براو دەچنە لای رائیدەکە، ئەویش ـو ی ئەوەی دوو ئامێری ریکۆرد(مسجلة)و تەلەفونیان دەداتێ کە لەناویا چێنراوە بڕی (٥٠٠)دینار دەداتە هەریەکیان، دوای ئەوەی ـرمانیان پێدەکات کەدوای گەڕانەوەیان دەبێ لەدوو ئوتێلی دیاری کراو ـ نتەقێننەوە، سواری ئوتومبیلەکەی خۆیان دەکاتو بەرەو ڕێگای کفری ـدوا سەیتەرەی رژێم دەیانگەیەنێ، لەوێشەوە خۆیان دەچنە کفری، ئینجا کەلارو ئینجا بە(دەستو دیارییەکانیانەوە!)دەگەنەوە سلێمانی، لەوێ ـزەینەڵ هەردوو ئامێرەکە لەگەڵ خۆیدا دەباتە ماڵی خاڵیوماڵی پووری، حەمەتاڵیش دەگەڕێتەوە تاسلۆجە، زەینەڵ ئەو ئێوارەیە، بەخۆیو تەسجیلەکەوە لەماڵی خاڵی دەبێ، لەوێ بەنهێنی پاتری دەخاتە ناو تەسجیلەکەوەو دەڕواتە دەرو بەرەوو ئوتێلی..دەڕوات، لەو ناوە دەترسێ ئەو کارەبکات، دەپەڕێتەوە ئەوبەرو لەپشت دیواری کارگەی(تنقیح دیارییەکە دادەنێ، دوای نیوسەعات گوێی لەدەنگی تەقینەوەیەکی گەورە دەبێ.. شەو لەماڵی خاڵی دەنویو بۆ بەیانی دەگەڕێتەوە کەرکوكو لەگەڵ بلەدا دەچنەوە لای ئاغای رائد، کە بەکارەکە دەزانێ هەرچەند بەدڵی نابێ بڕی (٥٠٠٠)دیناری عیراقی دەداتێ.دوای ١٥رۆژ مانەوە لەوێ، حەمە تاڵ دەچێتە لایانو کە بەرائیدەکە دەگەن داوایان لێدەکات تەلەفۆنەکە (کەلەماڵی

پـووری زەینەڵـدا شـاردراوەتەوە) نزیـك بەمزگـەوتی گـەورە بتەقێنــەوە، یەکی ٥٠٠دیناریشیان دەداتیٚو ئەمانیش تەشریف دێننەوە.. شەو زەینەڵ" کەریمی بـرای لـەو مەسـەلەیە ئاگـادار دەکـاتو داوای هاوکـاریی لێـدەکات، ئـەمیش رازی دەبـیٚ، بـۆ بـەیانی زوو لەگـەڵ حەمەتاڵـدا یـەك دەگرنــەوەو لەئاودەسـتی مزگەوتەکــەدا پیـل دەخەنــە نــاو تەلەفۆنەکــەوەو پاشــان لەخوارترەوە دەچنە دوکانی(گەس)فرۆشێكو تەلەفۆنەکە کەلە عەللاگەیەکی رەشـدایە لـەکونجێکی دوکانەکـە دادەنـێنو دوای خـواردنی سـەرو لەفـە ئـەو ناوەجێدەهێڵن، دوای جیابوونەوەیان لەحەمەتاڵو کاتیٚ دەگەنە کانێسکان بەتەقینەوەیەك زەویی ژێرپێیان دەلەرزیٚ، هەردووسەیری یەکتر دەکەنو زۆر ناشیرین بەرووی یەکدا پێدەکەنن! بۆ رۆژی دوایی دەچنەوە کەرکوكو لـەویٚ رائـدی سەرچـاوەی تـاوان پـاش ئـەوەی لـەژمارەی بریـنـدارەکانو زەرەرو زیانەکانی ئەو ناوە ئاگادار دەکریٚ، یەکی بڕیٚ پارەی تریان دەداتیٚو ئینجا داوای کـاری سـێیەمیان لێـدەکات.. بـەلاٚم ئـەو نامەردانـە راناگـەن پیایـداو پیاوانی ئاسایش رووەو زیندان کێشیان دەکەن، دوای ئەوەی لەسەیتەرەی چەمچەماڵ دەگیرێن..

## (٥)

لەهەرسـێ رۆژی ٨/٢٤، ٨/ ١٢، ٩/ ٢٣ /٩/ ١٩٩٣، سـەرۆکایەتی دادگـای جینایەتی سلێمانی لەداوای ژمارە ٢٢٩/ج/١٩٩٣ کۆڵیـەوەو دادگـایی گومان لێکراو(حەمەتاڵ)ی کرد، هەربەتەنیا حەمەتاڵ،چونکە جووتە برا زەینەڵو کـەریم هـەردووکیان تەمـەنیان لـە (١٨) سـاڵ کـەمتر بـوو داواکـەیان جـودا

ێر بوەوە رەوانەی دادگای (احداث)کرابوو، لەدوا رۆژی دادگایی کردنی حەمەتاڵ دا دادگای بەرێز بڕیاریدا:

١-حوکم دانی تاوانبار حەمەتاڵ بەحوکمی هەمیشەیی(مؤبد).

٢-(رەحمە) کەیەکێك لەزامدارەکانی تەقینەوەی خوار مزگەوتی گەورەیە دەتوانێ لەدادگای مەدەنی دا داوای قەرەبووی خۆی بکات.

ئەوانەی ئەم دادگایی کردنەیان بینی، ئەوەندەی تر دادو یاسای کوردستانیان لەلاشکوداتر بوو، پاشەرۆژی گەشی گەلەکەیان بەباشی دەهاتە بەرچاو..

## (٦)

حەمەتاڵی میوانی ژووری تەنگو شێداری بەندیخانە، هەرچەندە دەیویست ویژدان لێبگەڕێو خۆ لەپرسیاری زیندانیەکانی دیکە بدزێتەوەو کەمێ خۆی ئاسوودە بکات، بەلاّم بێسوود بوو، دیمەنی کوڕە خوێندکارە زیتەڵەکەی بەرپەردەی چاوەکانی جێنەدەهێشت، دەنگە تیژەکەی لەگوێیدا دەزرنگایەوە کەهەموو جار(لەبەر)ئەو شیعرەی دەوتو دەوتەوە:

رەبی مووی لێبێ زمانی پەنجەکانی هەڵوەرێ
هەرکەسێ گوڵشەن بەدەردی کوڵخەنی دۆزەخ بەرێ

ئینجـــا ســـــەرنجی دەدایــــە دەســـــتەکانی، لەبەرچـــاوی زەردو لاواز هەڵدەگـــەڕان و بەمێـــشکی وڕەوە دەیـــدی یەکــــە یەکــــە (پەنجـــەکانی هەڵدەوەرێن)..!

## (٧)

زەینـەڵ و کـەریم لەوکاتـەوە دەسـتگیرکراون تائـەمڕۆ سـیمای منـداڵی و هەرزەکاریی بەڕوویانەوە نەماوەو لەپیاوی گەورە دەچن، پیاوی ناشرین..! هەموو جارێ بەیەکتردەڵێن:

-چیمان بەخۆمان کرد، خۆ ژیانی شوانی قەدپاڵەکانی لای تاسلوجەو بازیـان خۆشترین ژیـان بـوو بـۆ ئێمـە، خـۆ کرێکـاری کـردن دەیکردینـە لاوی بەحورمەت، چیمان بەخۆمان کرد؟!

زۆر جاری تریش بەیەکتر دەڵێن:

-خـوا بـەوە رەحمـی پێکـردین تەمـەنمان بـچوکە، دەنـا لـەبری(١٥)سـاڵ زیندانی، بیست و زیاترمان پێدەبڕا..

*هـەردوو پەشـیمان و خەجاڵـەتن. بـەڵام پەشـیمانی چ دادێکـی زینـدانی دەدات و کەی فریادرەسی مرۆڤی تاوانبار بووە؟؟!!

(شەهلا)ی تەمەن پانزە ساڵە بەتەنیا لەگەڵ دایکە بێوەژنەکەیدا دەژیا، دایکی شەهلا بەگەنجی لێی قەوما بوو، ئەمو خوشکێکی گەورەتری هەبوو بەناوی(مەهاباد)، مەهاباد لەماڵەمێردی خۆیدا دەژیا، دایکیان مەرامی سەرلەنوێ شووکردنەوەو وەدەست هێنانی گوزەرانێکی باشتری هەبوو، بۆیە دەیویست هەرچۆنێکە پاڵ بەشەهلاوە بنیٚو مێردێکی بۆ پەیدابکات، بۆ ئەو مەبەستەلە(فەرهاد)ی کوڕە مامی شەهلا کەسی باشتری شك نەبرد، لەگەڵ عەزیزی شووبرایدا کەوتە تەگبیرو هەردووکیان بە(زۆر) شەهلای تەمەن(١٣)ساڵیان لەفەرهاد مارەکرد. بەلاّم لەدادگادا نەء، چونکە پێنج ساڵی مابوو بۆ وادەی شووکردن، بەلکو لەدەرەوەی دادگا ئەو کارەیان ئەنجام داو تەنانەت بۆ رۆژی مارەکردن(مەهاباد)ی خوشکیان بردە لای مەلا...! ئەو رۆژەی شەهلا بەبووکی برایە ماڵی مامە عەزیزی تەمەنی تەنیا١٣ساڵو ٢مانگو ١٥رۆژ بوو!! بەلاّم مێردەکەی ١٨ساڵی تەواو کردبوو، مارەیی بووکێ بریتی بوو لە١٥ مسقاڵ ئاڵتوون پێشەکیو ١٩مسقاڵ پاشەکی...

## داوای جیابوونەوە...!

شەهلا دوای هەشت مانگو نیو بەرەسمی داوای جیابوونەوەی لەمێردەکەی کرد، پاش ئەوەی لەماڵە مێرد هەڵهاتو، لەوەو بەریش زۆرکەم لەو ماڵەدا ژیانی بردبووە سەر کە بەدۆزەخی دەبینی، بەلاّم ئەمجارەیان دوا هەلاّتنی بوو، بۆ ئەو مەبەستە هاتە دادگاو پارێزەری بۆ کێشەکەی گرتو

لەرۆژی ١٥/٣/١٩٩٣ تاوەکو ٥/٢/١٩٩٤ پانزە جار دادگای ئەحوالی شەخسی سلێمانی لەو کێشەیەی کۆڵیەوەو دواجار بەئامادەبوونی پارێزەرو لێکۆڵەری کۆمەڵایەتی و مێردەکەی دادوەری بەڕێز کێشەکەی کە بەلاداخستو بەیەکجاری شەهلا لەفەرهاد جیابووەوە.

دادگا پشتی بەست بەداواکاری ژنەو بەوسەرپێچییە کەکچێك لەو تەمەنە بچووکەدا بەشێوەی نایاسایی بدرێ بەشوو.

ئەوانە بەسەرهاتی دیارو رووکەشی ژیانو ئاکامی (شەهلا) بوون کەلە دادگادا بڕیاری لەسەردرا، با ئێستا پێکەوە بڕوانینە لاپەڕەکانی لێکۆڵەری کۆمەڵایەتی دادگا کەچەند جارێك ژنو مێردەکەی دیوەو زیرەکانە لەوتەو باری دەروونی ئەوانەوە سەرنجی خۆی تۆمار کردووە..

## شەهلا...نهێنییەکانی ژیانی خۆی دەدرکێنێت...!

فەرهاد کەبەبێ کاری لەشارۆچکەیەکی نزیك سلێمانی ژیاوە، نەخوێندەوار بووەوحاڵەتی تەندروستیو دەروونی خراپ بووە، لەچەند شەوێك زیاتر لەگەڵ ژنەکەیدا نەخەوتووەو شەهلا سکی پڕنەبووە، بەڵام شەهلا حاڵەتی تەندروستیو دەروونی باش بووە، ئەو ماوەیەی جووتە ئامۆزا پێکەوە بوون بەختەوەر نەبوونو ئێستاش شەهلا هەر منداڵەو لەو ژیانەدا ترساوەو بەرروونی ترسەکەی بەسیمایەوە دیارە، ئەو ماوەیە شەهلاو مێردەکەی لەژوورێکی ماڵی مامە عەزیزی دا ژیاون...

شەهلا وتویەتی:

–لەیەکەم شەوی بووکێنییەوە من لەگەڵ فەرهاددا ناکۆك بووم، چونکە بەزۆر دابوویانمێ، هەروەها ئەو کورە نەخۆش و شێت بوو، خۆمن لەزووەوە دەمزانی حاڵی ئەو بەو شێوەیەیە، هەر بۆیە رقم لێی دەبۆوەو کەبەزۆر دایانم بەویش هەر رقم لێی بوو، دەمزانی هەرگیز بۆ ئەوە دەست نادات کەمێردی من بێ و من لەسێبەری ژیانی ئەودا بحەسێمەوە، خوا دایکم بگرێ تووشی ئەو دەردەسەریەی کردم، یەکەم شەوی شووکردنم بینیم فەرهاد هەر فەرهادەکەی جارانەو نەگۆڕاوە، هەستم نەکرد لەگەڵ مرۆڤێکی تەواودام، چەند شەوێکی کەم لەژوورەکەی مندابوو، دەبینم دیارنەدەماو کە سۆراغیم دەکرد سەیر دەکەم لە(گەوڕ)ی ماڵەکەدایە لەگەڵ ئاژەڵەکاندا! ئیتر بۆ خۆی شەوی لەناو حەیوانەکاندا دەبردە سەرو منیش بەتەنیا بۆ چارەنووسی رەشی خۆم دەگریام...

ویستم مامەکەم چاکی بکات، کورەکەی راست بکاتەوەو وای لێ بکات وەك پیاوو مرۆڤ بژی، بەڵام بێ سوود بوو، ئەو زۆر دڵڕەقانەو نەفامانە وەڵامی دەدامەوەو بگرە ئازاریشی دەدام، خەزوورەکەم ژنی نەبوو، چەند ساڵێ بوو وەفاتی کرد بوو، رۆژێکیان شتێکم لێدی هەر بەجارێ شێت بووم، شتێکی ئەوتۆ بوو کە هەرگیز بۆگێڕانەوەناشێ...( شەهلا بەباسکردنی خەزوورەکەی بەجارێ سوور هەڵگەڕاو گەر تواناو ژێری لێکۆڵەرەوەی ناوبراو نەبووایە ئەوا وشەکانی لەگەروویدا دەخنکان و هیچی بۆ نەدەوترا... لەدانیشتنێکی دیکەی دوو قۆڵیدا شەهلا ئەو نهێنییەشی درکاندووەو باسی کارەکەی خەزووریشی کردووە، نەك کار بەڵکو تاوانەکەی...)

شەهلا بەڕەنگی پەرپوەوە دەگێڕێتەوە دەڵێت:

-خەزوورەکەم کەمامی خۆم بوو زۆر خراپ بوو لەگەڵمدا، لەبری ئەوەی بەزەیی بەمنی برازاو بووکیدا بێتەوە قسەی ناشیرینی پێ دەوتم، مەبەستی نەبوو کوڕەکەی لەگەوڕ بینێتە دەرێ و لەحەیوانەکانی دووربخاتەوە، بەکارێك دەڕندەیی و نامرۆڤی خۆی سەلماندو لەبەرچاوم بووە سەگ.. رۆژێکیان لێم نزیك بووەوەو پەلاماری دام و داوای کارێکی کرد کە بەجارێ کوێرو کاس بووم، بەزۆر کارەکەی ئەنجامداو پەلاماری ناموسمی دا... ئەو دڕندەیە چەند جارێکی تر کاری خۆی لەگەڵما کرد، منیش لەبەر دەستیا دەبوومە جەستەیەکی بێگیان...!!

ئیتر خۆمم دەدی بوومەتە ئاژەڵێکی بێ دەسەلاتو لەگەڵ دوو ئاژەڵدا دەژیم، یەکێ گێل و نەفام، یەکێ دڕندەو بەدرەفتار... چارم ناچار بوو ماڵەکاول بووەکەیان بۆ بەجێبهێڵم و خۆبگەیەنمە خوشکەکەم و دواجار لەدادگادا داوای ژیان بکەم، ژیانی جیابوونەوە لەو دوو نامرۆڤە.

## ئەی فەرهاد چی وتوە؟

فەرهادیش قسەی بۆ لێکۆڵەری کۆمەڵایەتی کردووەو پاساوی هەڵەکان دەرهەق بەژنەکەی ئاوا دێنێتەوە:

-ئێمە گرفتی گەورە لەنێوانماندا نییە، ئەوە نەبێ شەهلا خان داوای جیابوونەوە دەکات! ئەو وەك ژنێ ئەرکەکانی خۆی نازانێت، ئەو بەبێ پرس ماڵەکەی جێهێشتووە، من کەهێنام پارەیەکی زۆرم خەرج کردووە، چۆن هەروا بەئاسانی دەستی لێ هەڵدەگرم...

بەڵام دادگاو بڕیاری زۆر لەوە عادیلانەترە کەجارێکی تر مرۆڤێکی وا ڕەوانەی ژیانی نێو گەوڕو گێڵو بەدرەفتاری بکات، بەجیابوونە لاپەڕەکانی ڕۆژگاری ڕەشو شەوگاری ڕەشتری ئافرەتێکی ئەم کۆمەڵە دادرایەوە کەوەك زۆر ئافرەتی ترمان دەستیان نییە لەهەڵبژاردنو شووکردنو ژیانو مەرگی خۆیاندا.

وا بۆ هەشت مانگ دەچیٚو (جەزا) لەزینداندایە.. ئەو کاتانەی دەنگی دادوەر لەگوێیدا دەزرنگێتەوە" دەخوازیٚ نەك هەر ژووری زیندانەکەی، بەڵکو شارو نیشتمانەکەشی جیٚ بهێڵیٚو دوور لەکەس وکارو هاوڕێیان، دوور لە(لیمۆ)ی پوورزای بەدبەختو چارەڕەشی، دوور لەهەموو خەڵکی شارۆچکەکەی بژی..!

نیوەڕۆ بوو، چاوانی دادوەر بەوێنەی تیشکێکی بەهێز روو لەچاوە شەرمەزارەکانی جەزا بوون، بەدەنگی بەرز پێی ووت:

_ تاوانبار، تۆ پانزە سالٚ دەچیتە زیندانەوە، دەبیٚ مافی خۆت وەربگریتو جەزای تاوانە دڕندانەکەت بدەیت هەروەها دەبیٚ بڕی بیست هەزار دینار بدەیتە لیمۆ...

ئەو رۆژە، دوای ئەو چەند رستەیەی سەرۆکی دادگا چیدی وترا ئەمی وڕوکاس گوێی لیٚ نەبوو، تەنانەت ئەو کاتەی لەنهۆمی سێیەمی دادگای سلێمانییەوە بەبالٚ گیراوی بەقاڵدرمەکاندا هێنرایە خوار زەینی نەدەکرد کیٚ دەبینیٚو کیٚ دەیبینیٚ !

## چاوە پڕ فرمێسکەکانی لیمۆ

دوو سالٚ زیاترە ئەو رۆژە بەهارییە شوومە تێپەڕیوە کەلیمۆی درەختی کلۆڵی، لیمۆی تەمەن شانزە سالٚ بەتاوانی بەدی پوورزاکەی خۆی لەکەدار کراوەو وەك کۆترێکی گەردن سپیو بیٚ گوناه چەقۆی بیٚ بەزەییو بیٚ ویژدانی هێنراوە بەملی چارەنووسیدا..!

لیمۆی هەمیشە چاو بەفرمێسك، لیمۆی دوور لەهاوەڵو دەستە خوشکەکانی قوتابخانە ناوەندییەکەی، دووسالٚ زیاترە چی دەبینیٚو باسی هەر شتێکی بۆ دەکریٚ ئەو لە بەرچاوانی دووریان دەخاتەوەو گوێی

لەئاستیان دادەخات، هەردەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ساتە نەگریسەی لەنزیک قوتابخانە دیارەکەی ناوچەی پشدەرەوە" بەزۆر سواری ئوتومبێل کراو بێ ئەوەی بزانێت (پورزا) هارەکەی بۆ کوێی دەبات ! بەڕەنگی شێواو و هەناسەی سوارەوە دوور خرایەوەو بەو دەردە برا !!

بەڵێ، لیمۆی بەدبەخت هەمیشە ئەو دیمەنە دەبینێ کەبەبێ ویستی خۆی لەلایەن (جەزا)ەوە کرا بەژن !...

## چی لە لیمۆ کرا ؟!

لیمۆ خۆی وتی:

_ ئەو رۆژەی دەوامەمان تەواو بوو وەك زۆربەی رۆژانی تر لەگەڵ بێخاڵ و نەرمین دەرگای مەکتەبمان جێهێشت و کەوتینە ڕێ...بەو خوایە نازانم باسی چیمان دەکرد.. تەنیا ئەوەم لەبیرە ئوتومبێلێکی بەرازیلی لەلامانەوە وەستاو دوو چەکدار لێی دابەزین و بەخۆم و جانتاکەی شانمەوە بەزۆر، بەڵێ هەر بەزۆر سەریان خستم، ئیتر ئەوە بوو لەشار دوورکەوتنەوەو بەرێگایەکدا ئوتومبێلەکە رۆیشت، وابزانم ڕێی هێن بوو..نەبەخوا نازانم کوێ بوو! من بەرچاوم تاریك بوو، خوا خوام بوو هاوڕێکانم بەدوامەوە بووبن، نە٦.. دەموت ئەوان خەبەریان بەکەسوکارم داوەو لەم چارە رەشانە رزگارم دەبێ...

بەڵام هیچ..هیچ... سوودی نەبوو !! ئوتومبێلەکە وەستاو شۆفێرەکەی و نەفەرەکەی تر کەلەپێشەوە بوو دابەزین و دوور کەوتنەوە... جەزا لەنێو بەرازیلییەکەدا پەلاماری دام و ئەوەی ویستی کردی، من هەر دەگریام و ئەو ترسی خوای لەدڵدا نەبوو، بەڵێ بەزۆر وای لێ کردم و کردمیە ژن.. من هیچ پەیوەندییەکم لەگەڵ ئەودا نەبووەو درۆش دەکات کەوتویەتی گوایە

داخوازیی کردووم، ئێستاش هەر ڕقم لێیەتی و شووی پێ ناکەم، چۆنی پێ دەکەم ! من هەرگیز چارەی ئەوم ناوێ تا دەمرم ڕقم لێ دەبێتەوە..

لەو ساتەوەی کۆمیتە گرتوویانە تا ئەمڕۆ من داوای سزادانی دەکەم، دە سزای بدەن، دە هەقی منی لێ بستێنن.. تو ئەو خوایە ئێوە لەنەرمین و بێخاڵ بپرسن، ئەوان باشم دەناسن، بزانن قسەکانم ڕاستن یان نا...

ئەم دەگریاو هەردوو هاوڕێ خەمخۆرەکەی بەدادگای ڕێزداریان وت:

_ بەڵێ وایە، هاوڕێ خۆشەویستەکەی ئێمە ڕاست دەکات، هاوڕێکەی ئێمە بەناموسترین کچە، گوناهترین کچیشە لەدنیادا...

گەر شەرم بیهێشتایە، زۆری تریشیان لەسەر هاوڕێ خاوێنەکەیان دەوت...

## ئەی (جەزا)ی خزمی دەڵێ چی؟!

بۆ وای کرد؟. جەزا چۆن توانی ئەو تاوانە بکات؟! چۆن پیاو لەگەڵ کەسی خۆیدا کاری نامەردانە دەکات؟!! ئەی چۆن لە ئەنجامی کارەکەی نەدەترسا؟!

جەزا بەقسەی خۆی وتی:

_ پەیوەندی دڵداری و خۆشەویستی لەنێوان من لیمۆدا هەبوو...هەمیشە دەچوومەماڵیان، کەسوکاریشی بەپەیوەندیی ئێمەیان دەزانی.. کاتێ داخوازیم کرد نەیاندامێ، باوکی وتی(کچی من منداڵەو خوێندکاری سێی ناوەندییەو دەخوێنێ)... جا ئیتر چی بکەم ؟ حەزم لێی بوو، ڕۆژێکیان هەردووکمان بەتەنیا لەماڵی پوورم بووین، بەڕەزامەندی خۆی رامان بواردوو کردمە ژن!.. دوای سێ ڕۆژ خۆی داوای لێم کرد لەگەڵ خۆم بیبەم و بۆی دەرچین، لەماڵی سەرۆک عەشیرەتێکی ناوچەکەدا بمێنینەوە تاقسەی تیا

دەکریٚ و کەسوکاری رازی دەکەن بەوەی مارەی بکەم، ئیتر ئەوە بوو تاکسیم بەکریٚ گرت و لەگەڵ خزمێکی خۆمدا لەنزیك مەکتەبەکەیەوە هەڵمان گرت و بردم..بەلاّم ئەوە بوو بۆ رۆژی دواتر گیرام و...من لەو کاتەوە تا ئەمرۆ رازی بووم و رازیم بمدەنیٚ و مارەی بکەم و بەپێی شەرع پێکەوە بژین.

## چی تر وترا؟!

دادگا بڕوای بەقسەکانی جەزای پۆلیسی تەمەن ٢٠ساڵ نەکرد، هەرچەندە پارێزەرەکەی وتویەتی(جەزا بۆیە ئەم کارەی کردووە تا کچەکەی بدەنیٚ)... بەلاّم باوکە پیرەکەی لیمۆ سوور بووە لەسەر قسەی خۆی و سوێندی خواردووە کە ئەو خزمە ناموبارەکەی رۆژیٚ لەرۆژان داوای لیمۆی نەکردووە..هەرگیز داوای نەکردووە..

هاوڕێکانی لیمۆش هەروایان وتووە، دەنا پێیان دەزانی، خۆ عوسمانی شۆفێری ئوتومبێلەکەش هەر کەلەقەلاّدزەوە برابووە لای دادوەری رانیە بۆ ئیفادە، وتبووی:

- بەڵیٚ بەزۆر سواری ئوتومبێلەکەی منی کرد، لیمۆ دەیزریکاند و سوودی نەبوو، ئەو وتی خزمی خۆمە، لەرێگای(دێڵو) داوای کرد من و کوڕەکەی تر دابەزین و ئوتومبێلەکەی پیٚ بدەین کەمیٚ لەرێگاکە لابدات و دوور بکەوێتەوە تالیمۆی پورزای خۆی دەگۆڕیٚ !! پاش ماوەیەك هاتنەوەو گەیاندمن، ئیتر نازانم لەو ماوەیەدا جەزا پەلاماری دابوو یان نا..!

هەر چۆن دڵنیام لەراستی و درووستی بڕیارەکەی دادگا، لەگەڵ کۆتایی ئەم چەند دێڕەشدا دڵم گەرمە بۆ فرمێسکەکانی چاوی لیمۆ کەهەرگیزاو هەرگیز وشك ناکەن، باوەڕیش ناکەم بەهاتنە پێشەوەی مرۆڤێکی فریشتە

ئاسا نەبێ لێی، ئەو ملەکەچەی راست بکاتەوەو هەمیشە بۆ بەدبەختی خۆی حەسەرەت دەکێشێ...

لەهەمان کاتدا لەوەش دڵنیام کەجەزا هەموو ساتێ دەنگی دادوەر لە گوێیدا دەزرنگێتەوەو دەخوازێ نەك هەر ژووری زیندانەکەی، بەڵکو شارو نیشتمانەکەشی جێبهێڵێ و دوور لەکەسووکارو هاورێکانی، دوور لە لیمۆی پورزای بەدبەختی، دوور لەهەموو کەسێك بژی...

دووبــارە ئــەوەش دەزانم، کێــشەی کــچان و خوشــکان و هاورێیــان و ئافرەتانی ولاتی من یەکجار زۆرن، یەکجار زۆر، بەسەرهاتەکەی لیمۆ تەنیا یەکێکە لەوکێشانەو، کێشەی کچانی ولاتی من یەکجار زۆرن.. یەکجار..

هەرگیز وێنەو دیمەنی برا شەهیدەکەی لەبەرچاو ون نەدەبوو، زۆربەی ساتەکانی شەوو رۆژی لەگەڵ شەهید سەرداری براو هاورێی دا دەژیا، دوای شەهید بوونی لەیادو بیرەوەرییەکانی (شیروان)دا گەورەترو مەزنتر بوو، گەڵێ جارو بەتایبەت رۆژانی هەینی دەچووە سەر قەبران و سەردانی گۆڕی برا تاقانەکەی دەکرد، پاش نیوەڕۆی ١٩٩١/١٢/٢٦یەکێ بوو لەرۆژانی زیارەتی شەهید سەردار، بەلأم ئەمجارەیان بەتەنێ نەبوو، بەڵکو (رەحمان)ی ئامۆزاو هاورێی لەگەڵدا بوو، ئەو رۆژە لەکەلار لەماڵی رەحمان لایدا بوو، لەوێوە پێکەوە هاتنە کفری و راستەو راست رێگای گۆڕستانیان گرتە بەر..

بەتەنیا هەردووکیان بوون، شیروان کلأشینکۆفەکەی بەشانەوە بوو، کەماندوو دەبوو دەیکردە شانەکەی دیکەی، دوای مەراسیمی زیارەت، بەبێ بڕیاری لەوەوبەر، هەر لەخۆوە جووتە ئامۆزا روویان بەرەو ماڵەکانی گوندی (ناساڵح)وەرگێڕاو، لەوێ سوێسکەی زۆری ناوچەکە خستنیە سەر کەڵکەڵەی راوکردن و تاپاشانیش، بردنەوەی چەند سوێسکەیەك بۆ کەلار لەنسیبیان بێت..

شیروان تەمەنی تەنیا(١٩) بەهاربوو.. بالأ مام ناوەندی و قژ رەش و گەنم رەنگ و چاوڕەش، هێشتا لەبەری ژیانی نەخواردبوو..

زۆرجار دەیویست بەراوکردن، یان خۆ خەریك کردن بەیارییەکەوە، یاخود دەمەتەقێی خزم و برادەران کەمێ لەتاڵییەکانی ژیان و مەینەتی رۆژگار لەخۆی دوور بخاتەوەو بۆ چەند ساتێك ئاسوودە بێ..

بەلأم ئەو رۆژە راو ئاکامی باشی نەبوو، سوێسکە کارەساتێکی قەوماند کەهەرگیز چاوەڕوان نەدەکرا..

رەحمانی خەڵکی کفری تەمەن (٢٢)ساڵ و پیشەی کاسبکار بوو، سروشتی ئەم گەنجە بێ دەنگی و زۆرجار مات و مەلوولی بوو. کەسێك

دۆستی تەواوی نەبوایە حەزی بەهاوڕێیەتی نەدەکرد، هێشتا هەر شەرمن بوو، تەنانەت دوای ڕووداوەکەش کەسوکار بەزۆر هێنایانە قسەکردن...!

## لەراودا چی قەوما؟!

دەمەو عەسرێکی درەنگ بوو، پۆلە سوێسکە بەئاسمانی ناسالّح دا دەهاتن و دەچوون، کزە بایەکی سارد وای لەهەردوو کوڕە لاوی خزم کرد قۆپچەی قەمسەڵەکانیان دابخەن. شیروان، وەك کەسێکی کارامەو لێهاتووی بەکارهێنانی چەك، زۆر لەسەرخۆ تفەنگەکەی لەشان داگرت و هێنایە سەرپێ، چاوێکی بۆ نوقاندو لەگەڵ نیشانەگرتنەوەو،پەنجەنان بەپەلەپیتکەو تەقەی فیشەکدا سوێسکەیەك کەوتە خوارەوە.. رایکرد بۆی و هێنایەوە بۆ رەحمان..

ئەو دیمەنە رەحمانی جولاّند، لەسەرخۆ بانگی کردە ئامۆزاو پێی وت:

-ئادەی، شیروان ئادەی تفەنگەکەتم بەرێ..

دایە دەستی و ڕووی لێوەرگێڕا، هەر کەفیشەکی تەقاند لەبری سوێسکە شیروان بەرکەوت و لەسەر زەویەکە درێژ بوو..

خودایە.. چ کارەساتێکە،بۆ وای کرد؟!

شیروان، بەرپشتی کەوتبوو، لەوێشەوە قەفەزەی سنگی گرتبووەوەو شکاند بووی وفیشەکی لەعنەتی بۆی دەرچوو بوو!

بەدەم ئازارو خوێن ڕژانەوە، بەبێ دەنگی دەیڕوانیە رەحمان، وەك ئەوەی بەچاو لێی بپرسێ: بۆ..بۆ وات کرد هاوڕێکەم..بۆ؟

ئەویش نەیدەزانی چیبکاو چی بڵێ، سیمای شپرزەو رەنگی زەردو پەڕیوی و لەرزینی جەستەی بۆ خۆی وەلاّم بوو بۆ شیروانی خۆشەویستی، هەر بەبێ دەنگی دەیووت:

–نـەمزانی، بەوخودایـە بەئەنقەسـت وام نـەکرد، نـازانم بـۆ بەرکـەوتی، بەوچاوانەت من نەمویستووە بتکوژم..نەمویستووە!

چیتر خۆی پـێ ڕانـەگیراو چەکەکەی لای شیروانەوە فڕێداو دایە قوڵپی گریان، بەرەو شەقامە سەرەکییەکە ڕایکردو نەشیدەزانی بۆ ڕادەکات!..

لـەوێ بەجەسـتەی وەك شـۆڕەبی لـەرزیوەوە تـەنیا ئـەوەی بـەبیردا هـات دەسـت لەئۆتومبیلـە تیـژڕەوەکان ڕابگرێـت بـەڵکو ئەمـە خوایـە یـەکێکیان بوەستێ و فریای زامدارەکەی بکەوێ..

ئۆتومبیلەکان لەئاوابوونی خۆر خێرا تربوون، هـەموو تێدەپـەڕین و هیچ کامیان وەڵامیان بۆ ئەو کڵۆڵە پێ نەبوو..

دواجار، بێ هیوا، دڵ پڕلەترس و بەرچاو تاریك بەرەو کـەلار کەوتـەڕێ.. چەند کیلۆمـەترێ بـەولاوە پیکابێك وەك بـەزەیی پیـادا بێتـەوە بۆی وەستاو لەپشتەکەیدا جێگای کردەوە.

چووەوە ماڵ و لەگـەڵ هـیچ کەسـێکدا نـەدوا، تەنانـەت وشـەیەکی لـەزار نەهاتـەدەر، تـەنیا دیمـەنێك بەرچـاوەکانی داگـیر کردبـوو ئـەویش دیمـەنی شیروان بوو، کەبەو جۆرە بەجێ مابوو.!

## گواستنەوەی شیروان بۆ سلێمانی...

ئەو شـەوە شیروانی زامـدار، خوێن لەجەسـتەی دەچۆڕی و کەسـێ نـەبوو لێـی بپرسـێ، یـان کـەمێ ئـاو بەگـەرووی وشـکیدا بکـات، هـەموو چرکەیەکی مەرگێ بوو، بەڵام ڕۆح دەرنـاچێ..

بـۆ سبەینێ، چـەند پێشـمەرگەیەك دەیبیـنن و بـەبینینی سەرسـام دەبـن، ئازایانـە فریـای دەکـەون و دەیگـەێننـە سـەر شـەقامە گـشتییەکەو سـواری

ئوتـومبێلی دەکـەن و، بـەنیازی فریاکـەوتنی دەیگەیەننـە نەخۆشـخانەی سلێمانی.

بەلام، قەدەری شیروان ماڵئاوایی کردن دەبێ لەژیان و بێ ئەوەی وشەیەك بدرکێنێ خۆدەدات بەدەستی مردنەوەو بۆ دواجار پێڵووە ماندووەکانی دادەخات..کەسوکار دێن و دەیبەنەوەو بەخاکی دەسپێرن.

## چاوەڕێ نەبوو هەرگیز چۆلەکەیەکیش بکوژێ..

باوکی رەحمان، بەدڵی پڕلەزامەوە بەدادگای وت:

-شیروان کەسی خۆمان بوو، کوڕەکەی منیش هەرگیز چاوەڕوانی ئەوەی لێ نەدەکرا، نەك شیروان، بەڵکو چۆلەکەیەکیش بکوژێ، ئەو هەرگیز تفەنگی بەکارنـەهێنابوو، بـەهۆی بـاری دەروونـی شـپرزەی و لێ نـەزانینی لەبەکارهێنانی چەکدا ئەو کارەساتەی لەدەست قەوماوەو هەرکە بەکوشتنی شیروان زانـرا رەحمـانی کـوڕم دانـی بـە رووداوەکـەدا نـاو، لای ئێمـەو لای ئێوەش گێڕایەوە چۆن چۆنی ئەو کارەساتە قەوماوە..

## بەڵێ قەزاو قەدەر بوو...!

باوکی شیروان لەگەڵ سڕینی فرمێسکەکانیدا وتی:

-رەحمـان خۆشەویـست و خزمـی نزیکـی خۆمانـە، قـەزاو قـەدەر ئـەو کارەساتەی قەوماند، ئەو نیازی کوشتنی کوڕی منی نەبووە، ئەو هاوڕێی جوانەمەرگ بوو.. تکا دەکەم دادگا لێی خۆشبێ و من هیچ داوایەکم لەسەری نییە..

## بڕیاری دادگا...

ڕۆژی ١٩٩٣/٥/٢٩ دادگایی تاوانبار کرا، بەبڕوای دادگا:

ڕەحمان لەبەکارهێنانی تفەنگی نەزانیوەو بەهیچ جۆرێك نیازی کوشتنی شیروانی نەبووە، لەو کاتەدا ڕێکەوت ئەو کارەی کردووە، بەتەنیا خۆیشی دانی بەتاوانەکەدا ناوەو شایەتی بەسەرەوە نییە.. هەروەها لەوەوبەر تاوانی تری نەکردووە، کەواتە شیروان (٢)ساڵ زیندانی دەکرێت.

## ڕەحمان خرایە زیندانەوە..

هەموو دەمێ بیری لەوە دەکردەوە ئەو کارەساتە چۆن ڕوویدا؟!

ئایا ئەوە ڕاوە سوێسکە بوو..

لەبەندیخانەدا ماتتر لەجاران، بێدەنگ تر، مەلوول تر..شەوی دەدایە دەم ڕۆژو.. کات زۆر بەقورسی بەڕێوە دەچوو..

هەموو جارێ ئەحلام لە براژنەکەی دەپرسی:

-داخۆ (غازی) بەڕاستی بێت؟! تۆ بڵێی ئەویش منی خۆشبووێت !

بەو خودایە لەغازی بەولاوە دڵم نادەم بەهیچ کەسێك...

براژنەکەشی دەیووت:

-ئەحلام تۆ ئافرەتێکی سەیریت، بۆ بڕواناکەی، ئەو کوڕە نیازێتی بەم زووانە بتهێنێ، چۆن گومان لەکەسێ دەکەیت بتکاتە ژنی خۆی... چۆن؟!

دواجار، ئەحلام بەدڵنیاییەوە دەیووت:

-قسەی تۆیە، براژنی دڵسۆزم، قسەی تۆیە، غازی لەمن زیاتر کەسی دیکەی خۆش ناوێت...بەم زووانە دەمهێنێت..

## کەبەیەکتر دەگەیشتن..

چەند جارێ غازی توانیبووی ئەحلامی بالآبەرزو چاوڕەش رازی بکات (ژووان)ی خۆشەویستی لە نێوانیاندا بێ.. پێشتر دەیویست لەگەڵیا بچێتەماڵیان لە(حی النصر)... بەڵام رازی نەدەبوو، ئەحلام دەیووت:

-ئاخر من لەگەڵ تۆ لە(خاسە)وە بگەمە(نصر)، خۆ هەموو کەرکوك پێمان دەزانێ..!

ئیدی غازی بۆ دامرکانەوەی حەزەکانی، چارەسەری دیکەی بەخەیاڵدا هاتبوو، دووسێ جار ئەحلامی بردبووە ماڵی براکەی کە نزیك خاسە بوو، لەوێ چاوەگەشەکانی دەبڕیە(دڵدارە!) تەمەن ٢٠ ساڵەکەی‌و دەیپرسی:

-غازی گیان، منت زۆر خۆش دەوێت؟

ئەویش لەگەڵ گوشینی دەستەکانی دا، سەری دەبردە پێش‌و دەیووت:

-ئەرێ وەڵلا، لەهەموو کەرکوکدا لەتۆ جوانتری تیانییە... ئەرێ وەڵلا دەتخوازم‌و تامردن پێکەوە دەبین....

## تەگبیری چوونە هەندەران...

غازی دەمێك بوو خەیاڵی چوونە دەرەوە لەکەللەی دابوو، بەنیاز بوو هاوڕێی ڕۆژانی سەفەرو ساتە درێژەکانی غەریبایەتی (هیوا)ی برادەرو دراوسێی بێ.. لەوەوبەر گەلێ جار هەردوو هاوڕێ لەو سەفەرە دەدوان، بەڵام ئەمجارەیان غازی گەرمو گوڕتر چووە نێو باسەکەوە... غازی بەهیوای وت:

-تەواو، هەموو تەگبیرێکم کردووە، ئا لەم ڕۆژانەدا بۆی دەردەچین، تۆ ئێوارە وەرە لامو هەقت نەبێ...

هیوا بەسەر سوڕمانەوە دەیپرسی:

-باشە دێم، بەڵام کاکە گیان چۆن دەڕۆین؟! بەچی دەڕۆین؟!.. غازی، دواجار پێی وت: بۆ ئەوەیان.. خەمت نەبێ. .نە...

بەرلەوەی غازی ئەو قسانە بەهیوا بڵێ، سەر لەبەیانی ئەو ڕۆژە بەتەلەفۆن لەگەڵ دڵخوازەکەیدا قسەی کردبوو، ئەو بەئەحلامی وتبوو:

-ئەحلام گیان، چاوەکەم شەوێ دێمە دواتو دەچینە لای دایکم، با بتبینێ، ئیدی دێینە خوازبێنیو بەمورادی دڵی خۆمان دەگەین، قوربانت بم، هەر خۆیشم نایەم،ئەمشەو هیوای هاوڕێشم لەگەڵ دەبێ... بەڵام بیرت نەچێ، هەموو ئاڵتوونەکانت لەخۆت بدە، بیرت نەچێ، بازنە جوانەکانت لەدەست کەیت، دەمەوێ هەر دایکم چاوی پێت کەوت بەسەرسامییەوە بڵێ: (لەمنت کەوێ غازی، هەتیو ئەم کچە جوانەت لەکوێ پەیدا کرد، خۆ بووکەکەم جوانترین بووکی کەرکوك دەبێ)... وتت چی؟

بەنەرمە پێکەنینو وردە نازێکەوە ئەحلام وتبووی:

-باشە چاوەکەم، باشە غازی گیان..

شەو، لەوساتەدا بەتاکسییەکەوە چوونە شوێنی دیاری کراو، غازی بینی ئـــەحلام براژنەکـــەی لەگەڵدایـــە، ســـەری لێ تێکـــچوو، نەیهێـــشت هیـــوا دابەزێ،خۆی لەئوتومبیلەکە هاتە خوارو بەبیانویەکی (درۆ) سەردانەکەی دایکی پێ دواخستن، ئەحلام بەو هەموو جوانیو ئاڵتوونانەوە بەرەو ماڵ گەڕایەوە..

## شەوی دواتر.. یان شەوی خوێناوی!

ڕۆژی دوایی، زەنگی تەلەفۆن ئەحلامی ڕاچڵەکاند، دەستی دایە:

–هەلاو خۆتی.. ئەوە بۆ وات کرد... ئەی نازانی براژنەکەم بەهەموو شتێکی منو تۆ دەزانێ...

–قەیدی ناکا، ئەمشەو دێمەوە دوات، هەر خۆت وەرە، با، بۆلای دایکم واباشترە.. ئا، چاوەکەم کەمێ درەنگ تر وەرە دەر، بڵێ دەچمەلای هاوڕێیەکم...ئیتر خۆت دەزانی...

ڕێکەوتن، شەوێ بەخۆیو هیواو ئۆتومبیلی کرێوە ڕێک لەئاستی دا راوەستان، سەریان خست، نزیك (پردی چوارەم) دابەزین... بەفێڵێك شۆڕی کردەوە، لەو شەوە خامۆشو جێگا چۆڵەدا هەندێ ترس چووە دڵی ئەحلامەوە، بەلام ئەو لەگەڵ جوامێرەکەیدابێ، باکی چییە، داگەڕان، خانوویەکی چۆڵی نزیك ئەو ژێر پردە کەپێ دەچوو بۆ ئەنجامدانی تاوانێك ئامادەکرابێ، بووە شوێنی (دوا دیداری!) ئەحلامو غازی...(هیوا بە بیانووی میزکردنەوە کەمێ خۆی دواخست)،ئیدی کەگەیشتە حەوشەی ئەو خانووە سامناکەوە، یەکسەر هیوا پەلاماری هەردوو قۆڵی ئەحلامی داو بەدەستەکەی تریشی توند دەمی گرت...

غازی چەقۆیەکی دەرهێناو ویستی بیداتە هیوا:

–ها، بەمە بیکوژە...

ئەحلام تەنیا چاوە پڕ لەترسەکانی مابوو پرسیاریان پێ بکات، دەلەرزی‌و چاوەکانی بڕیبووە غازی، وەك ئەوەی بیەوێ بڵێ:

-لەپای چی.. بۆ وادەکەی تاوانبار بۆ...بۆ...

هیوا وتی:

-نا، خۆت بیکوژە، گەر دەستی لێ بەربدەم دەزریکێنێ...ئیدی غازی، زۆر دڕندانە بەدوای یەکدا شەش چەقۆی کرد بەسنگی ئەحلامەکەیداو یەکیان دڵە پڕلە خۆزگەکەی گرتەوەو ئەوانی دیکەش خوێنیان لەگیانی هێناو دەستی بێ هێزی بەڕەڵلا کراو بەبێ ورتە لە ئاستی خۆیدا کەوت‌و دوا هەناسە لەگەروویدا خنکا...

هەر دوو تاوانبار، کەوتنە لێ کردنەوەی ئاڵتوونەکانی..ئیدی هەنگاوێکیان کردە دووان‌و ئەو ناوەیان جێهێشت، چوونە ماڵی برایەکی غازی کەکەس لەوێ نەبوو. دەستە خوێناوییەکەیان شۆردو دواتر چوونە ئوتێل(تأمیم)و لەوێ رۆژیان کردەوە.

## لەبری هەندەران.. بۆ نێو زیندان..!

بەیانی زوو لەچەمچەماڵەوە غازی وهیوا خۆیان گەیاندە سلێمانی، لەشەقامی کاوە چوونە لای زەڕنگەرێك، ئاڵتوونەکانیان دەرهێنا، دوکاندار پرسیاری کرد:

-بۆچی دەیفرۆشن؟

وتیان:

-ئێمە خەڵکی کەرکوکین، دەرکراوین‌و پێویستیمان بەپارەیەکەیەتی، جا ئاڵتوونی خۆمانەو دەیفرۆشین بۆ نەیفرۆشین؟!

دوای تۆمارکردنی ناوو ژمارەی پێناسەکانیان. بە(٣١)هەزار دیناری سویسری لێی کڕین، ئاڵتوونەکان بریتی بوون لەشەش بازن، جووتێ گوارە، زنجیرێك، دوومستیلە.

دواتر، چوونە ئێران، لەوێ دەیانەوێ لەرێی (بندر عباس)ەوە بگەنە(ئیمارات)، بەلاّم پارەکەیان تیایدانابێ و بەشی ئەو سەفەرە ناکات، بەناچاری دوای ئەوەی دوانزە رۆژیان پێدەچێ دەگەڕێنەوەو دەچنە هەولێر، لەو ماوەیەشدا براو کەسوکاری ئەحلام بەشوێن تاوانبارەکاندا زۆر جێگا گەڕاون و لەهەولێر بەهۆی خزمێکیانەوە کەبەرپرسی یەکێك لەپارتەکانی ئۆپۆزیسیۆن بووە" سۆراغیان کردووە، کەهەردوو تاوانبار دەچنە هەولێر لەلایەن ئاسایشەوە دەگیرێن و دەنێردرێن بۆ ئاسایشی کەرکوك بۆ لێکۆڵینەوەو دان بەتاوانەکەیاندا دەنێن، ئیدی رۆژی ١٩٩٦/٨/٢٤ دادگایی دەکرێن و رۆژی ١٩٩٦/١٠/٦لەلایەن دادگای تێ هەڵچوونەوەوە بڕیارەکانی دادگای جنایاتی کەرکوك پەسەند دەکرێت، بڕیاەکانی دادگا دەرهەق بەهەردوو تاوانبار بەم جۆرە بوون:

١- غازی بەهەمیشەیی (مؤبـد) زیندانی دەکرێ، بۆیە ئەو حومکەی بەسەردا دراوە (واتە حوکمی لەسێدارەدانی بەسەردانەدراوە) چونکە هەر کە دەستگیر کراوە، راست و رەوان دانی بەتاوانەکەیدا ناوەو یارمەتی لێکۆڵینەوەی داوە.

٢- هیوا بەهەمیشەیی زیندانی دەکرێت (ئەویش لەو بڕیارەدا تەمەنی لەبەرچاو گیراوەکە هێشتا بیستساڵی تەواو نەکردووە)..

بەتەفرەی مرۆڤێکی خۆپەرستی تاوانکار، ئەحلام بەو دەردە براو هیوای هاورێی بەشداریشی بووە هاورێی ئەو زیندانەی جوانی و گەنجی خۆیانی تیا دەبەنەسەر..!

نزیک گوندی (عیساوا)ی سەربە ناحیەی ماوەت، لەنێوان سێ چیای سەرکەشدا کەیەکێکیان چیای (گردە ڕەش)ە، لەو دۆڵەدا کە رووباری (بەرد بەرد) بەدامێنیدا دەڕوات، ژن و مێردێك بۆ کشتوکاڵ و بژێوی ژیان هاوینیان گواستەوە ئەو ناوەو لەوێ بنەو بارگەیان خست، تەمەنی پێکەوە ژیانیان بەتەنیا دوو بەهاری دیبوو، هێشتا خودا گریەو تریقەی منداڵی نەخستبووە ماڵیان، لەرۆژێکی گەرمی حوزەیراندا، ماڵی باوکی شیرین بەمیوانی هاتبوونە سەردانیان، شیرین بەهاتنی باوکی و دایکی و هیوای برای و براژنەکەی گەلێ بەختەوەر بوو..

رێکەوت، هەر بۆ رۆژی دوایی، شیرین بەئامادەبوونی (چرۆ)ی براژنی توشی دەمەقاڵێیەك بوو.. لەسەر شتێکی بچووك دەنگە دەنگ کەوتە نێوانی ئەوو مێردەکەیەوە!

بەیانی زوو بوو، خامۆشی باڵی بەسەر ئەو چەند ماڵەی دۆڵەکەدا کێشا بوو، دەنگی تەقەیەك بێ دەنگی ئەو ناوەی خرۆشاندو بەدوایدا چەند فیشەکێکی دیکە خەڵکی راچڵەکاند..

دوای ئەوە بەچەند چرکەیەك (شیرین) بینرا لەخوێنی خۆیدا گەوزا بوو، پێڵوی چاوەکانی بەیەکجاری داخرا بوون!..

## مێردەکەی، ئەو رووداوەی چۆن گێڕایەوە؟

عادل گێڕایەوە وتی:

-بەیانی ئەو رۆژە، بەهۆی دەمە دەمێکمانەوە کەزیاتر لەیەکتر نەگەیشتن لەنێوانماندا دروستی کرد، من لەشیرینی خۆشەویستم زویر بووم، بەلام

بەهیچ شێوەیەك پەنجەم بۆ نەبرد، ئەوە نەبێ ماڵەکەم بۆ بەجێ هێشتو چوومەدەر، لەو ناوەدا بووم و هەر نیوسەعاتێکی خایاند گوێم لەتەقەی تفەنگێك بوو!.. بەڕاکردن بەرەو ماڵ گەڕامەوە، چیم بینی؟! بینیم ژنەکەم کەوتووەو خوێن لەگیانی دێ؛ هەروەها بینیم تفەنگەکەم لەولایەوە لەسەر زەوییەکەیە! پەلاماری تفەنگەم داو لەبەر قاپی ماڵ چەند فیشەکێکم بەئاسماندا تەقاند، ویستم خەڵکی بەدەنگمانەوە بێن، چوومە ژووری تفەنگەکەمم فڕێ داو یەکسەر بەرەو ماڵی(کامەران)ی دراوسێمان چووم، بینیم هیوای ژنبراشم لەوێیەو دەنگی تەقەکان خەبەری کردوونەوە، لەکارەساتەکە ئاگادارم کردن و هەرسێکمان بەرەو ماڵی خۆمان رامان کرد...

## کێ گەیشتە سەر لاشەکە؟

یەکەم کەس کەگەیشتە سەر لاشەی ساردەوە بووی شیرین کاك عەولی جوتیار بوو، ماڵەکەی هەر سەدوپەنجا مەترێ لەماڵی عادلەوە دوور بوو، عەول دیویەتی(چرۆ) سەری شیرینی کوژراوی لەسەر ڕان بووەو بەدەم گریانەوە زوو زوو گوتویەتی:

_ بۆ وات کرد... بۆ خۆتت بەم دەردە برد؟!

## شایەتەکانی تر...

کامەرانی دراوسێیان وتی:

–کەگەیشتینە ئەوێ چرۆ وتی(شەڕیان بوو، شیرین زۆر توورە بوو، لەڕوورەوە تفەنگەکەی هێناو خۆی کوشت)..!

(هیوا)ش وتی:

-کەشیرینم بینی بەجاریٚ وڕوکاس بووم، چرۆی خێزانم وتی خوشکەکەت خۆی کوشت، عادل جەستەی دەلەرزی و بەشپرزەییەوە وتی شیرین خۆی کوشت، بەلاٚم کەجەنازەکەیمان هێنایەوە سلێمانی چرۆ رای گۆڕی!!

باوکی شیرین وتی:

-من بەتەنیا قسەی چرۆ گرنگە لام، چونکە هەر ئەو ئاگاداری رووداوەکە بووە...

هەروەها بەدادگای وت:

-چرۆ لەنەخۆشخانەی سلێمانی پێی وتووم کچەکەم چۆن کوژراوە!..

دایکیشی وتی:

-ئەو دووساڵە پەیوەندیی ژن و مێردییان زۆر باش بوو، نازانم ئەوە چۆن روویدا.. داواکارم خوێنی جگەر گۆشەکەم بەخۆڕایی نەڕوات.

## ئەی (چرۆ) چۆن تاوانەکەی گێڕابەوە؟

بەگوێرەی قسەی هەردوو دراوسێکەی ماڵی عادل، لەسەرەتادا چرۆ تاوانەکەی داوەتە پاڵ شیرین خۆی، یەکەمجار هەرواشی بەهیوا- ی مێردی وتووە، بەلاٚم هەر کەدەگەنە نەخۆشخانەی سلێمانی رووداوەکە بەجۆرێکی تر دەگێڕێتەوە، لەلێکۆڵینەوەو بەردەم دادگاشدا بەهەمان شێوە نهێنییەکە دەدرکێنێت، چرۆ خوێنی شیرین دەخاتە ئەستۆی نزیکترین کەسی..

چرۆ وتی:

–من خۆم لەویَ بووم، عادل‌و شیرین بووە دەمەقالَیّیان، عادل کەوتە ـیـانی. باوکی عادل بەسەر ئەو دیمەنەدا هات‌و لەبری ئەوەی هیّوری ـکاتەوە زیاتر هانی کوڕە هەلَچووەکەی دا، تەنانەت پیّی وت (گەر پیاویت ـەلاقی بدە)، ئیتر ئەویش زیاتر ئاگری گرت‌و زیاتر شالاَوی بۆ دەبرد..لیّی ـدپارامەوەو هەردوو دەستیم ماچ کرد واز لەو ژنە کلۆلَە بهیّنیّت، بەلاَم بیَ ـوود بوو، پەلاماری خاکەنازیّکی داو سرەواندییە پشتی‌و دوایی بەسەر ـسنگیدا کەوت، من هەر دەپاڕامەوەو دوورم دەخستەوەو ئەو هەر تووڕە ـدبوو، تەنانەت هەرسیَ بەردەکەی فڕیّدا.. رایکردە ژوورەوەو لەناو نوینەکاندا کلاَشینکۆفەکەی هیّنا، لەگەلَ زریکەی من‌و راست بوونەوەی شیریندا، عادل شیّتانەو بەقەستی کوشتن بەرەو رووی چوو، لەترسی رۆحی خۆی شیرینی داماو پەلاماری لوولەی تفەنگەکەی دا..بەلاَم سوودی نەبوو،میّردەکەی بیَ بەزەییانە دەستی نا بە پەلەپیتکەداو یەك و دووان‌و سیان..فیشەك جەستەی شیرینی سارد کردەوەو کەوتە سەر زەوی، منیش لەترسی ئەو دیمەنەو گیانی خۆم بەرەو دەرەوە تیّم تەقاند، عادل شویّنم کەوت، چەند فیشەکیّکی تەقاند، چونکە دوور بووم نەیپیّکام، هەرچەند شپرزەو تۆقیو بووم، بەلاَم گویّم لەنەڕەو هاواری بوو کەهەڕەشەی لیَ دەکردم ودەیگوت گەر قسە بکەیت دەتکوژم!..

## بڕیاری دادگا

دادگا بڕیاری زیندانی کردنی عادلی تاوانباری دا بەهەمیشەیی، هەروەها دەبێ سێ هەزار دینار بداتە باوکی شیرین و تفەنگەکەشی دەدرێتە پۆلیسی سلێمانی..

کاتێ دۆسیەی تاوانبار ڕەوانەی دادگای تێ هەڵچوونەوە کرا لەهەولێر، دادگا بڕیارەکەی دادگای سلێمانی بەلاوە قورس بوو، چونکە تاوانبار گەنجەو لەسەرەتای تەمەندایەو لەوەوبەر تاوانی دیکەی نەکردووە، لەبەرئەوە بڕیاری زیندانی کردنەکەی کرا بە(١٥)ساڵ.

بەدرێــژایی ٢٦ ســاڵی تەمــەنی، (خــەرامان) دووچــاری گیروگرفتـــی وانەبووبوو، ئەو شەوە خەو نەدەچووە چاوانی، دەروونـی هـەروەك سـەرمای زسـتانی سلێمانی ساردو سڕبوو، هـەزارو یـەك شـت بەمێشكیدا دەهـاتن‌و دەچوون، كـەمێردی یەكـەمی بـەخاك سپێردرا ئـەم زۆر گـەنج بـوو..سـەلامی شووبرای هەرچەندە دووسالْ لەخۆی بچووكتر بـوو بـووە مێـردی دووەمـی‌و، مام‌و باوكی هەردوو كچە بچكۆلەكەی‌و.. لەمیش خوا كچێك‌و كوڕێكی پێدا.

ئێستا لەژوورەكەی خۆیاندان‌و دەست لەملانی خـەوێكی قوولْن..مێشكە بچووكەكانیان لەخەویشدا گیروگرفتی دایكی كلۆڵیان نابینن..

خـەرامان نـازانێ ئـاخۆ سـەلامی مێـردی خـەوتووە یـان ئـەویش سـەری پورەی هەنگەو بۆ تـەنیا ساتێك ئارام ناگرێ.. ئاخۆ سەلام بڕوای بـەپاكێتی ئەم هێناوە، یان وەكو ئەوانی تر گومانی ناپاكی لێ دەكات؟!

-خەوتبێ یان نا، باڵیفەكەی بەسەردا بدەم، باسەرمای نەبێ..

سـەلامی داپۆشـی.. لەبەرچاوی خـەرامان ژوورە تاریكەكە بـووە رۆژێكـی رووناك، وەكو فیلمێك سەردانە شوومەكەی(سمكۆ)هاتـەوە بەرچاوی.. تـەنیا رۆژێك بوو مانگی باران‌و بـەفرو رۆژگـاری ژیـانی ئێمـە ئاوێزانی سـاڵی نـوێ بوو بوو، سەلام بۆ نان پەیدا كردنی هەرچوار جگەر سۆزەكەی بەسـەفەرێكی دوور.. یـەكجار دوور چـوو بـوو، لەسـەعات (٧)ی تـەواودا (سمكـۆ)ی كـوڕە لاوی گـەڕەك‌و هـاوڕێی مێردەكـەی بـۆ (كارێـك)هاتـە لای، ئەوەنـدەی پـێ نەچوو(رزگـار)ی بـرای بـچووكتری مێردەكـەی پەیـدا بـوو، لـە(ترسـا)سمكـۆ لە(كەنتۆری)ژووری نووسـتنی خەرامانـدا حەشـاردرا، رزگـار لـەنهێنی بـوونی

سمکۆ لەماڵی کاکیدا ئاگاداربوو،راپەڕی و هەنگاوێکی کردە دووان و چوو هەواڵ بدات بەباوکیان و(جەوهەر)ی براگەورەیان، لەوماوەیەدا سمکۆ دەرفەت دێنێ و بۆی دەردەچێ، کەسوکاری دادەبارن و دەبینن خەرامان و چوارفریشتەکەی بەتەنیان..بۆ رۆژی دوایی ئەکرەمی کاکی خەرامان لەو مەسەلەیە ئاگادار دەکرێت، بڕیار دەدەن جارێ بوەستن تاسەلام لەسەفەر دەگەڕێتەوە..

هەر ئەو رۆژەی دەگاتەوە، (خزمان)لەمەسەلەکەی ئاگادار دەکەن، بەڵام کەداوای قسەی راست لەژنەکەی دەکات هەر زوو بڕوای پێ دێنێ..قسەو قسەڵۆکی هەردوولا(کەسانی خۆی و هیی ژنەکەی)دەیخەنە گومان و پرسیارەوە، بەرامبەر ئەو ژنەی چوار ساڵە هاوسەری ژیانێتی! لەتەنیشتییەوە سەلام چاوی بڕیبووە کەنتۆرەکە، دەیزانی هێشتا خەرامانەکەی نەخەوتووە، زۆر لەسەرخۆ رووی وەرگێڕاو دوای تەماشاکردنی، بە رستەیەکی تێکەڵ لەخۆشەویستی و نەویستنەوە، تێکەڵ لەبەزەیی و رقەوە پێی وت:

-ئەوە بۆ نانوویت نەگبەتی سەر بەگۆبەند، بۆ نانوویت وا سەعات دەیە..!

لەسەعات دەونیوی تەواودا لەدەرگا دەدرێ،جارێك و دووان و سیان، خەرامان بەر لەسەلام رادەپەڕێ و رووەو دەرگای حەوشە رادەکات.. مێردەکەشی بەدوایدا..

-کێیە؟

-منم، جەوهەرم جەوهەر..

دەرگای لێ دەکەنەوە، دەبینن رزگاریشی لەگەلدایە، تفەنگەکانی دەستیان خورپە دەخەنە دڵی هەردووکیانەوە،خودایە بەم شەوە چی قەوما بێ؟

جەوهەر رووداوەکاتە سەلامی برای و بەسەریا دەنەڕێنێ:

-چۆن توانیت دان بەخۆتا بگریت و ئەمە قبوڵ بکەیت، بۆ نەتکوشت؟ ئەی باشە چۆن تەڵاقت نەداو لەم ماڵە نەتکردە دەرێ؟!

خەرامان وڕو بێ دەنگ، سەلامیش وەك بت وشەیەكی بۆ نەدەوترا، یەكێ لەبراكان میل دێنێتەوەو بەدەستڕێژێ ساردی دەكاتەوە..سەلام هەر خۆی بەتەنیا بەدیار ژنەكەیەوە دەمێنێتەوە، مێشكی بەشێوەیەك سڕبوو هیچی بەبیردا نەدەهات!!

## ڕاگەیاندنی تاوانەکە..

سەلام ماوەیەك بەحاڵی شپرزەو قوڕگی گیراوەوە بەدیار ژنەكەیەوە مایەوە، دواتر هەواڵ دەداتە ئەكرەمی برای خەرامان، ئەویش هەر كەدەگات و كارەساتەكە دەبینێ خەبەر دەداتە پۆلیس، لەسەعات١١،٣٠ی شەودا دەگەنە سەری و دەبینن لەپشتی دەرگای حەوشە كەوتووەو گیانی لەدەست داوە.. ئیتر دەیبەنە (طب عدلی)و لەوێ دەبینن دەدوانزە فیشەكی پێوەیە..!

هەر لەو ساتەدا تەنیا شایەتی رووداوەكە كەسەلام خۆیەتی رایدەگەیەنێ:

-رزگاری برای بكوژی ژنەكەیەتی..

ئەو شەوە رزگار لەماڵە خزمێ دەمێنێتەوەو بۆ رۆژی دوایی خۆی دەدات بەدەستەوە.. ئاشکرا دەڵێ(من کوشتوومە).. بەلاّم لە لێکۆڵینەوەو لەدانپیانانی بکوژی راستەقینەی خەراماندا دەردەکەوێ و دەسەلمێ کەرزگار نەیکوشتووە، بەڵکو جەوهەری کاکی ئەو تاوانەی کردوە، هەر لەدوای رووداوەکە، رزگار خۆی وتبووی(کاك جەوهەر، تۆ تەمەنت زۆرەو خاوەنی هەشت سەر خێزانیت و بەرگەی بەندیخانە ناگریت، کەواتە من براژنم کوشتووە).

ئەمە دەڵێ و لوولەی تفەنگە کلاشینکۆفەکەی دەکاتە ئاسمان و فیشەکێ دەتەقێنێ، تاوەکو لەفەحسی تفەنگەکەیدا بسەلمێ تەقەی پێ کراوە،بەلاّم دواتر کاکی دان بەراستی تاوانەکەدا دەنێ و تەسلیم بەیاسا دەبێت و دەڵێ راستی مەسەلەکە بەو جۆرەیەو من خۆم کوشتوومە، تەنانەت پێیان دەڵێ:

-کە رزگارم شوێن خۆم خست سەرم گەرم کردبوو، تا چووینە ئەوێو کارەکەم ئەنجامدا رزگار بەمەبەستی منی نەدەزانی..

### خەرامان بۆچی کوژرا؟..

باپێکەوە گوێ لەشایەت و پەیوەندداران خۆیان بگرین:

رزگار: من خۆم شتم لێ دیوە..!

هۆی ئەو کارە بەقسەی رزگاری تەمەن بیست ساڵ پاراستنی ناوبانگی خێزانەکەیان بووە، ئەوەتا دەڵێ:

-خەرامان ناوی خێزانەکەمانی خراپ کردبوو، پەیوەندی لەگەڵ سمکۆدا هەبوو، کەچوومە ژووری نوستنەکە براژنەکەم بەتەواوی شپرزە بوو، کەلە کەنتۆرەکەش نزیك کەوتمەوە ئەوەی ناوی(سمکۆ)توند دەرگاکەی

لەسەرخۆی داخستو نەیهێشت بیکەمەوە، تاچووم ئاگاداری کەسوکارم بکەمو هاتمەوە رایکردبوو.

*(لەنجە)ی تەمەن(١١)ساڵان کەنۆبەرەی خەرامان بوو، بەرەنگی هەڵبزرکاوو دوور لەنازی دایكو باوك، هێدی هێدی قسەی دەگێڕایەوەو وتی:

-تاریك داهاتبوو، كاك سمكۆ هاتەماڵمانو لەناو دەرگای حەوشەدا قسەی لەگەڵ دایکم کرد، نازانم باسی چیان دەکرد، دایکم بەئێمەی وت: بچنە ژوورەکەی خۆتان، خۆیو پیاوەکەش چوونە ژوورەکەی ئەوبەر کەکەنتۆرەکەی لێیە، دوای کەمێ لەدەرگا درا، من چووم کردمەوەو بینیم مامە رزگارە، هاتە ژوورەکەی ئێمەو دایکیشم هات بەخێرهاتنی کردو دوای ماوەیەك چووە ژوورەکەی خۆیو لەوێ مایەوە، ئیتر لەوێ دواکەوت،مامم وتی بچۆ بانگی بکە بابێت لەگەڵماندا دابنیشێ، بەلام دایکم وتی بڵێ جلەکان رێك دەخات، ئەوە بوو مامم چووە لایو داوای دەمانچەکەمانی لێ کردو ئەویش دایە، بردیو رۆیشت، ئیتر من کاك سمکۆم نەدی بڕواتە دەرەوە، دوای ماوەیەك مامە رزگار گەڕایەوە باپیرمو مامەکانی ترمی لەگەڵدا بوون، لەگەڵ دایکم لەژوورەکەی خۆی مانەوەو دوایی رۆیشتن، بەلام من ئاگام لەکوشتنی دایکم نەبوو، من لەوکاتەدا خەوتبووم، لەوەو بەریش سمکۆم نەدیبوو بێتە ماڵمان..

*برا گەورەکەی سەلامو بکوژی خەرامان وتی:

-بەرلەسێ ساڵ گومانی ئەوەمان لێ کردبوو کەپەیوەندی لەگەڵ سمکۆدا هەیە، رزگار نامەیەکی گرتبوو کەسمکۆ بۆ خەرامانی ناردبوو، بەدەوری

خۆم براكانم راسپارد ئامۆژگاریی بكەن، خۆیشم قسەی زۆرم بۆ كرد، بەلاّم بێسوود بوو، ژنە خۆی چاك نەكرد، كاتێ رزگار چووبووە ئەوێ تا لەلایان بنوێ شتی نائاسایی هەست پێكردبوو، بەتایبەت لە هەڵسوكەوتی لەنجەوشۆخاندا، كەچووبووە ژوورەكە ژنە بەر كەنتۆرەكەی لێ گرتبوو، دواتر كەئێمە چووین بینیمان كەنتۆرەكە بەتاڵەو جلیشی تیانییە.. كەمن هاتمە ئەم كێشەیەوە بەبراكەیم وت(گرنگترین شت رەوشتو ناوبانگە بۆ مرۆڤ، خەریكە خەرامان ناوی بنەماڵەكەمان دەزڕێنێ)، ئەو وتی(با بەهەردوولامان بیكوژین)، بەلاّم من بەوە رازی نەبووم، وتم بیبەنەوە ماڵی خۆتانو چی لێ دەكەن بیكەن، بەلاّم هیچمان لێ نەكرد..

دوای تێپەڕبوونی چوار رۆژ بەسەر گەڕانەوەی سەلامی برامداو، دوای ئەوەی ناوی خەرامان زڕابوو بڕیارمدا خۆم بیكوژم، ئەوە بوو بڕیارەكەشم بردە سەر.

*ئەفسەری نووسینگەی لێكۆڵینەوەی تاوان وتی:

-جێی پیاوێك لەناو كەنتۆرەكەدا دەبێتەوە، جێی رووشاوی لەنزیك شوێنی كلیلەكەوە لەناوەوە دیارە..

## داوای سزادانی سمکۆ دەکەم..!

سەلام وتی:

–من داواکارم سمکۆ سزا بدرێت، چونکە ئەو بووە هۆی لەناوچوونی دایکی دوومندالّم، خۆ بەناخێری لەکۆنەوە هاوڕێم بوو، ئەو نەهاتووەتە مالّی من لەوەوبەر، بەلاّم نامەیان گرتبوو کەبۆ ژنەکەمی ناردبوو، هەرچەندە من ئەو نامەیەم نەدیوە، ئیتر لێی زویر بووم، کاتێ مەسەلەکەیان گێڕایەوەو وتیان لەکەنتۆردا شاردویەتیەوە، ژنەکەم وتی:

–بۆ ئەوە هاتبوو کەمن بەکەسوکارم بلّێم سمکۆ داخوازیی خونچەی خوشکم دەکات..

بێگومانم کەخەرامان پەیوەندیی خراپی لەگەلّیا نەبووە، خەلّکی گەڕەك هەموو شایەتی ئەوەن کەداوێن پاكو ڕەوشت بەرز بووە..

ئەکرەمی برای خەرامانیش لەوەوبەر هیچی نەبیستووە، تاسەلامی زاوای لەسەفەر دەگەڕێتەوەو لەم بالۆرەیەی ئاگادار دەکات.. ئەویش یەخەی سمکۆ دەگرێت، بەلاّم ئەو نکولّی لەو باسە دەکاتو دەلّێ من بۆ داواکاریی خوشکەکەی ترت چوومەتە مالّیان..

ئینجا داوای لەدادگا کرد سزای تاوانبار بدرێت، ئەو کەسەی خوشکەکەی کوشتووە..

## ئەی سمکۆ خۆی دەڵێ چی؟

سمکۆش بەدادگای راگەیاند:

-چوومەماڵیان تا لە مەسەلەی داواکردنی خونچەی خوشکی بدوێم، زانیم سەلام لەوێ نییە، لەناو دەرگاکەدا قسەمان دەکرد، کەرزگار هات بۆ ئەوەی نەمبینێ چوومە ژوورەوە، لەوێش لەترسا چوومە کەنتۆرەکەوە، کەئەو ماڵی بەجێهێشت هاتمە دەرەوەو رۆیشتم، من بەهیچ جۆرێ پەیوەندیم لەگەڵیا نەبووەو ئەو نامەیەش کەباس دەکرێ ئەوا ئەسڵی نییەو هەرگیز نامەی وام نەنووسیوە..

## بڕیاری دادگا..

رۆژی ١٩٩٣/١١/٢٧دادگای جنایاتی سلێمانی دادگایی هەردوو گومان لێکراوی کردو بەبڕوای دادگا:

-خەرامان کەدوو شووی کردووەو دایکی چوار منداڵە بەتەنگ ناوبانگی خێزانەکەیانەوە نەهاتووەو پەیوەندیی لەگەڵ سمکۆ هەبووەو گەڕەك هەموو پێیان زانیوە، جەوهەریش بەنیازی کوشتنی بەئەنقەست ئەو کارەی کردووە، کەواتە مادەی یاسایی٤٠٦ /١/أ سزادان دەیگرێتەوە، بەلآم رزگار بەپێی ئیفادەکان بەشداری تاوانەکە نییە، بەبڕوای دادگا پاڵپێوەنەری تاوانبار بۆ ئەو تاوانە لەوەوە بووە کەدژی خراپەکاری‌و بەدرەوشتییە، دادگا بڕیاریدا:

١- حوکمدانی جەوهەر بە(٢)ساڵ بەندکردن.

٢-دەبێ بڕی (٢٤)هەزار دینار بدات بەهەر چوار منداڵە(ناکامەکەی)ەکەی خەرامان.

٣-دادوەری لێکۆڵینەوە لەرزگار بکۆڵێتەوە دەربارەی چەك هەڵگرتنەکەی.

شایانی باسە، لەوەوبەر جەوهەر هیچ تاوانێکی نەکردووە.

ئایا هەموو کۆمەڵ لەم جۆرە تاوانانە بەرپرسیار نین؟

یان بەتەنیا کەسانێك لەنموونەی کەسانی نێو ئەم چیرۆکە هەواڵە بەرپرسیارن؟!

ئەی دەبێ سوچ و گوناهی ئەو منداڵە بێ نازانە چی بێت؟..

بێخاڵ وەك هەموو شەوەكانی تری هەفتەی رابردوو، دەیویست وانیشاندا كەبەتەنیا مێشكو چاوەكانی لەگەڵ شاشەی تەلەفزیۆنەكەدا دەژین‌و بەجارێ ئاگای لەدەوروبەر نەماوە، بەلام هەردوو میوانەكەی(سەنتەر)لێی نەدەگەڕان‌و بەكلیلی باسێك، رازێكی دیكەیان دادەمەزراندو ئیتر ئەمیش بەناچاری دەكەوتە ئاخافتن..

لەو سەنتەرەی ژناندا، لەوەوبەریش زۆر كچ‌و زۆر ژنی لانەوازو بەشمەینەت داڵدە درابوون، لەژوورەكەی تردا كەتەرخان بوو بۆ خەوتن‌وحەوانەوە چەند میوانێكی هەمیشەیی لەنێو خۆیاندا دەردەدڵیان هەڵدەڕشت‌و دواجار" بۆ ئەوەی بەیانی زوو بەخەبەربێن‌و رووبكەنە كارەكانیان، لەگەڵ خەودا ئارام دەبوون‌و بەجارێ نوقمی بێدەنگی ژوورەكە دەبوون.

## گفتوگۆی ئەو شەوە

دیداری تیرۆریستەكەی نێو تەلەفزیۆنەكە هێشتا كۆتایی نەهاتبوو، پورەخانم هەردوو دەستی هەڵبڕی‌و بەدەنگی بەرز وتی:

-رەبی خێر لەجوانیی خۆتان نەبینن، ئاخر بۆ كوڕی موسڵمانان بەم دەردە دەبەن.. چ رەوای هەقە جەرگی خەڵكی دەسوتێنن.!

لەسەرخۆ (بێخاڵ) بەشداریی قسەی كردو وتی:

-پورێ گیان..ئەمانە كەی ئادەمین، ئەمانە دڕندەن‌و وان لەپێستی ئادەمیزاددا..

خانم توورەتر قسەی كردو وتی:

-ئاخر سەگی سەگبابینە بۆ وادەكەن، بۆچی بەتەقینەوە خوێنی پیرو جوان تێكەڵ دەكەن.. ناكەسبەچەكەی مێردی منیش لەمان بوو، دەیویست

تادەمرم زوخاوبكات بەگەروومدا.. دەیویست بۆ یەك رۆژ خێر لەژیانی خۆم نەبینم.

تا ئەو ساتە (جوانە) خۆی گرمۆڵەکردبوو، بەشداریی قسەی نەکردبوون، هەموو زەینی خۆی دابووە دیداری نێوان بێژەرەکەی تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان و ئیسلامییە پیاوکوژەکە.. بەپرسیارێك دەنگی تێکەڵ بەدەنگیان بوو..

–پورە خانم گیان...بۆیە واتکرد.. بۆیە ویستت بیکوژیت..باشە چۆن نەمرد؟!

–چوزانم کچی خۆم، ئەڵێی بەرازە...ئەو چۆن بەچەقۆیەك و دووان بەلادا دێت، بەخوا کچم بەرگەی دەش دەگرێت..

بێخاڵ لێی نزیك بووەوە..دەستی گرت بەسەرپۆشەکەی دەمولوتییەوەوبەسەرسامییەوە پرسیی:

–پورێ.. بڕیاری لەوەوبەرت بوو، یان لەو شەوەدا بەخەیاڵتدا هات دەستی لێ بوەشێنیت؟

–رۆڵە بڵێم چی..بەو خوایەی هەمووومانی دروستکردووە، هەموو جارێك کەلەسەر بەرماڵەکەی هەڵدەستا بەجنێوێکی ئەو دەمە پیسەی شپرزەی دەکردم..ئاخر من لەرێی ئەوەدا ماوم دڵم لێ پیسبکەن.. لەرێی ئەوەدام هەموو رۆژێ پێم بوترێ قەحبەی قەحبە باوك و دایك.. رەبی خوایە لەپاداشتی ئەو جنێوانەی بەدایك و باوکمی دەداو رۆژی سەد جار لەقەبرەکەدا رایئەچڵەکاندن ئەو زمانەی تووشی سەرەتان کەیت..

خانم دەستی کردە گریان و هەردوو کچە گەنجەکەی هاوغەمیشی زیاتر لێی نزیك بوونەوەو بەهەموو شێوەیەك هەوڵیاندەدا هێوری بکەنەوەو ژێربێنەوە..

چاودێری سەنتەرەکە خۆی کرد بەژوورەکەداو خۆی ئاسا بەڕووی خۆشەوە هەندێ سوعبەتی لەگەڵ جوانەدا کردو لەقاپێکی نایلۆندا خەیاری خستە بەردەستیان... پاشان خوێدانەکەی دایە دەسەتی بێخاڵو وتی:

– ها کچی جوان... هانێ بیگرەو توئەو خوایە گەر دەستو سەرپۆشەکەت لەسەر رووت لانەبەیت... رۆڵە ئەوەی لەگەڵ تۆدا کراوە ناشرینی نەکردوویت.. بەڵکو جوانتریت لەجاران.

ئەو رۆیشتو خانم درێژەی بەقسەدا..

–دە راست دەکات دایکی خۆم، ئاخر ئەوەندە دەست دەخەیتە سەردەمولوتت دەخنکێیت..

## نەچووەمە سەیران. !

دوای تکاو رجای خانم دەستی راستی ئازادکردو بەدەستەکەی تری سەرپۆشەکەی لەسەری داگرت.. هەردوو هاورێکەی سەرنجی لوتی براویان دا...دییان وا گۆشتەو زوون بووەتەوەو بەو چارەسەرە بەردەوامەی بۆی کراوە خەریکە لوتی باشتر دەبێت...بەلام جێگای براوییەکە بەباشی دەبینرا.!

خانم خەیارێکی لەتکردو دایە دەستی...ئینجا پرسی:

–ئەرێ کەی بوو ئەو کافر باوکە بەو دەردەی بردیت؟

–شەوی ٣/١٧ بوو، بەر لەوەی ئەو کارەساتە بقەومێ لەگەڵ دایکم تەگبیری ئەوەمان دەکرد کە بۆ نەورۆز بچینە دوکان، بەلام دوکانی چیو سەیرانی چی... ئەوان بەو دەردەیان بردم کە دەمبینن!

جوانە وتی:

-دەستیان شکێ... دە رۆڵە بۆمانی بگێڕەوە.. تۆ هەر دەڵێیت بوختانیان پێکردین و ئەتکیان کردین.. دەبۆمانی باسکە خۆ شەو درێژەو کۆتایی نایەت..

لەتێ خەیاری بەدەستەوە مابوو، داینا و کەوتە هەڵڕشتنی رازو خەمەکانی.. بێخاڵ وتی:

-رۆژی ٢٠٠٢/٨/٢٧ش لەدادگا هەر وام باسکرد، وتم سوێند دەخۆم بەراستی بۆتانی بگێڕمەوە، وتم بەو قورئانەی بەردەستتان درۆناکەم..

وتم من خزمایەتیم هەیە لەگەڵ (ئاوات)، ئەم ئاواتەی لەسەر من گوێیان بری.. لەسەر ئەویش بەچەقۆ بەربوونە لوتی من و بەم دەردەیان بردم.

من هەرسێ تۆمەتبارەکەش دەناسم، ئەوانەی پەلاماریان داین و دواتر گیران..

راستە من لەوەوبەر پەیوەندی خۆشەویستیم هەبوو لەگەڵ ئاوات، بەڵام دوای ئەوەی درامە خاڵی" ئیتر ئەو پەیوەندییە نەماو کەیەکتریشمان ببینیایە هیچ قسەیەکی لەو جۆرەمان نەدەکرد.. خۆ مێردەکەم دەیزانی کە خوشکەزاکەی جارجارە دێتە ماڵمان، لەوەوبەر کەدەیدی شتێکی وای نەدەوت.. بەڵام ئەوجارەیان کەی بوو..ئا.. ناوەڕاستی مانگی سێ، هەر کەهاتەوە ماڵێ و بینی لەبەر هەیوانەکەی ماڵی خۆمان دانیشتبووین، بەجارێ خۆی شێت وهارکرد..کەوتە جنێوپێدانمان و ئاواتی راونا.. بەهەڵەداوان خۆی گەیاندە ماڵە دراوسێکەمان تا چەك بهێنێ و منی پێ بکوژێت...منیش لەترسی گیانی خۆم هەڵاتم و رامکردە ماڵی ئاوات کە هەر لەگوندەکەی خۆمان بوو.

خانم قسەکەی پێبڕی و وتی:

– ئەرێ گوندەکەتان لەنزیك رانیەبوو؟

– بەڵێ، هەر لەپشتی رانیەوەیە.. کەئاوات بەوەی زانی بەپەلە ئەو ناوەی جێهێشت و چوو بۆ ماڵی زاواکەی لەگوندەکەی نزیك خۆمان، بۆ رۆژی دوایی زاواکەی هات بەشوێن منداو هەربەپێ چووینە گوندەکەی ئەوان، بۆ شەوەکەشی هەرسێکمان، منو ئاواتو زاواکەی چووینە گوندێکی ترو لەوێ ئێمەی سپاردە ماڵێکی ناسیاوی، خۆیشی گەڕایەوە، بۆ سبەی شەو خاوەن ماڵەکە بەئوتومبێل ئێمەی گەیاندە (سەرکەپکان)، لەوێ لەماڵی دووەمی کاك غەفووری زاوای ئاوات دابەزین.. نانمان پێدراو پشوویەکمان دا، کاك غەفوور ماڵەکەی ئاوابێ دڵی دەداینەوەو دەیویست هەرچۆنێکە ترسەکەمان بڕەوێنێتەوە.. بەڵام هەر لەو شەوەدا مێردەکەی منو عوسمانی کوڕی لەژنەکەی پێشووی، وەك رەشەبا پەیدابوون، بەئوتومبێلێکی بەرازیلی هاتبوون.. کاك غەفوور کەوتە قسەکردن لەگەڵیانداو سوودی نەبوو، داوایانکرد ئێمە لەگەڵیاندا بگەڕێینەوە بۆ رانیە، نەماندەزانی چییان لەژێر سەردایە!

کاك غەفووریش بەدڵپاکی خۆیەوە تەسلیمی ئەوانی کردین.. سواری ئوتومبێلە سوورەکە بووین، یەکێکی تر لێی دەخوڕیو نەماندەناسی، باوکی عوسمان تفەنگێکی پێ بوو، ترس هەموو گیانی گرتمەوە، لەخۆم زیاتر دڵم لای ئاواتی کڵۆڵ بوو، لەوێ براینە ماڵێك کەمنو ئاوات نەماندەناسین، دووانیان رۆیشتنو مێردەکەی من بەخۆی وکلاشینکۆفەکەی دەستییەوە وەك پاسەوان بەدیارمانەوە مایەوە!

## ڕوو لەپڵنگان..!

جوانە پەرداخێ ئاوی دایە دەستی، ئینجا پرسی:

-ئەرێ نەتووت تەمەنیان چەندبوو.. مەبەستم مێردەکەت و ئاواتی خوشکەزایەتی؟

-مێردەکەم ٥٩ ساڵ بوو، ئاواتیش ساڵێ لەخۆم گەورەتربوو، نۆزدە ساڵ بوو... خانم وتی:

-ئێ کچی خێر لەخۆنەدیوم.. پاشان چی روویدا؟

-پاشان کوڕەکەی و خزمێکیان خۆیانکرد بەماڵەداو لەگەڵ مێردەکەم داوایانکرد لەگەڵیان بڕۆین... ئاوات بەترسەوە لێی پرسین(بۆ کوێ)، وتیان(کەسوکاری بێخاڵیش بەبیانوون.. تووڕەن لێتان، دوورتان دەخەینەوەو مل بشکێنن).

براینەدەرو سواری لاندگرۆزێك کراین، رووەو دۆڵی پڵنگان ڕاین، ئەو دۆڵە سەعاتە ڕێیەك لەرانیەوە دوورە... لەرێگا بێ دەنگ وکاس و خامۆش، جار جارە من و ئاوات لەیەکمان دەڕوانی، دەترساین.. لەچارەنووسی نادیارمان دەترساین... کەگەیشتین بینیم لاندگرۆزێکی سپیی تر لەقەراخ جادەکە وەستاوە، یەکسەر زانیم ئەوەی لەناویدایە(جەوهەر)ی خزمی خۆمە، ئەمان دابەزین و چوونە لای و کەمێ قسەیان کرد، پاش کەمێك جەوهەر بەخێرایی خۆی گەیاندە ئوتومبێلەکەی ئێمە، دەرگای کردەوەو پەلی منی گرت.. دەستمکرد بەگریان و ئەویش رایدەکێشام، وامزانی دەمکوژێ.. شاڵڵا بیکوشتمایەو نەجاتم بووایە.. توخوا لەم قوڕبەسەرییە باشتر نەبوو؟

جوانە زیاتر پێوەی نووسا، ئەژنۆی گیرکرد لەڕانی و وتی:

-ئێ بێخاڵ گیان... ئەو جەوهەرە چیکرد؟

-ئەو شەوە مانگەشەو بوو، بەرلەوەی بدرێم بەزەویدا، تەماشامکرد دووانەکەی تر پەلاماری ئاواتی بەستەزمانیان داو ئەویش داگیرا، من دەمزریکاندو زریکەم لەدۆڵەکەدا دەنگی دەدایەوەو سوودی نەبوو، هاوارم دەگەیشتە عەرشی پەروەردگارو سوودی نەبوو، دەتووت حەیوانێ رادەکێشێ، زۆر بێ رەحمانە پاڵیخستم، لەوکاتەدا(ئەمیر)ی ئامۆزاشم لەئوتومبێلەکە دابەزیو بەخۆیو تفەنگەکەی شانیو لایتی دەستییەوە لێم نزیك بووەو، تفەنگەکەی لەشان ترازاندو هەر دەمزریکاند، وامزانی دەمکوژێ.. ئەمیر وتی:

(ئەوە چییە کاك جەوهەر، تاقەتت پێی ناشکێ.. دەلێگەڕێ بۆ برات..) ئەوەی وتو چەقۆیەکی دەرهێنا.. نیشتە سەرم، وتی بیگرە جەوهەر.. دەموچاوی خەڵتانی خوێن کردم.. دەگریامو دەپاڕامەوەو دەلالامەوە.. سوودی نەبوو.. لەتاو ئازار بەری چاوم تاریك بوو، گوێم لە(ئامۆزا)بوو وتی(جەوهەر گیان توند بیگرە بابە بەتەواوی لوتی لێ بکەمەوە)..

کەوتم..خەریك بوو لەهۆشی خۆم دەچووم، گوێم لێ بوو لەولاترەوە خۆشەویستەکەی خۆشم هاوار هاواری بوو.. نەمدەزانی بەدەست کامیانەوەیەو چی لێدەکەن، هەر هاواری دەکردو بەو وەزعەی خۆمەوە خەریك بوو بۆی شێتو هاردەبووم. خوێن هەمووگیانمی سوورکردو هەردوو دەستم خستبووە سەر لوتم.. تەماشامکرد مێردە بەڕێزەکەم بێ دەنگ بەژوور سەرمەوە وەستاوەو تێمدەڕوانێ.. لەولاترەوە بینیم مامم کەباوکی ئەمیربوو تێمدەڕوانێ.. دوایی زانیم کە خاڵی ئاواتیشیان لەگەڵدابووەو ئەویش دەستی وەشاندوە!

## نەتککردنی ئاوات!

ئەو شەوە یەکجار درێژ بوو.. ژنانی سەنتەرەکە هەموو خەوتبوون، بەڵام بەسەرهاتی دوورودرێژی (بێخاڵ و ئاوات) کۆتایی نەهاتبوو، بێخاڵ وتی:

–لەدادگاش ئاوات قسەی خۆی کرد، ئەو دوای من قسەی کرد، پێی وتن.. ٣/١٧ بوو براین و بەو شەوە درەنگە ئاوامان لێکرا، کەبێخاڵ دەیزریکاند دەمخواست هەرچۆنێکە لەچنگیان رزگاری بێ و خواخوام بوو من بکوژن و هیچ لەو نەکەن.. زیاتر بۆ ئەو دەگریام... چەند هەنگاوێ دوور لەبێخاڵ منیش پاڵخرام و خاڵی خۆم چەقۆی لێ دەرهێنام. گیرام بۆی و کرکراگەی گوێی چەپی بڕیم.. دوایی کەسواری ئۆتومبێل کراین زانیم ئەویش لوتی بڕراوە!

هەروەها بەدادگای وت: خۆ خاڵم دەیزانی من و بێخاڵ دڵمان داوە بەیەکتر، کەچی بەوپیرییەوە هەر لەسەر قسەی خۆی سوربوو هێنای و ئێمەشیان بەو جۆرە ئەتك کرد..!

بێخاڵ بەچاوی پڕلەفرمێسکەوە بەجوانەو پورە خانمی وت:

–بەیەکێك لەئۆتومبێلەکان هێنراینەوە بۆ رانیە، لەرێگا بەچاو من و ئاوات جار جارە یەکترمان دەدواندو خوێنیش بەگیانماندا دەهاتە خوارێ، لەرێگا هەڕەشەمان لێ کرا، وتیان بەتەنیا ناوی جەوهەرو خاڵی ئاوات ببەن.. دەنا دەتانکوژین و لەسەر زەوی ونتان دەکەین..

هەروەها پێیان وتین: باش نییە بەئەتك کردن رزگارتان بوو، باش نییە بەلوت و گوێیەك دەرباز بوون.! کە گەیشتینە رانیە ویستیان نەمانبەنە نەخۆشخانەو دکتۆرێ پەیدا بکەن بۆ چارەسەرمان، بەڵام دەستیان نەکەوت،

بەناچاری براینە پەنا نەخۆشخانەکەو فڕێ دراین، ئەو شەوە چارەسەرمان بۆ کراو بۆ ڕۆژی دوایی ڕەوانەی نەخۆشخانەی سلێمانی کراین..

بێخاڵ سەری داخستو پاش کەمێك وتی:

– لە دوا قسەمدا بەدادگام وت" من تا ئێستا کچم.. ئێستاش کەمێردەکەم تەڵاقی داوم ئامادەم شوو بەئاوات بکەمو بەئاواتی دڵی خۆم بگەم..جوانە وتی:

–باشە بێخاڵ گیان: حوکم نەدران؟

بێخاڵ وەڵامیدایەوە:

با.. هەنەزاکەی خۆم دوو ساڵ حوکم دراو ئەوانی تریش هەندێکیان خۆیان شاردەوەو دوای سوڵحیش لەهەندەکەی تریان خۆشبووین..

خانم وتی:

–باشە بێخاڵ گیان، وتت تائێستا کچم؟

–بەڵێ، چونکە باوکی عوسمان لەبەر پیری بێ توانایی خۆی نەیتوانی کاری شەرعیم لەگەڵدا بکات..

لەو نیوە شەوە خامۆشەدا، بێ دەنگی باڵی بەسەر ژوورەکەو سەنتەرەکەی پاراستنی ژناندا کێشابوو، بەڵام هاوارو زریکەی شەوەکەی بەر لەنەوروزی دۆڵی پڵنگان، لەمێشکی پورە خانمو جوانەدا دەنگیان دەدایەوە.

هەرچەندە (دڵپاك) دەیویست دیمەنی ئاژاوەی نێومالەکەیان لەبەرچاو ون کاتو جنێوو کرداری ناپەسەندی باوکەکەی بەرامبەر دایکی بەدبەختی لەبیرخۆ بباتەوە، چەند ساتێك بەکۆششی ئەو وانەیەوە خەریك بێت کەکەوتبوو تیایداو وادەی تاقیکردنەوەی نزیك بوو، بەلاّم نەیدەتوانی و هەمیشە مێشكو دەروونی ورووژاوی لای دایکی بوو...

شەوێکی گەرمی چلەی هاوین، زۆربەی خوشكو براکانی لەتارمەو حەوشەکەدا بوون... لەتاو جنێوو قسە نابەجێیەکانی باوکی، بەناچاری (رونـاك)ی دایکی دەچووە ژوورەکەی و گەرمای ئەوێی لەدیمەن و هەڵسوکەوتی مێردە سەرلێشواوەکەی لاپەسەندتر بوو...!

کچەکەشی بەبیانووی سەعی کردنەوە دەچووە ژوورەکەی خۆی و خوشکەکانی، دەرگای لەسەر خۆی دادەخستو لەژێر پانکەدا کتێبی دەگرت بەدەستەوە... بەلاّم مێشکی هەر لای دایکی و سکالاّکانی بوو لەدەست باوکی و ئەو رۆژگارە رەشەی تووشی بوو بوو...

دڵپاك رۆژێ پێشتری کەوتەوە بیر، داچڵەکی، دیمەنی هەڵچوون و پەلاماری باوکەکەی هاتەوە بەرچاوو قسەو کروزاندنەوەی دایکە کلۆڵەکەی هاتەوە گوێ...

-نارەسەن، بوویت بەو ژنەی لەقسەی مندا هەڵبدەیتیّ و دەست بخەیتە کاری منەوە...

– ئاخر عەبدول تۆزێ هۆش بێنەرەوە بەرخۆت، تۆ بزانە ژیانی منو ئەم شەش منداڵەت چۆن کردووەتە دۆزەخ..

-حەیوان، چەنەبازی مەکە ئەگینا..

-ئەگینا چی، چیت لەدەست یەت درێخی مەکە، خوا بەو سەرەوە ـ گاداربێ، ئەمجارە کاول بووەکەت بۆ جێدێڵم‌و هیچ شتێك نامهێنێتەوە بەم مالەدا... کورە غیرەتت بێ... کورەتۆزێ پیاوبە، چیم وتووە، ئەڵێم کارو کاسبییەك بکەو ماڵ‌و منالتی پێ بەخێوکە..

-ئاخر بۆ نەمکردووە هەی هیچ‌و پوچ...ئەی چەند ساڵە کێ...

قسەکەی پێ بری، کورێکی ۱۲ساڵەیان هاتە نێوانەوە، ویستی هێوریان کاتەوەو باوکی بەشەپازلەیەك دووری خستەوە...

رووناك لێی نزیکبووەوە..

-ئەرێ وەڵلاً ماڵی باوکم نەبوونایە ئەمردین لەبرسانا... بەختی ئەو رۆژە سووتێ تۆی کردە نسیبی من...!

عەبدول تەواو شێتگیر بوو..دوای نەرەیەك پەلاماری ژنەی داو کەوتە لێدانی...دڵپاك‌و منداڵەکانی لەژێر دەستیان دەرهێنا..

باوکیان لەدەرگای حەوشەوە بەرەو کۆلآن ترازاو دایکی چارە رەشیش بەگریان‌و دوعا کردنەوە رووەو ژوورەکەی چوو..

ئەو شەوە، تا درەنگانێ خەو نەچووە چاوەکانی دڵپاك‌و، بەردەوام شەرەکەی دوێنێ‌و، شەرەکانی دیکەی باوك‌و دایکی لەبەرچاو بوو...

## ئاگرێک لەگەڵ بەرەبەیاندا

سەعات شەشی بەیانی بوو، دایك‌و کچ هەریەکەیان لەژووری خۆیان‌و عەبدول‌و منداڵەکانی دیکە لەحەوشە، هەموو خەوتبوون تەنیا رووناکی دڵشکاو نەبێ...

روناك لەژوورەكەی هاتە دەرو یەكسەر چووە بەردەم پەنجەرەی ئەو ژوورەی دڵپاكی كچی گەورەو هاوڕێی غەمەكانی لێی خەوتبوو...

تێی دەڕوانیو بەچاو پێی دەوت:

-قەینا كچەكەم، ئیتر دڵ مەنیٚ بەدڵمەوەو فرمێسك بۆ ئاژاوەی ئەم كاولبووە هەڵمەڕێژە... قەینا دڵەكەم، چیتر دایكت بەلێدان شلكوتی عومری ناكریٚو بەیەكجاری لەدەست باوكە دوا براوەكەت دوور دەكەوێتەوە...

هەناسەی ساردی هەڵدەكێشاو لەحەوشە لەنزیك فریشتە خەوتووەكانییەوە راما، هەنگاوێكی ناو بەچاوی تەڕو پرچی ئاڵۆزكاوو سیمای شێواوەوە بەسەر كوڕە بچكۆلەكەیدا چەمییەوە... هەردوو دەستی گرتو تێر تێر ماچی كردنو خستنیە سەر دڵەپڕ لەخورپەكەی..

-خواحافیزتان بیٚ هەناسەكانم...هەربەوتان دەسپێرم..

هەنسكی گریانی زیادی كردو كەس ئاگای لیٚ نەبوو.. دواجار بەرلەوەی بچێتەوە ژوورەكەی بە ڕقەوە روانییە عەبدول، لێوە وشكەكانی كەوتنە جووڵەو لەبەرخۆوە كەوتە قسە:

-رەبی ئاهونزوڵەم بگاتە ئاسمانو خێر لەخۆت نەبینی كەنەتهێشت منو ئەو منالاٚنە ئاسوودە بین...دەك گەردنت هەرگیز ئازاد نەبیٚو قەرزاری دنیاو قیامەتم بیت...

بەدەستێك شووشە نەوتەكەی هەڵگرتو بەدەستەكەی دیكەی شقارتەیەك، هەنگاوە قورسەكانی بەرەو ژوورەوە ناو پاش ماوەیەكی كەم زریكەو هاواری روناك بەرزبووەوە...

ئاگر بەربووە جلەکانی و گەیشتە سەر جەستەی، بەوێنەی باڵندەیەکی ڕامدارو بەوێنەی مناڵێکی بێکەس بێ ئۆقرە دەیزریکان و هاتەوە تارمەکە..

دڵپاك ڕاپەڕی و لەتارمەکە خۆی لەبەردەم ئاگرێکدا دیەوە...باوکیشی لێیان نزیك بووەوە...

-دایکە گیان.. دایە گیان بۆ وات کرد... پڕبەگەرووی هاواری کرد:

-ئەی هاوار دایکم سووتا...فریامان کەون وا دایکم مرد... ناڵەی بەرەبەیان خورپێن گەیشتە گوێی دراوسێ و منداڵەکان ڕاست بوونەوە.. دیمەنی ئاگری دایکی کەوتوو بەرچاوی ڕەش کردن...

دوو ژنە دراوسێ و پیاوێك هاتن و لەڕووناك نزیك بوونەوە، لەگەڵ دڵپاکی شپرزەدا کەوتنە کوژاندنەوەی...

یەکێکیان بەرەنگی پەڕیوەوە بەسەر عەبدولدا زریکاندی:

-خێرا ئوتومبێلێ پەیداکە، با بیگەێنینە خەستەخانە...

ئەویان بردو دوکەڵێك و بۆنی سووتاوی و منداڵە حەپەساوەکان لەماڵەکەدا مانەوە...

## کچم بۆ وات کرد؟

سەعات (٧) ی بەیانی بوو، یەکێك لەمنداڵەکانی ڕووناك ئەو هەواڵە جەرگبڕەی گەیاندە ماڵی باوکی. باوك و دایکە پیرەکەی بەشپرزەییەوە گەیشتنە خەستەخانە...

ڕووناك دەستی لەنێو دەستە گەرمەکانی دایکی دابوو... دایکی بەواقیی وڕماوەوە دەیڕوانیە جەرگی سووتاوی و هیچی بۆ نەدەوترا..

باوکیشی فرمێسك ریشە سپییەکەی تەڕ کرد، دوای خوێندنی دوعایەك چووە ژوور سەری کچەکەی‌و بەدەنگی نزمەوە پێی وت:

-کچم بۆ وات لەخۆت کرد، گوناهبار ئەبیت، بۆ رەحمت بەمنداڵە وردەکانت نەکرد؟

بەنوزەیەکەوە چاوە ماندووەکانی هەڵبڕی..

-بابە،خەتای عەبدول بوو... مردنم باشترە بابە گیان...

-ئاخر چەندم وت مەچۆرەوە لای..چەندم وت لەماڵی باوکی خۆت بەو مەچۆرەوە...

-لەبەر، لەبەر مناڵەکان چوومەوە.. باوکە زۆری لێدام، دڵپاك، دڵپاك ئاگادارە بابە...

ئەو رۆژە ١٩٩٧/٨/٢٠بوو... لەبەشی سووتان لەنەخۆشخانەی فریاگوزاریی سلێمانی چارەسەری روناك دەکرا، بەڵام بەرەو خراپتر دەچوو... ئەو بەرێژەی لەسەدا سەد هەموو لەشی سووتا بوو...هەر لەو ئەنجامەوە خوێنەکەشی تووشی ژەهراوی بوون بوو.. بۆ رۆژی دووەم قسەی نەماو تەنیا بەچاوەکزەکانی دەیڕوانیە رەنگی زەردی دڵپاك‌و فرمێسکەکانی باوك‌و دایکە پیرەکەی‌و...بۆ رۆژی سێیەم پێڵووی چاوەکانی لێك ناو لەگەڵ حەیف بۆ خواردن‌و وشەی خوالێی خۆشبێی کچان‌و ژنانی خەستەخانەو دوعاو نزایان لەپیاوەکەی‌و هەموو پیاوە خراپەکان، لاشەی بێنازی بەرەو ماڵ بەڕێ کرا..

لەسەر ئەو بەتاوانبار دانەنرا...

پاش ئەوەی روناکی ٣٥ساڵ بەیەکجاری گەیشتە گۆڕستانو سەفەری بێ گەڕانەوەی کرد، پۆلیس درێژەیدا بەلێکۆڵینەوەکانی خۆی، لەخەستەخانە قسەی روناك وەرگیرابوو، پێی وتبوون لەدەست مێردەکەی لەژیان هەلاّتووەو لەتاو ئازاری ئەو، جەستەی خۆی کردووە بەقەرە برووت...دواتریش قسەی کچەکەیو دایكو باوکی وەرگیرانو قسەیان برایە دادگا..

دادگا بڕیاری گرتنی عەبدولی دەرکرد.. گیراو خرایە زیندانەوە(ئەو لەلێکۆڵینەوەدا دووپاتی بێتاوانی خۆی دەکردەوەو مەرگی ژنەکەشی کاریگەرییەکی ئەوتۆی نەکردبووە سەر).

خزمێکی بووە کەفیلی تاوادەی دادگایی کردنی ئازاد کرا... بۆ بەخێوکردنو بەرێوەبردنیان، منداڵەکانی بردنە ماڵی باوکی...

رۆژی٣١/٥/١٩٩٨، دوای تێپەڕبوونی (٩)مانگو چەند رۆژێك بەسەر مەرگی روناکدا، گومان لێکراوو شایەتو شکات کەر برانە دادگا..

گومان لێکراو هەر عەبدول خۆی بوو...شایەت دڵپاکی دڵشکاوو و..

شکات کەر بەتەنیا پیرەژنەکەی دایکی روناك بوو...

*لەدادگا دڵپاك وتی:

باوکم پیاوێکی خراپە، توڕەیە.. ساڵێ زیاتر بوو لەگەڵ دایکمدا زۆر خراپ بوو...جنێوی پێدەداو لێیدەدا.. ئێمە بەیارمەتی ماڵی باپیرم دەژیاین، باوکم کاروکاسبی نەبوو، هەر لەسەر ئەوەش دایکی خوالێخۆشبووم تووشی دەمەقاڵێ دەبوو لەگەڵی..

*دایکی رووناك وتی:

پەیوەندییان خراپ بوو، دەستم بشکیٚ مانگیٚ بەرلەوەی خۆی بسوتێنیٚ بەهۆی گرفتی زۆریانەوە ماڵەکەی بۆ بەجێهێشتبوو وهاتەوە لای خۆمان، بەلاٚم بەهۆی هەرەشەی عەبدول و بۆ ئەوەی سەرلەشەش منداڵەکەی تێك نەچیٚ گەڕایەوە... هەردووچاوم کوێربیٚ خێری لەجوانیەکەی خۆی نەدی... من داواکارم مێردە تاوانبارەکەی سزا بدرێت...

*بەلاٚم هەرلەدادگا، هەرچەند باوکی رووناك دووپاتی هەمان قسەی ژنەکەی کردەوە، بەلاٚم لەداواکارییەکەی بۆ سزادانی عەولی زاوای پاشگەزبووەوە..

*عەبدولی گومان لێکراوی تەمەن ٤٢ ساڵ ئەوانی بەدرۆ خستەوەو گوتی:

نەخێر وانییە، من پەیوەندیم لەگەڵی باش بووەو بەڵگەش ئەوەیە درێژەمان بەژیان داوەو شەش منداڵم لێی بووە...

نەخێر کەسوکاری راست ناکەن...کچەکەی خۆیشم منداڵەو لەتاو مەرگی دایکی وادەڵیٚ...

نازانم بۆچی وای کردو چۆن دەستی چووە خۆی، من لەوەوبەر هەرگیز نەهاتوومە دادگاو پۆلیسخانەو هەرگیز تاوانم نەبووە..

تکا دەکەم لەبەر ئەو شەش منداڵە...لەبەر ئەو راستیانە بڕوام پێبکەن..

*پارێزەری داکۆکی کەریش بەرگریی لەعەبدول کرد...

*بەبڕوای دادگاش، هیچ بەڵگەیەکی یاسایی و ئیقناع کەر نەبوو کەئەو تۆمەتە بەسەر عەبدولدا ساغ بکرێتەوەو تاوانەکە خرایە ئەستۆی خودی روناك کەخۆی کوشتووە...

عەبدول بەیەکجاری ئازاد کراو گەڕایەوە لای منداڵەکانی...

## سووتانی بەردەوام

دڵپاك بەدڵی گەرم و ملی کەچ و دەروونی بێ روناکییەوە درێژە بەخوێندنی دەدات و هەموو جارێ بەسەرهاتی پڕلەکوێرەوەری و مەرگی دڵتەزێنی دایکی بۆ هاوڕێ و دەستە خوشکانی دەگێڕێتەوە...

ئەوانیش هەموو پێکەوە دڵ پڕلەکینەن بەرامبەر پیاوانی خراپ ودڵڕەق و، دەخوازن دنیایەکی باشتر بۆ مێینە بێتەدی...

ئێستاش و هەمووکاتێ، دوێنێ و ئەمڕۆ و سبەی، ژنان و کچانی ئەم ولاتە، گڕ لەجەستەی خۆیان بەردەدەن و بەجارێ ئاگر بەردەبێتە پێست و ئێسك و خوێن و گۆشتیان، ئاگر بەردەبێتە ئامانج و خەونەکانیان.. بەردەبێتە رازو قسەی دڵیان..

بەردەوام لەم کۆمەڵگایەدا، ئازاری ئەو بونەوەرە دەدرێ کەپێی دەوترێ(دایك، ژن، خوشك، کچ، هاوڕێ، کەس)و، ئازارەکە لەویستی مرۆڤ دۆستان زیاترەو ناکامی لەهیواکان گەورەترە...

لەباوەڕی کۆنی رزیوەوەبێ، یان لەدڵی پیس و دواکەوتووەوە، یان لەپیاو سالاری و دەستەلاتی زەبەلاحەوە، زۆر لەپیاوان و کوڕان و هەندێك لەژنان

خۆشیان دژبەو مەخلوقەن کەجوانییان لەتریفەی مانگ‌و جریوەی ئەستێرەو شەپۆلی دەریا و تاڵی تیشکی خۆرەوە وەرگرتووە.

ئەوانیش، بۆ ڕاگرتنی ئەو ڕقەو بۆ کپکردنی دەنگی چەوساندنەوەو بۆ کوێربوونی چاوە بەئافرەت هەڵنەهاتووەکان، لێرەو لەوێ گڕبەردەدەنە خۆ..

پرچ‌و ئەگریجەیان دەسووتێ کەبەیانیان لەگەڵ ئاوێنەدا نازیان بەسەریەکتردا دەکرد.. دەستەکانیان دەسووتێ کەنانیان پێ دروست دەکرد...

پەنچەیان دەسوتێ کەقەڵەمیان پێ دەگرت..

چاویان دەسوتێ کە تا بۆ دواجار لێکی دەنێن" بەشەرمەوە دەڕوانن..

هەناسەیان دەسوتێ کەهەرگیز ئۆخەییان هەڵنەمژیوە..

ناویان دەسووتێ کەلەجەنگەڵستانی بەشێکی(نێرینە)داجێگەیان نەبۆتەوە..

ژمارەیەکی یەکجار زۆر لەژنان‌و کچانی ئەم وڵاتەش، بەبێ ئەوەی ئاگر بەربێتە جەستەیان، ئاگر لەدەروونیاندا نێڵە نێڵێتی..بەر لەوەی لەشیان بسوتێ ئاگر لەمێشك‌و دڵ‌و چاویاندا بڵێسەی داوەو بەئاوی هیچ(سیروان)ێ ناکوژێتەوەو ناکوژێتەوە..

شـپرزەو نائـارام، تـەنیا هەناسـەیەکی خۆشـییان هـەڵ نەدەمـژی، دوای نەمانی دەنگە دەنگ‌و ورتەو بۆڵەی زیندانییەکان رادەکشان بنوون، بەڵام بێ سوود بوو، خـەو لـە چاویان نەدەکـەوت. ژووری بەندیخانـەش لەناوەڕاستی شوباتی ساڵێکی سەختی پڕ لەبەفردا چی گەرمی دەکاتەوە...

هـەردوو تاوانبـار(بـەکرو بـەختیار) بەبەتانییـە چـڵکن‌و کۆنـەکانیان خـۆ دادەپۆشن، چاو دەبڕنە یەکترو کەسیان ئەوی دیکەی بۆ ناخرێتە خەو... نیـوەڕۆی ئـەو ڕۆژە، یەکـەمجار بـەختیار بـوو کـەگوێی بـەدەنگی بڵنـدی سەرۆکی دادگا زرنگایـەوە کـەبڕیاری حـوکمی هەمیشەیی زینـدانی کردنـی خوێندەوە، ئینجا هەمان حوکم وەك ئاگر چزا بەگوێ‌و مێشکی بەکردا.

ژیانی تا مردن لەزیندان دا!... جا خۆ هـەر ڕۆژەی نیـوە مەرگێکەو بـەڵام ڕۆح چۆن دەرناچێت؟!!

جا ئیتر لەو شەوەدا ئەو دوو(هاوڕێ)یە چۆن بخـەون کەتـەنیا ٢٨بەهاری تەمـەنیان دیـوەو سـەرەتای لاوێتییـان بەدەسـتی خۆیـان هێنایـە نێـو دیوارەکانی زیندانەوە...! شەوێك‌و دووان‌و سیان... بەو شێوەیە کاس‌و بێ ئۆقرە بـوون، لەگـەڵ کەسێکی تـرا نـەدەدوان، جـار جـارە خۆیـان بـەخۆیان دەووت:

–بۆ وامان کرد؟

–چۆن شەیتان ئەمەی پێ کردین؟!

تـەنیا هیوایـەك کـە دڵخۆشـییەکی پـێ دەبەخـشین‌و تروسـکایی ژیانیـان پێوە دەبەست ناردنی(داوا)و بڕیارەکانی دادگای سلێمانی بوو بۆ دادگای (تەمیز) لەهەولێر، ئومێدێکیان بەوە بوو ئەو دادگایە حوکمەکەیان بگۆڕێ،

ـیان وت: کێ ئاڵێ حوکمەکە نابێتە(١٠)یان (٥)ساڵو پارەکەشمان لەسەر دەنەچێت؟! کێ ئاڵێ؟! بەڵام چاوەڕوانی تاڵە، بەتایبەت چاوەڕوانی کردنی مرۆڤ لەبەندیخانەدا.

## ئەو ڕۆژە لەدادگادا چی وترا؟...

کە دادگایی گومان لێکراوان بەکرو بەختیار کرا ڕۆژی ١٩٩٤/٢/١٩ بوو، ئەوان (٣)مانگو نیو بوو بەتۆمەتی کوشتنی هاوڕێیەکی خۆیان دەسگیر کرابوون و بوو بوونە میوانی ئەو ژوورە تەنگەی خەوی لەچاوانیان زڕاندبوو، بەر لەوەی هەردوو لاوی لەقەفەز کراو بدوێن بابزانین هەردوو جەرگ سووتاو باوك و دایك)ی (شیروان)ی ٢٦ ساڵ تەمەن و خێر لەخۆ نەدیو وتیان چی؟

-باوکی شیروان وتی:

بەفەرمانبەری و دەست کورتی کوڕەکەم گەورە کرد، هێشتا بەبینینی منداڵی خۆی شاد نەبوو بوو کەڕەوانەی مەرگ کرا، گەورەکانم، شیروان ماڵی جیا بوو، سەرەتای مانگی تشرینی یەکەمی ١٩٩٣، بوو بە(٣) ڕۆژ سەری لێنەدام و منیش کەوتمە مەراق و چوومە ماڵەکەی، ئەم بووکی حازرییەم وتی(مامە گیان بەسرپێری شیروان لەگەڵ بەکری خزمی خۆتاندا بۆ ڕاوەماسی چوونە شارباژێر، نازانم بەتەواوی کوێیان وت، بەلاّم تفەنگە(ئاڕ،بی،کەی)یەکەشی لەگەڵ خۆیدا برد... بۆ سبەینێ سۆراغی بەکرم کردو دۆزیمەوە، وتم کوانێ شیروان؟ وتی ئاگام لێی نییەو لەگەڵ مندا نەبووە! بەجارێ دڵم کەوتە مەراقەوە. کە دووەم جار لەگەڵ کەسوکاردا

چووینەوە سەری و بەزمانێکی تر قسەمان لەگەڵ کرد، بۆی باسکردین و وتی:

من و شیروان و هاوڕێیەکی ترمان کەناوی بەختیارە بەناوی راوەماسییەوە چووینە نزیك سنوور، بەلأم لەراستیدا بۆ راوو رووت چووین، لەوێ تەقەمان لێ کراو شیروان بەرکەوت و ئێمەیش لەترسدا رامان کردو جێمان هێشت، لێم پرسی: ئەی کوانێ بەختیار، بەکر وتی: من گەڕامەوە سلێمانی و ئەویش وا لەماڵی برایەکی لەگوندێکی ئەو ناوە... ئەومان لەگەڵ خۆبردو چووین بەدوای بەختیارداو لەوێوە هەر خۆیان بردیانینە گوندی( ئاشی بارام)و لەناو کۆمەڵێ دارو درەخت نزیك چەمێ کەشوێنی رووداوەکە بوو شیروانمان بەمردوویی دۆزییەوەو بۆنیشی کردبوو، تفەنگەکەی هەر لەتەنیشتییەوە بوو، لاشەکەی هێنرایەوە سلێمانی و دوای فەحسی نەخۆشخانە کفن و دفن کرا... ئەم دوو تاوانبارە لەسەرەتادا ئینکاری تاوانەکەیان کرد، بەلأم کە پۆلیس کەوتە لێکۆڵینەوە دانیان بەتاوانە چەپەڵەکەیاندا نا ،من داوا دەکەم سزا بدرێن و خوێنی شیروان بەفیڕۆ نەڕوات...

-دایکە ٤٦ساڵەکەشی بەچاوی فرمێسکاوییەوەو بەدەنگی نزم وتی:

بەر لەوەی بروات بە(دوو) رۆژ هاتە لام و وتی دایکە دەچمە راوەماسی، وتی لەگەڵ بەختیارو بەکردا دەچم، وتم بەقوربانت بم ئاگات لەخۆت بێ، وتی بێ خەم بە دایکە گیان، دایکی لاڵ بێ ئیتر ئەو رۆیشتنە بوو نەمان دییەوە، ئەم دووانە کوشتیان، نازانم بۆ...بۆ وایان کردو جەرگیان سووتانم، رۆڵە رەبی خێر لەجوانی خۆتان نەبینن...!

-ژنه ٢٤ ساڵەکەی شیروانیش بەدادگای وت:

بەڵێ وابوو بەکر هات بەدوایدا، لەناو قاپییەکەدا چرپە چرپیان کرد، نەمزانی باسی چی دەکەن... ئیتر ڕۆی و نەگەڕایەوە... من داواکارم بەسزای خۆیان بگەن و ئۆباڵی ژیانی من و...(شەرم گرتی و قسەکەی لەقوڕگدا خنکا، تومەس دەیویست باس لەو کۆرپەیەی بکات کەشیروان نەیبینی و خۆیشی جارێ نایناسێ...)

## گەشتە سێ ڕۆژییەکەی هەر سێهاوڕێ..!

دوای ئەوەی کەسوکارەکەی جوانەمەرگ قسەی خۆیان کرد، بەختیارو بەکر کەوتنە گێڕانەوەی بەسەرهاتی گەشتەکەیان، هۆڵەکە بێدەنگ و هەموو چاوەکان دەیانڕوانییە هەردوو قسەکەری تاوانبار.. بەڵام هەردووکیان لەبەشێکی قسەکانی لەوەوبەری لێکۆڵینەوە پاشگەزبوونەوەو ویستیان خۆ لەو تاوانە دەرباز بکەن کە نامەردانە لەگەڵ هاوڕێی خۆیاندا کردبوویان...

*سەرەتا بەختیار وتی:

-شیروان بەهۆی بەکرەوە بووە هاوڕێم کەخزمی یەکتر بوون، هەرسێکمان ڕێکەوتین کەبۆ ڕووتکردنەوەی خەڵکی بچینە ناوچەی شارباژێڕو نزیک ناوچە سنوورییەکانی ئێران، هەموومان چەکی خۆمانمان پێ بوو، شەوی یەکەم بەخت نەیکرد و هیچمان دەستنەکەوت! شەوی دووەم خوا ناردی و(٣) کوردی ئەودیو بەچوار هێستر بارە ناردەوە پەیدا بوون، دەنگمان لێ کردن و پەلامارمان دان، شیروان یەکەم کەس بووە کەمیلی لێ هێنانەوە، ئیتر ترسان و خۆیان دا بەدەستەوە، دوای ئەوەی دەست و

قاچیانمان بەستەوە هەموو گیانیان گەڕاین، بەلاّم تەنیا دوو سەعاتی دەستیانو هەندێ تمەنمان لێ هەڵکراندن، هەروەها ئاردو هێسترەکان، لەگەڵ یەك هێستردا ئازادمان کردنو لەوناوە دوور کەوتنەوە، هەر لەویا ئاردەکەمان جێهێشتو بەهێسترەکانەوە چووینە ناوچەی (ئاشی بارام)و تاعەسری سێیەم رۆژ لەوێ ماینەوە، لەعەسردا هەندێ لەچەکدارەکانی عەلی ئاغا تەقەیان لێکردینو شیروان بەرکەوت، ئیتر من رامکردو چوومە ناوچەی (خامانە)و لەوێ هەفتەیەك لەماڵی کاکم مامەوە، دیارە بەکریش چوو بووەوە سلێمانی، ئەوە بوو باوکی شیروانو بەکرو هەندێکی تر لەشارەوە هاتنە لای ئێمەو هەموو کەوتینە سۆراغی شیروان، لەشوێنی رووداوەکە بەمردوویی دۆزیمانەوە... بەلاّم ئێمە نەمانکوشتووەو ئاگامان لێی نییە چۆن مردووە...!

*-بەکر، بەهەمان شێوەی بەختیار بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە، یان بلّێین بەسەرهاتەکەی وەك ئەو بەنیوە ناچڵیو ناتەواوی گێڕایەوە...

### پارێزەری شیروان بەڵگە دەخاتە روو..

پارێزەری بەرێز، کە لەلایەن کەسوکاری شیروانەوە بۆ بەرگری کردن لەخوێنی شیروان راسپێردرابوو، بەهێمنییەوە کەوتە قسەو بەدادگای وت:

-هەرچەندە هەردوو گومان لێکراو راستو رەوان لەلێکۆڵینەوەی سەرەتایی پۆلیسو دادوەردا دانیان بەوەدا ناوە کەخۆیان شیروانیان کوشتووە، وا ئەمڕۆ پاشگەز دەبنەوە لەقسەی خۆیانو دیارە هیچ بایەخێکی یاسایی نادرێ بەو جۆرە پەشیمان بوونەوەیە، بەلاّم بەڵگەیەکی

ـیکـەمان بەدەسـتەوەیە کـەهیچ لێکدانەوەیـەك هـەڵناگرێ‌و تاوانبـارێتی هەردوو ناوبراو دەسەلمێنێ، ئەویش راپۆرتی پزیشکە کە لەکاتی فەحسی لاشەی کوژراوەکەماندا نووسیویە:

-دوای زامـدار بـوونی دوو فیـشەك نـراوە بەسـنگییەوەو یـەکیان ەپشتییەوە دەرچووەو ئەوی دووەمیان لەناو لەشیدا ماوەتەوە، ئەمەش ەدیسەلمێنێ کەبەجیاو لەمەودای جیاوازەوە تەقەیان لێکردووە، لەئەنجامی ئەو دوو فیشەکەدا کەجگەرو سییەکانی پێکاوە تووشی خوێن بەربوونی زۆر بووەو گیانی لەدەست داوە... ئەمانە هەمووی بەڵگەن‌و وێڕای ئەمانەش لەوکاتـەدا کـەبۆ شـیروان گـەڕاون بـەکر لەخۆیـەوەو لـەدەمی دەرچـووەو وتویـەتی: شـیروان خـوا لێیخۆشـبێ... گـەر نـەزانێ کـوژراوە چـۆن وای وتووە؟!!

## بڕیاری دادگا

١- بڕیـاردرا بەزینـدانی کردنـی هەمیـشەیی هـەردوو تاوانبـار بەختیاروبەکر.

٢- دەسـت گـرتن بەسـەر چـەکەکانیاداو رەوانـە کردنـی بـۆ وەزارەتـی کاروباری پێشمەرگە.

٣- دەبـێ هـەردوو تاوانبـار بـڕی ١٥٠هـەزار دینـار دوای رەزامەنـدی دادگای تەمیز لەقەرەبووی خوێنی شیرواندا بەم شێوەیە بدەن:

یەکی ١٥هەزار دینار بۆ دایك وباوكی كوژراوەكە، ٧٠هەزار دینار بۆ ژنەكەی شیروان، ٥٠هەزار دیناریش بۆ ئەو منداڵەی كەلەسكی ژنەكەی شیرواندایە،وێڕای ئەو حوكمانە، زۆربەی شەوان شیروان هەر بە كفنە سوورەكەی خۆیەوە، دێتە خەوی جووتە تاوانبارو دەست دەنێتە ملیان.
هەناسەسوارو پەرێشان شەڕ لەگەڵ مەرگدا دەكەن و لەخەو رادەپەڕن.!
بەڵام "خەون" مێردەزمەی ژیانیانەو هەموو شەوێ نیوە مەرگیان دەكات!!

رۆژی (٤/٥) یەکەمین رۆژی جەژنی قوربان بوو، نزیك سەید سادق، لەو دەشت و قەدپالآنەی شارەزووردا، قوربانییەکی دەستی جەورو زوڵم و تاوانی خۆمان لەچاڵێکدا دۆزرایەوە کە بەمردوویی خۆڵ و بەردکرابوو بەسەریا... کاتێ غەریب و چەند کەسێکی گوندی(کێڵەکەوە) گەیشتنە ئاستی چاڵەکە، یەکێکیان بانگی کردە غەریب:

–ئا، ئەمە لاشەیەکە.. وەرن باسەیری کەین بزانین خاڵۆ حەمە نییە...

هەر کەبەردو خۆڵ لەسەر رووی لابرا غەریبی ٣٥ساڵ بەهەردوو دەست کێشای بەسەریاو هاواری کرد:

–ئەی هاوار، خۆ ئەمە باوکمە...

ئەو بەگریان و هاورێکانی بەدڵدانەوەی و لابردنی خۆڵی سەرجەستەی قوربانییەکەوە خەریك بوون... لاشەکە هێنرایەوە گوندو شادیی ئەو جەژنە بووە شین، ژن و پیاوی گوند بەجارێ خەمبار بون بۆ مەرگی لەناکاوی شوانە دەم و دڵ پاکەکە، ئەو شوانەی مێژووی ژیانی وەك رەگی درەخت بەکێڵەکەوەدا رۆچوو بوو...

خاڵۆ حەمە، خاوەنی ژنی خۆی و چەند کوڕی گەورەو ژمارەیەکی زۆر مەڕو بزن بوو، بەیانیان زوو رانەکەی دەدایە پێش خۆی و بەکەیف و دڵشادییەوە لەئاوایی دوور دەکەوتەوەو ئێواران لەگەڵ خۆرئاوابووندا دەگەڕایەوە، کەچەند سەرە مەڕو بزنەکانی خەڵکی گوند لەڕانەکەی جود دەبوونەوەو هەریەك رووەو دەرگای ماڵ و گەوری خۆیان ملیان دەنا ئەم بەسلاوو زەردەخەنەوە دەیڕوانییە خاوەنەکانیان.. دەشێ ماوەیەکی زۆری

ئەم سەردەمی ئازادییە بووبێت، خەڵکی گوند مەرگی خۆشەویستی وەکو خاڵۆ حەمەیان نەدیبێ..

## شوفیرێک.. بکوژەکە دەگوێزێتەوە...!

ساڵحی شوفێری خاوەن گەڵلابەکە لە ئۆردوگای (صمود) نیشتەجێ بوو، چەند رۆژێ دوای کارەساتی مەرگی شوانەی بێ تاوان، هەر لە صمود بەدادگا دەڵێ: بەڵێ حەمەتاڵ و ژمارەیەکی زۆر لەحەیوانەکانم گواستەوە، ئەو لەنزیك سەید سادقەوە بە (٢٠٠) دینار بەکرێی گرتم تا بیانگەنمە صمود، کە گەیشتن و دامبەزاند دەبینم پارەی پێ نییە، وتم کاکە چۆن وادەبێ؟ ئەویش وتی: قەیدیی نییە، فەرموو سەرێ مەڕ ببە لەجیاتی کرێیەکە... دواتر کوڕەکانی ئەو خاڵۆ حەمەیە هاتن و کە زانییان من حەمەتاڵ و حەیوانەکانم گواستۆتەوە لەبەردەم پۆلیسدا ئاگاداریان کردم کە ئەو حەمەتاڵە بکوژی باوکیانەو بەهاوکاری برادەرێکی بۆ دزینی رانە مەڕو بزنەکە ئەو تاوانەیان کردووە... دواجار ساڵح بە دادگا دەڵێ:

– لەخوا بەزیاد بێ هێندە نابات حەمەتاڵ و برادەرەکەی دەگیرێت و پەردە لەسەر رووی تاوانەکەیان لەلایەن خۆیانەوە دادەماڵرێ...

## غەریب، ئاوا لە مەرگی باوکی دوا..

غەریبی خاڵۆ حەمە، رۆژی ١٩٩٢/١١/٩لەسلێمانی و لەکاتی دادگایی کردنی هەردوو بکوژی باوکەکەیدا بەم شێوەیە قسەی کرد:

–من بەچاوی خۆم تاوانەکەم نەدیوە، بەڵام سەرلەئێوارەی ٤/٤باوکم دیارنەبوو، بووە شەوو خۆی و رانەکەی دیارنەبوون، لەچەند سەرێکی

حەیوانەکان بەو لاوە ئەوانی تر دەرنەکەوتن، شەو خەو نەچووە چاوم..
باوکم زۆر گوناه بوو، خۆشەویستی هەموو ئاوایی بوو، ئەو شەوە دایکم نەخەوت و هەر دەیووت: دیارە، دیارە کوژراوەو ئەمشەو لاشەکەشی دەخورێ...

بەیانی زوو کەلەگەڵ هاورێکانمدا چووینە سۆراغی، ئەوە بوو لاشەکەیمان دۆزییەوەو بینیمان کوژراوەو بێ رەحمانە بەدار سەرو گوێلاکیان هێنابووە خوارو دواتریش کە بردمانە خەستەخانەی سلێمانی دکتۆریش هەر وای وت... لەکوێ(١٢٧)سەر مەڕو بزنەکە تەنیا چەند سەرێکیان لەو ناوە مابوو، کەکەوتینە گەڕان و پرسیار کردن لەصمود تاوانبار حەمەتاڵمان دۆزییەوەو ئەویش ناونیشانی(بەختیار)ی هاوکاری پێ وتین کەشەریکە کوشتن و شەریکە دزی بوو، ئەوە بوو هەردوو گیران و دانیان بە تاوانە دڕندانەکەیاندانا... ئەمڕۆ دایکم و براکانم نەهاتوونە ئەم دادگایە هەرچەندە ئاگادار کراون.. ئێمە لەگەڵ هەردوو تاوانبار ڕێ کەوتووین و دژیان شکاتمان نییەو داوای قەرەبووی حەیوانە بزربووەکانیان لێ ناکەین...

(بەم چەند رستەیەی دوایی غەریب، ئامادەبووانی دادگا سەرسام بوون چۆن لەخوێنی باوکیان خۆش دەبن، ئەی بۆ لەمەڕو بزنە دزراوەکانیان ناپرسن؟)

بەڵام هەرچەندە ژیان پڕلەسەیرو سەمەرەیە، ئەی دادگا بڕیاری چی بدات؟!

## حەمە تاڵ چۆنێتی تاوانەکەی دەگێڕێتەوە...

هـــەر کـــە لەصـــمود دەگیرێـــت لای پـــۆلیس و پاشـــان لای دادوەری لێکۆڵینەوەو دواجار لەبەردەم بەرێز سەرۆك و ئەندامانی دادگادا حەمەتاڵی دزو پیاو کوژ دەڵێت:

-من خۆم خەڵکی کەلارم، بەختیار هاوڕێمەو لەسەید سادق دادەنیشێ، بینیم و داوای لێکردم پێکەوە هەندێ حەیوان بدزین و بیانفرۆشینەوە، ئەوە بوو رۆژێ بەرلەجەژن پێکەوە چووینە ئەو دەشتەو سەرو دارمان پێ بوو، ئەو چەقۆیەکیشی پێ بوو، وامان نیشان دەدا کەبۆ قارچك دۆزینەوە دەگەڕێین، لەو ناوە شوانەکەمان بینی کە خەریکی لەوەڕاندنی ژمارەیەکی زۆر مەڕو بزن بوو.. بەقسەوە خەریکمان کردوو لەقسەکاندا شوانەکە بەبەختیاری وت:

-من دەتناسمەوە، باوکت بەر لە(٥) ساڵ لەنزیك گوندەکەی ئێمە کوژرا..

بەڵام بەختیار وەڵامی دایەوە:

-نەخێر،هەڵەیت، من کوڕی ئەو نیم.

دوای کەمێ، من چەند مەترێ لێیان دوور بووم بینیم بەختیار بەدارەکەی دەستی کەوتە سەروگوێلاکی شوانەکەو ئەویش کەوت و لەهۆش خۆی چوو، من لێم نەداو بەڵکو سەرزەنشتی بەختیاریشم کرد، بەڵام سوودی نەبوو، بەدارو بەرد دەیکێشا بەسەریا تا مردو ئیتر خستمانە چالێکەوەو دامان پۆشی، ئەوەی بۆمان برا لەحەیوانەکان بەشمان کردو جیابوینەوە..

*کەسەرۆکی دادگا لێی پرسی:(بەڵام لەکاتی لێکۆڵینەوەی سەرەتاییدا وتووتە منیش لێم داوەو بەهەردووکمان کوشتوومانە).

حەمەتاڵ وەڵامی دایەوە:

-ئاخر گەورەم لەترسی ئازاردانی پۆلیس ئەوەم وت.. گەورەم کاتێ بەختیار هەر لێی دەدا پێم وت: دەبەسە کافر، دەوازی لێبێنە...بەڵام ئەو وتی:

-دەمناسیێ، گەر راست بێتەوە بەگرتنم دەدات..

*بەڵام کەبەختیار دوای ئەو کەوتە قسە. وتی: درۆ دەکات، ئەویش لێی دا، منو حەمەتاڵ پێکەوە کوشتمان.

## بڕیاری دادگا...

رۆژی ناوبراو، واتە ١٩٩٢/١١/٩دادگای جنایاتی سلێمانی لەدادگایی کردنی هەردوو تاوانبار بڕیاری دا:

١-زینـــدانی کردنـــی هـــەردوو تاوانبـــار حەمـــەتاڵو بـــەختیار بەهەمیشەیی(مؤبـــــد)لەبەر ئەوەی هێشتا تەمەنیان ٢٠ساڵی تەواو نەکردووە(واتە ئەو کاتەی تاوانەکەیان ئەنجام داوە).

٢-بۆ کەسوکاری خاڵۆ حەمە هەیە(ئەوانەی دەستبەرداری خوێنەکەی نەبوونو لەتاوانباران خۆش نەبوون، داوای قەرەبوو لەدادگادا لەسەر هەردوو تاوانباری ناوبراو تۆمار بکەن.

بەدرێژایی رێگا(ئەمین) قسەیەکی لەگەڵ خوشکەکەی نەدەکرد، ئەویش بەردەوام تەماشای دەرەوەی دەکردو تاس دەیبردەوە...(خومار) دەیویست لەکاکی بپرسیّ:

–تۆ بڵێی هەروا زوو لەسنوور رەت بین؟

–ئاخۆ لەویّ کەمال رازی دەبیّ منداڵەکانم بداتەوەو خۆم بەخێویان بکەم...!

دەموچاوی گرژی براکەی وشەکانی لەگەروویدا دەخنکاندو رووی بەلای پەنجەرەی ئوتۆمبیلەکەدا وەردەگێڕایەوە...

کەگەیشتنە گوندی (گلیجاڵ)ی سەر بەمەیدان دەمەدەمی نیوەڕۆ بوو، لەئوتۆمبیل دابەزین‌و بەبیّ قسە ئەمین دەستی دایە جانتای خوشکەکەی‌و بەرەو دەشتاییەکە کەوتنەڕیّ..

هەورێکی کەمی ناوەڕاستی پایز ئاسمانی گرتبووەوە، خومار قەستی بوو بارانیّ داکات‌و سیماو دەروونی گەرمی پێی تەڕبیّ... چی دی خۆی بۆنەگیراو پرسی:

–کاک ئەمین ئەم رێگایە بۆ کوێمان دەبات؟ چەند بڕۆین دەگەینە ئۆتۆمبیلەکان کەخەڵکی دەگەیێننە ئەو دیو؟!

سەرەتا هیچی وەڵام نەدایەوە، پاش کەمێك دەنگی ئەمین(خومار)ی وریا کردەوە، ئەمین وتی:

–ئەی پێم نەگوتی برادەرەکەم شارەزایەو چاوەڕێمان دەکات‌و ئەو لەگەڵ خۆی دەمانبات!..

دەڕۆیشتن‌و خومار لەگەڵ خۆیدا گەڕایەوە بۆ دووسیّ رۆژ لەوەوبەر، بۆ ئەو کاتەی لەماڵی دایکی بڕیاری ئەم سەفەرەی خوشکەکەی داو هەر لەبەر چاوی دایکیدا پێی وت:

-هەرگیز ژیانی ئێرە دادت نادات... تۆ نازانیت خەڵکی ئێرە چەند زاڵمن، ترسی خوا لەدڵیاندا نییە، تۆ... ئافرەتێکی بێوەژن و گەنج و جوان.. لێرە بمێنیتەوە هەر خوا خۆی دەزانی چیت پێ دەڵێن و چیت بۆ دروست دەکەن...!

ئینجا دایکی و قسەکانی بیرکەوتەوە کەپێی وت:

-کچم، کاکت راست دەکات، بەهیوای چی لێرە دەبیت، گەر دڵت بەو مەریوانە رەزاگرانە خۆشەبتهێنێ ئەوا بەهەڵەداچووی، کچی خۆم ئەو هەتیوە بوو حاڵی لێ تێکدایت و لەماڵ و مێردی خۆتی کردیت... ئەگەر ئەو بێ نامووس نەبووایە نەدەبووە درکی مەموزین و ژیانی لەتۆو کەماڵی باوکی چوار منداڵت تێك نەدەدا.. خۆ بێ شەرەفە خزمی مێردەکەت بوو... خۆ ئێوە بەمیوانی هاتبوونەوە، ئاخر چۆن لەخوا نەترسا..ئاخر تۆش چۆن بەڵێنت پێیدا شووی پێ بکەیت و چۆن دڵت دایە هەی سەرت لەقوڕنێن!

دەنگی ئەمین بەئاگای هێنایەوە.. ئەمین وتی:

-خومار، بالێرە کەمێ دانیشین... سەرمات نییە، گەر سەرماتە ها قەمسەڵەکەی خۆمت بدەمێ... وەعدمان ئێرەیە و باچاوەڕێی هاوڕێکەم بین..

خومار نزیك براکەی دانیشت و یەکسەر وتی:

-رەبی خوا دەست بەعومرتەوە بگرێ.. کاکە گیان بەعەقڵی تۆ کەی دەگەمەوە سوید؟.. تۆبڵێی بەمنداڵەکانم شادبمەوە... باشە بڵێی کەماڵ رازی بێ بمباتەوە لای خۆی؟... خۆ لەوێ بەجۆرێکی ترەو ژن و مێردی لەیەکتر جیابوەوە دەتوانن پێکەوە بژینەوە.. ئەوێ وەك ئێرە نییە..

## خۆت بەخۆتت کرد..!

ئەمین تەماشای خوشکەکەی دەکردو دەروونی بڵێسەی ئاگربوو تاوی دەدا... ناخی هەموو رق بوو بەرامبەری.. جگەرەیەکی داگیرساندو بیری چووەوە بۆ ئەو ساتە تاڵەی کەماڵی زاوای باسی خوماری بۆ کردو پێی وت:

-کاك ئەمین، بڕوا بکە لەچاوم خۆشترم دەویست، ئاخر کەسێ ژنەکەی خۆش نەوێت چۆن دەهێڵێ چوار منداڵی لێی ببێو چۆن دەتوانێ لەگەڵیا درێژە بەژیان بدات، کاکەمین بەسەری تۆ قەسەتەم ماوەی ساڵێکە تەواو گۆڕراوە، ساڵێکە بووەتە بنیادەمێکی ترو خومارە رەوشت جوانەکە نەماوە...بەڵێ... لەوێ ژیان جیاوازە، بەڵام خۆنابێ ئافرەت گوێ بەهیچ نەدات و مێردەکەی بەپەرۆ بزانێت...

-چیت لێ دیوە؟

-بەچاوی خۆم هیچم نەدیوە، بەڵام ئاگادارم حەز بەناسینی خەڵکی دەکات، دەچینە سەیرانێ...بازاڕێ.. ئاهەنگێ... یەکسەر یەك دوو ژمارەی تەلەفۆن لەکوڕە کوردەکان وەردەگرێو دەبینم پاشتر قسەیان لەگەڵدا دەکات... جارێك پێم وت من بەمە رازی نابم، کەچی پێم دەڵێ(بێ عەقڵ، ئێرە ستۆکهۆڵمە، ستۆکهۆڵم، خۆ لای خۆمان نییە!)...

ئیتر عەیبەوچی تر بڵێم...

-باشە چیت بەدایکم وتووە... ئەو وتی کەمال لەم سەردانەوەیەدا لەخومار بەگلەییە، تۆ خوا چیت بەدایکم وتووە؟

-من هیچتان لێ ناشارمەوە، دەبێ بزانن بۆچی تەلاقی دەدەم... خۆشێت نەبووم، خۆ هار نەبووم.. هەیە دڵی بێت لەخومارێ دابڕێ کەجوانیەکەی گیرۆدەی کردبێ... منێك کەچەند ساڵە نازی دەکێشم... کاکە گیان،

کەهاتینەوە من دەمویست لەگەڵ ئێوە ئامۆژگاری بکەین... لەگەڵ ئێوە بیخەینەوە سەر ڕێگای ڕاست، بەڵام ئەو دەستی لەگەڵ مەریوانی ئامۆزازام تێکەڵ کرد... من خۆم بەمەریوانم وت چاودێری بکات، چاودێری ڕەوشت و هەڵسوکەوتی بکات، کەچی خومار خان بەڵێنی داوەتیٚ شووی پیٚ بکات... مەریوان خۆی بەبراکەمی وتووە ماچی کردووەو خۆشیویستووە، کەخۆشم لێم پرسیەوە وتی شێت و شەیدای یەك بووین، وتی تەلاقی بدەو دەیهێنم...

## منداڵەکان بەش دەکەین...!

ئەمین ژانە سەری لیٚ پەیدا بوو، چی دی دانی بەخۆیدا بۆ نەگیرا... چاوەڕوانیی هاورێکەشی زیاتر سەری کردبووە پورە هەنگ و خەریك بوو ئۆقرەی لیٚ دەبڕا...

بەدەنگی بەرز لەخوشکەکەی پرسی:

–باشە ئەو هەتیوە، ئەو مەریوانە نیازی چی هەبوو؟..

خومار وەڵامی بۆ نەدرایەوە، تووڕەبوونی براکەی تەواو رایچڵەکاند... ئەمجارە بەدەنگی بەرزتر لێی پرسی:

–چەتیو بۆ قسەناکەیت.. دەزانم دەستت لەگەڵیا تێکەڵ کردبوو... خۆی باسی کردبوو... دەزانم نیازت بوو شووی پیٚ بکەی، هەر بۆیە مێردەکەت تۆی لەبەرچاوکەوت وسیٚ بەسیٚ تەلاقی دایت!...

خومار بەزمانێکی پچڕ پچڕو بەدەنگێکی نیمچە نووساوەوە کەوتە قسە:

–من هیوا بڕاو بووم، کەمال لەگەڵمدا خراپ بوو... لێرەش و لەدەرەوەش هەر دڵی پیس بوو.. هەرگیز باوەڕی پێم نەبوو...

–باشە ئەو سەگبابە بەڵێنی چی پێدایت؟

-وتی دەتهێنم و منداڵەکان لەگەڵ کەماڵدا بەش دەکەین، دووانیان بۆ ئەوو بابیانباتەوەو دوانەکەی تریش بۆ خۆمان، هەروەها وتی: بەهۆی ئێوەوە منیش دێمە سویدو لەوێ ژیانی پڕ لەبەختەوەری بەسەردەبەین...

-ئاخر بێ ناموس، کێ هەیە مێردی هەبێ و حەز لەکەسێکی تر بکات... چیت پێ وتراوە راست بووە، خەڵك تفەنگ بەتاریکییەوە نانێن... مێردەکەت لەسەر هەقەو تۆمایەی ئابڕووچوونی بۆ ئێمە... تۆ بوویتە هۆی شەرمەزاریمان... تۆ شانت ئارداوی کردین... هەرچییەکت بەسەربێ خۆت بەخۆتت کردووە...

خومار بەتەواوی ترسا.. گەر جووتێ باڵی ببوایە لەشەقەی دەداو بەسەربەستی ئاسمانی تەی دەکردو هەموویانی جێ دەهێشت...دەڕۆی... دوور دوور دەڕۆی... دوور لەکەسوکارو خەڵکی.. یەکجار..یەکجاردوور...

خومار فرمێسکی سەرگۆنای سپی دەسڕی و ئەمین بەرزە پێ راست بوەوە...هاوڕێکەی بەدی کرد... قەمسەڵەکەی لەشانی خوشکەکەی داماڵی و وتی:

-بەهەر حاڵ واهات و دەڕۆین..

دوای سلاوکردن و هەندێ راوەستان کەوتنەڕێ.. خومار ورتەی لێوە نەدەهات و ئەوانیش هاوشان دەڕۆیشتن و بەدەم ڕێگاوە گفتوگۆی خۆیانیان دەکرد..

## خومار لەنەخۆشخانە..

خومار سێ رۆژ پاش ئەوەی دواهەناسە لەگەروویدا خنکاو دوای ئەوەی پۆلیسی دەربەندیخان گەیاندیانە نەخۆشخانەو لەوێوە بۆ سلێمانی، پزیشکی ئێشکگری ئەو رۆژە لەراپۆرتێکدا نووسیبوی:

*تەمەن ٢٧ساڵ

*ساڵی ١٩٨٩شووی کردووە

*بالآی ١٦٠سم

*پێستی سپی و قژیو چاوەکانی رەش

*دوو فیشەك سنگی بێژاوەو لەپشتیەوە دەرچوونو، بەخوێن بەربوون مردووە

*رۆژی کوژرانی ١٩٩٧/١٠/١٦

## لەدادگا وتیان چی؟

رۆژی ١٩٩٨/٦/٩ دادگای بەرێز لەکێشەی کوشتنی خوماری کوڵیەوە، سەرەتا دایکی تەمەن(٦٠)ساڵەی بەدەم توندکردنەوەی لەچکەکەیەوەو بەچاوی پڕ لەفرمێسکەوە دەیڕوانیە ئەمینی نێو قەفەزی تاوانباریو وتی:

-حەوت مانگ بەر لەکوشتنی هاتنەوە بۆ سلێمانی، سەرەتا زۆر دڵم خۆش بوو بەهاتنەوەیان، چوزانم هێندە بەدبەختمو ئەوە دوا سەردانەوەی کچەکەم دەبێ، مانگێ بەر لەو رووداوە کەماڵی مێردی پێی وتم ژنەکەی رەوشتی خراپەو چیدی ناتوانێ لەگەڵیا بژیو تەلآقی دەدا... ئەوە بوو قسەکەی بردەسەر، بەر لەوەش لەگەڵ یەکێکدا دیبوویان، وتم کێیەو خومار وتی خۆشم دەویو لەگەڵیام.. ئەو بوو کچی منی هەڵخەڵەتاند... ئیتر ئەوەبوو کەمال سەفەری کردو هەر چوار منداڵەکەی لەگەڵ خۆی برد،

کوێرایم دایە نازانم ئێستا چۆن دەژین و کێ خزمەتیان دەکات، سێ کوڕو کچێك هەر لەعومری گوڵدان، گەورەکەی حەوت ساڵ و بچووکەکەی سێ ساڵە... ڕەبی سەبەبکاریان بەکۆی زوخاڵ بێ... ئەمینی کوڕم ئێمە بەخێو دەکات و لەسەر ڕەفتاری بەدی هەش بەسەرەکەی خۆم وایکرد...

*زاوایەکی خوماریش وتی:

-بەڵێ کەمال لای منیش باسی کردەوەی خوماری کرد، ئەمینیش هەر پێی وتم، بەڵام نەچوومە ئەو مەسەلەیەوەو بەچاوی خۆم هیچم لێ نەدیبوو، ئەو ماوەیەی لەسلێمانی بوو زۆر دەچووە دەرەوەو بەئوتومبێلی کرێ هاتوچۆی دەکرد... خەڵك زۆر باسیان دەکرد...

## لەپێناوی شەرەفی خێزانەکەمدا نەوەمکرد..!

ئەمینی ٢٩ساڵی کاسبکار قسەی بۆ دادگا کردو وتی:

-خومار لەدەرەوە ڕەوشتی تێك چووبوو، کەگەڕایەوە ئێرەش شتی لێ بینراو شایەت هەیەو بەڵگە هەیە... جارێکیان پێنج ڕۆژی ڕەبەق دیار نەما... ئەو نەدەترسا و گوێی بەقسەی کەسمان نەدەدا...خۆی لای منیش دانی نا بەپەیوەندیی لەگەڵ مەریوانی خزمی مێردەکەیدا...

منیش لەپێناوی شەرەف و ناموسماندا بڕیارم دا بیکوژم، ئەوەبوو خۆم دەستم تێی نەچوو، وام تێگەیاند کەدەینێرمە ئێران و لەوێ هاوڕێیەکم سەفەری بۆ ڕێك دەخات...

ئیتر لەو ناوچە سنوورییە ڕەفیقێکی خۆم لەشێوێکدا بەدوو فیشەکی دەمانچەکەی لەناوی بردو ئێمەش ڕزگارمان بوو لێی... بەڵام خوا ئاگادارە، تاوانبارنیم و لەوەوبەر ئازاری چۆلەکەیەکیشم نەداوە..خوا ئاگادارە...

*دادگـا بـەدوو) سـالْ بڕیـاری زینـدانی کردنـی ئەمینیـدا، لەگـەلْ ـ چارکردنی بەخشینی(٥)هەزار دینار بۆ هەرچوار منداڵەکەی خومار...
ئیدی بەباری غەمو حاڵی پەشێوەوە رووی کردە زیندانی تەنگو رۆژانەو شەوانە بەدەم ئازارو گینگڵەوە چارەنووسی خۆی دەبردە سەر...

**خومار لەخەونی هەمووواندا...**

*هێشتا کفنەکەی زەرد نەبوو بوو... بارانی پایز گۆڕەکەی تەڕدەکردو نەشتەوەو لەگەلْ سایەقەو هەڵهاتنی خۆری رۆژانی داهاتوودا وشك نەبووەوە...

شەوێك دراوسێیەکی ماڵی دایکی خومار گوێی لەحەسرەتو غەمەکانی ئەو پیرەژنە بەدبەختە دەگرت... ئەمیش لەگەلْ فرمێسکی بەخوڕدا بۆ خوماری نێو گۆڕو بۆ ئەمینی نێو زیندان دەکروزایەوە... شەو درەنگ بوو... دایکی کلۆلْ خەو چووە چاوانی... لەخەودا خومارە چاو بەخومارەکەی بووە میوانی... چاوانی گەشتر لەجاران... تەوێڵی دەتوت بەفری سپییە... بەدەنگی پڕ لەسۆزەوە بەدایکی دەووت:

-دایە گیان... خراپ بوو لەگەڵم..مێردەکەم خراپ بوو... ئەی تۆ بۆ نەتپاراستم... بۆ..

*شەوێکی تر، خوماری بالاّ بەرزو شەنگ هاتە خەونی براکەی... بەلاّم ئەمجارە بیّ ترسو بیّ شەرم دەدوا... بەئەمینی دەوت:

-رۆژێك نەتتوانی هاوەڵم بی.. ئێوە کەی گویّ لەکچان دەگرن... کەی دەزانن غەممان لەگەڵدا دابەش بکەن...کەی...

*هێشتا هەواڵی مەرگی خومار وەك بروسکە نەیدابوو لەماڵە بیّ خومارەکەی غوربەت... لەشەوێکی ئەو ولاّتە بەفرینەدا خومار بەخۆیو

پرچە رەشە درێژەکەیەوە بووە میوانی کچە(٥)ساڵەکەی... بەکراسێکی گوڵ سووورەوە چەمایەوە بەسەریا... گرتیە ئامێزو توند توند نووسانی بەخۆیەوە... لەسەر خۆ دەدواو پێی دەووت:

-هەناوو بەندی جگەرم... توخوا بابۆنی هەناسەت کەم.. بەباوکت بڵێ بمبورێ.. بڵێ باتوڕە نەبێ و بمهێنێتەوە نێو جگەر گۆشەکانم... دەپێی بڵێ.. فریشتەکەم.. پێی بڵێ...پێ..

*منیش فێرم خەو بەو کۆترە باڵ کراوانە، بەو چۆلەکە زامدارانە، بەو ژنە سنگ پڕ لەخوێنانەوە ببینم.. دڵنیام ئەمشەو خومار بەبەرگی سپی ئاودامانە، بەدووباڵەوە بەسەر سەرماندا دەسوڕێتەوەو ئاسمان تەی دەکاتو هاوار دەکاتو دەڵێت:

-هەر ئێوەن، ئێوە کۆمەڵو خاوەنی کۆمەڵو تاوانی کۆمەڵن.. ئێوەن سەرچاوەی مەینەتی ئێمە ئەی پیاوانی وڵات... زۆر لەئێوە کوڕانی تاریکیو باوەڕی کۆنو رزیون... هەر ئێوەن هەرگیز نەتانویستووە غەمەکانمان لەگەڵدا دابەش بکەن... هەر ئێوەن...

# داخۆ لەگەڵ چەندەمین فیشەکدا گیانیان سپارد بێ؟

هەرچەندە (کەریم) بەتەنیا ئەو تاوانە درندانەیەی نەکردبوو، بەڵام رۆژی١٩٩٤/٦/٢٣لەدوا دادگایی کردنیدا، دەنگی بڵندی سەرۆکی دادگا بەجارێ ورو کاسی کرد، کەریم لەگەڵ چەند تاوانبارێکی دیکەدا دەستی چووبووە خوێنی دووگەنجی کاسبکارو لەتاوانێکی بێ وێنەدا کارێکی ئەوتۆیان کردبوو لەهەموو شارەزووورداو لەهاوینی ساڵێ لەوەوبەرەوە خەڵکی باسیان دەکردو نەفرەتیان لێ دەکرد...

کەریم دڵی بەوە خۆش بوو کەرۆژی دادگایی کردن دایكو باوكو برای کوژراوەکان لێی خۆش دەبنو بۆکەسوکاری ئەوەی دیکەشیان لەخوا دەپاڕایەوە بەزەیی لێبووردن بخاتە دڵیانەوە...

بەڵێ وا رۆژی دادگایی کردنەو کەسوکاری کوژراوەکان ئامادەن، تاوانکارەکانی دیکە لێرەنینو بەتەنیا دادگایی کەریم دەکرێت، ژمارەیەك لەوانی دیکە هەڵاتوون، ئەوانی دیکەش کێشەکانیان جودا کراوەتەوەو رۆژی تر دانراوە بۆ دادگایی کردنیان.. کەریمی ٢٧ ساڵ لەشارۆچکەی(چ) بۆ چەکداریو جەردەییو پیاوکوشتن هاتووەتە شارەزوور، چاوە بەقولاچووەکانی بڕیوەتە قسەکەرانو چاوەڕێی کەسوکاری یەکێك لەدوو کوژراوەکە دەکات...

وانۆرە هاتە سەرکەسو کارەکەی (کاوە)و کەریم هەموو گیانی بووەتە گوێچکەو... براکەی کاوە داوای سزادانی تاوانبارانی کرد، بێجگەلە کەریم، دایکەکەشی لەهەموو مافێکی خۆی خۆش بوو هیچی لێی نەویست، باوکیشی دەستبەرداری شکاتەکەی بوو لەکەریم، کەمێ خۆشی بەدڵو دەروونیدا هاتەوە، بەڵام دایکە پیرەژنەکەی کوژراوەکەی دیکە بەو جۆرە قسەی نەکرد، نەخێر دایکی(شیروان)بەچاوی پڕ لەفرمێسکەوە وتی:

—من لەم تاوانبارە خۆش نابم. کوڕەکەی من کچێکی بچکۆلەی بەهەتیوی بۆ بەجێهێشتووین، داواکارم گەورەترین سزای بدەن...

دادگـای بـەرێز بـەپێی لێکۆڵینـەوەی سـەرەتایی و قـسەکانی لەوەوبـەری کـەریم خۆی و تاوانبارەکـانی دیکـەو بـەپێی بەڵگـەو قسەی شـایەتەکان بڕیـاری عادیلانـەی بەسەر گومانلێکراودا دا، بەڵێ دادگا بڕیاری دا بەسـەر کەریمدا بـە٤٦ سـاڵ زینـدانی کردن...

## کە پیلانی تاوانکاریی داڕێژرا..

سـەرەتای مـانگی ئـابی١٩٩٣بوو، لەگونـدی (ب)ی نزیـك عەربـەت حەمـە تایـەری چەکداری دەسـت ڕۆیـشتوو لەگـەڵ براکـەی خـۆی و کـەریم و چـەند کەسـێکی دیکـەدا بڕیاریاندا بەهێزی چەکەکانیان بەشێوەی کەمین دانان دزی بکەن و هاووڵاتیـان ڕووت بکەنەوە، بۆ ئەو مەبەستە جلوبەرگی سەربازی و نیشانەیان لەسلێمانی کڕی...

زانیارییان پێ گەیشت کەوا ئۆتۆمبیلێکی سۆپەری شین بەو ڕێگایەدا لەشارەوە دێـت و دەچـێتە ناوچـە سـنوورییەکان بـۆ کاسبی کـردن، ئۆتۆمبیلەکـە هـی (کـاوە) ناوێکە وکەدێت پارەیەکی باشی پێیە...

چـەکدارەکان سـواری دوو ئوتومبیل بوون، یـەکێکیان شـۆفرلێتی پیکـاب و ئـەوی دیکـەیان بەرازیلی سوور بـوو، ئـەو ڕۆژە کـەڕۆژی ١٩٩٣/٨/٩بوو هـەردوو ئۆتۆمبیـل بەرەو سەید سادق کەوتنەڕێ، لەڕێ یەکەمیان پەکی کەوت، دووەمیان بـەرەو شـوێنی مەبەست لێی خوڕی،چەکدارەکانی نـاو بەرازیلییەکـە هـەموو تفەنگی کلاشـینکۆفیان پێبـوو، لـەلای کـانی سـپیکە تووشـی سـۆپەرە شـینەکە هـاتن و(کـاوە)لێـی دەخـوڕی و(شـیروان)ی هـاوڕێی لەتەنیـشتییەوە بـوو، ئـەم دووانـە بـڕی ٤٠٠ هـەزار دیناری عیراقی و ١١٢٠٠دۆلاری ئەمریکییان پێبوو...

### ڕووبەڕووبوونەوە...

لـەو نـاوەدا، چـەکدارەکان ئۆتۆمبێلـە سـۆپەرەکە ڕادەگـرن، بـەهۆی چـەکەکانی دەسـتیانەوە ناچـاریان دەکـەن دابـەزن و سـواری بەرازیلییەکـەیان دەکـەن، براکـەی حەمەتایـەر کـەناوی(حەمـە قایـەر)ە، لەگـەڵ یـەکێکی دیکەیانـدا سـواری سـۆپەرەکە

دەبن و بەپارەکانی ناویەوە دەگەڕێنەوە ماڵی حەمە تایەرو لەوێ پارەکان بەش دەکەن و ئۆتۆمبێلەکە دەشارنەوە، بەرازیلییەکەش لەکاتی سپێکەوە دەگەڕێتەوە دواوەو دوای ماوەیەك بەرێگایەکی دیکەدا لادەدات و کەمێ دووردەکەوێتەوە. لەنێو تۆزو خۆڵی رێگاکەدا ئۆتۆمبیلەکە پەکی دەکەوێت و دەکوژێتەوە، چەکدارەکان دادەبەزن تابەپاڵنان بیخەنەوە گەڕ، لەوکاتەدا(شیروان) فرسەت دێنیێ و تەقە لە چەکدارەکان دەکات، ئەوانیش بەهەمان شێوە وەڵامی دەدەنەوەو لەو رووبەڕوو بوونەوەیەدا حەمە قایەر بەسەختی بریندا دەبێت و لەهەمان کاتدا هەردوو هاووڵاتی (کاوەوو شیروان)بریندار دەبن، کەخەڵکی ئەو ناوچەیەو چەند پۆلیسێك دوای بیستنی تەقەکان لەشوێنی رووداوەکە نزیك دەبنەوە، چەکدارەکان هەڵدێن... هەر بەدوای ئەوەدا برایەك و خزمێکی کاوە دەگەنە ئەو ناوە، بریندارەکان (کاوەو شیروان)بەرەوعەرەبەت دێنن و براکەی کاوە دەچێتە ئاسایش بۆ ئاگادارکردنیان لەو رووداوە. بەرازیلییەکەی چەکدارەکانیش هەر لەشوێنی رووداوەکەدا لەلایەن پۆلیسەوە دەستی بەسەردا دەگیرێ.

## لەکاتی بردنی بریندارەکاندا بۆ شار...

ئەو ئۆتۆمبیلەی هەردوو برینداری (پارەو ئوتومبیل دزراویان)تیا سوار کردبوو هی عوسمان ناوێك بوو، لەعەربەت جوڵان و بەرەو سلێمانی کەوتنەڕێ، خزمەکەی کاوە دڵخۆشی کاوەو شیروانی دەدایەوە پێی وتن:

–ماڵی دنیا هیچ نییە، مادام خۆتان سەلامەتن و برینەکانتان سووکە ئۆتۆمبیل و پارە قیمەتی نییە...

گەیشتنە بەنزیخانەکەی ئەملای عەربەت و عوسمانی شۆفێر لەبەرخۆیەوە گوتی:

–با بەنزینی تێ بکەم، نەوەك لەڕێ لێمان ببڕێت!

لەولاشەوە حەمە قایەر کەبەسەختی بریندا بوو بوو هەر دوای ماوەیەکی کەم گیانی لەدەست دابوو، کەئەو هەواڵە بەحەمە تایەری برای گەیشتبوو، بەپەلە خۆیو چەکدارەکان بەدوو ئۆتۆمبیل گوندەکەی خۆیان جێهێشتبوو، تەنانەت نەچوو بووە مزگەوت تابۆ دواجار براکەی ببینیّ!

کەریم لەئۆتۆمبیلی دووەمدا بوو، کەگەیشتە ئاستی بەنزیخانەکە کەرێکەوتو لە بەدبەختی هەردوو برینداره‌کەدا (شیروانو کاوە) لەنێو ئۆتۆمبیلەکەدا بینران، وەریانچەرخاندە سەریان، چەکدارەکان دابەزین، لەچەند لوولەیەکەوە ئاگری گوللە دەردەپەڕیو فیشەکەکان دەچوونە گۆشتو ئێسکی شیروانو کاوەوە، کاوە بەتەنیا خۆی(٣٧) فیشەك بەر سەریو لەشی کەوتو هەموو گیانی هەلاهەلا بوو، داخۆ لەگەڵ فیشەکی چەندەما گیانی سپاردبیّ؟!!

شیروانیش بە١١فیشەك دابێژرابوو، کەللەی سەری هاڕراو خوێن لەسنگو سکییەوە دەچۆڕایەوە خواریّ ئەویش دەستبەجیّ مردبوو!

هەروەها خزمەکەی کاوەش فیشەکێك بەرسنگی کەوتبوو، بەڵام زامەکەی قورس نەبوو، کە برایە نەخۆشخانەو دوای چارەسەرو روو لەچاك بوون چووەوە ماڵی خۆی... دوایی کەلاشەی کوژراوەکان برابوونە (مەیتخانە) لەگیرفانی کاوەدا (٦٠٠) دۆلارو ٢٥٣دینارو دەفتەرێکی تەلەفۆن دەرهێنرابوونو درابوونەوە دەستی کەسو کاری

## کەریم(٣) جار بڕیاری زیندانی کردنی دەدریّ..!

وەك سەرەتا وتمان ئەم کێشەیە، تەنیا کێشەی کەریمەو دادگایی کردنەکە هەرهی ئەوەوەو جودایە لەهاوڕێکانی!

رۆژیی دادگایی کردن، بەباوەڕی تەواوی دادگاو بەڵگەو شایەتەکان بڕیار بەسەر کەریمدا درا، بڕیارەکە بەرامبەر تاوانی دزینی ئۆتۆمبیلو

پارەکان، پاشان بەرامبەر بەتاوانی کوشتنی دوو کەسی بێ گوناه وبریندار کردنی کەسێکی تربوون، بەرامبەر تاوانی لەم جۆرە بەتەنیا چاوەڕێی بڕیاری لەسێدارەدان دەکرا، بەلاّم دادگای بەرێز ئەوەی لەبەرچاو گرت کەوا(کەریم) رۆلێکی سەرەکی هەبووە لەدەرخستنی درێژەی تاوانکارییەکان و بەباشی تاوانە دڕندانەکەی لەهەردوو لێکۆڵینەوەی سەرەتایی و قەزائیدا گێڕابووەوە، ئەمەو وێڕای ئاشکراکردنی ناوی تاوانکارە راکردووەکان.

دادگا بەم شێوەیە بڕیاری بەسەر کەریمدا دا:

١-بڕیاری زیندانی کردنی هەمیشەیی.

٢-بڕیاری زیندانی کردنی هەمیشەیی.

٣-بڕیاری زیندانی کردنی بۆ ماوەی ٦سالّ.

٤-هەرسێ سزاکە بەدوای یەکدا جێبەجێ دەکرێ. بەلاّم بە پێی مادەی ١/١٤٣ نابێ کۆی زیندانی کردنی لە٢٥سالّ تێپەڕبکات، واتە لە ٤٦ سالّەکەی ٢٥سالّی دەباتە سەر.

٥-دەبێ بەهاوبەشی و بەهاوکاری لەگەلّ دوو حوکمدراوی دیکەدا(دوو هاوڕێی بەشداری لەتاوانەکاندا)بڕی ٣٠٠٠دینار بدەنە هەریەک لەباوک و دایکی کاوەو ٥٠٠٠هەزار دیناریش بۆ دایکی شیروان و ٦٠٠٠دیناریش بۆ کچە بچکۆلەکەی شیروان و ١٥٠٠دیناریش بۆ خزمە برینداره‌کەی کاوە.

٦-کەسوکاری کاوەو شیروان دەتوانن ئۆتۆمبیل و پارە دزراوەکان لەتاوانکارە مەحکومەکان داوابکەنەوە.

٧- عوسمانی شۆفیر بۆی هەیە داوای قەرەبووی ئۆتۆمبیلە زیان پێگەیشتووەکەی لەتاوانکاران داوا بکات.

رۆژێکی کۆتایی مانگی مارتی ۲۰۰۲، نزیک (زێ)ی تەقتەق، خەڵکی بەتاکو بەکۆ هەفتەی یەکەمی بەهاری دوای نەورۆزیان پیرۆز دەکرد، ئا لەو سەیران و رۆژە جوانەدا شێرزادی ٤٦ ساڵ تەمەن بەکۆڵێ غەمەوە لەسلێمانییەوە بۆ زێدی خۆی دەگەڕایەوە..

هەرچەندە شێرزاد بەزانینی دوا بڕیاری دادگای تەمیز هەندێ ئاسوودەبوو و دەیزانی کەخوێنی بەدبەختەکەی ژنی بەفیڕۆ نەچووەو دڵنیابوو کەبڕیارەکەی (تەمیز) هەندی لەسوێی دڵی منداڵەکانی. بەتایبەت کوڕە گەورەکەی دادەمرکێنێتەوەو تەمی بەرچاوو نێو دەروونیان بۆ دووریی دایکی چارەرەشیان تاڕادەیەك دەرەوێتەوە، بەڵام ئەو پێنج ساڵو نیو بوو بۆ فیراقی خۆشەویستەکەی عومری هەمیشە کەیل و غەمبار بوو.. هەموو جارێ کەیەکێ لەمنداڵەکانی دەهاتنە بەرچاوی، یان کەگوێی لەقسەیەکی ئەوان دەبوو، رێك مێشکی جەنجاڵی دەیبردەوە بۆ لای ئەو کۆرپەیەی لەسکی دایکیدا دواهەناسەی هەر لەگەڵ ئەودا سپارد، هەمیشە بەزەیی بەو کۆرپەیەدا دەهاتەوە کە لەگەڵ دایکیدا کوژراو نەباوکی و نەکەسێکی تر نەیانزانی کوڕ بوو یان کچ!

شێرزاد بەرەو تەقتەق دەگەڕایەوە، دڵخۆشی خۆی بەوە دەدایەوە کەبکوژی هاوسەرە ئازیزەکەی و کۆرپە بچووکەکەی بەزیندانی هەمیشەیی حوکم دراوەو ئیدی کەسێك چاوی بەچارەی تاڵی ناکەوێتەوە..

بێئەوەی ئاگای لەخۆی بێ، جار جارە فرمێسکە تەڕەکانی هەردووچاوی رایدەچڵەکاندو بەدزییەوە دەیسڕین، شەرمی دەکرد کەسێکی ناو ئوتومبێلەکە ئەو پیاوە گەورەیە ببینن دەگری.!

پێنج ساڵو نیو بوو، رۆژانی هەینی یان لەهەر بۆنەیەکی تردا کەدەچووە سەردانی گۆڕی (نازدار)ی ژنی لەگۆڕستانەکەی گوندی (قەرەناو)، بەدڵو کوڵ بۆ گوڵی بابردووی عەشقە دێرینەکەی و بۆ دایکی شەش منداڵە لەماڵ دوورەکەی دەگریا.

منداڵەکانیش بەهەمان شێوە، هەمیشە کۆست کەوتووبوون بۆ ئەو ژنەی لەنێو باخەکەیاندا رەنگی هەنارو دارقەیسی و دارمێوە بالآبەرزەکانی گرتبوو..

زۆرجاریش کە لەماڵە بێنازەکەیاندا کۆدەبوونەوە، تارمایی ئەو شەوە پایزییە دەهاتەوە بەرچاوو سەر زاریان، کەتیایدا نازدار پەلی راکێشراو سەد مەتر دوور لەهەموویانەوە خەڵتانی خوێن کرا.

## لەشەوێکی مانگە شەودا

سەرەتای پایزی ١٩٩٦، ئەودەمەی براکان دەستیان بەخوێنی یەکتر سووربوو بوو، ئەو رۆژانەی ئاگر لەماڵی کورد بەردەبوو، چەند چەکدارێك فرسەتیان لەئاژاوەو گۆبەندی ئەو شەڕە براکوژییە بینی و لەشەوێکی مانگە شەودا هەڵیان کوتایە سەر گوندی قەرەناوی نزیك تەقتەق، خەڵکی لەخەوی نیوەشەودا بوون، شێرزادو نازداری ژنی و هەر پێنج منداڵەکەی و ئامۆزا میوانەکەی و نزیك ماڵەکەی خۆیشیان شیروانی برای لەشیرین خەودا بوون، سێ چەکدار بەهەنگاوی گورجەوە دیاریی مەرگیان پێبوو بۆ ئەو ماڵە، ماڵەکەی شێرزاد دوو ژووری بچووك و هەیوانێکی نزیك گەوری بەخێوکردنی مەڕو مالآتەکەیان بوو، نزیك خۆشیان ماڵێکی بچووکی شیروانی برای و

هەردوو ماڵ نزیك بەباخەكانیان بوو كە لەوەرزەكانی ساڵدا كاریان تیادا دەكردو پێی دەژیان.

لەو نیوە شەوەدا دەنگی پێ و دەنگی میل هێنانەوەی كلاشینۆكۆفەكانیان و ورتە ورتی نێوانیان ماڵ و منداڵیان بەخەبەرهێنا.

لەناو هەموویاندا پەلاماری (نازدار) درا.. دەتووت نێچیری خۆیان گرتووەو بەمەرامی دڵیان شادبوون.

لەو لاوە شێروان پێی زانی و دەسەڵاتی نەبوو، ئامۆزاكەی شێرزاد ویستی بپارێتەوەو سوودی نەبوو. شێرزاد بەواقی وڕماوەوە دەیڕوانییە نازدارەكەی و ئەوانیش پەلیان رادەكێشا، منداڵەكان (دایە گیان.. دایە گیان) یان بوو، دایەش بەرەنگی پەڕیوو حەپەساوەوە هەناسەبڕكێكی پێ كەوتبوو.. لەیەكێ لەچەكدارەكان دەپاڕایەوەو سوودی نەبوو، لەو شەوە ساماڵەدا گەر مانگ و ئەستێرەكان بەو كارەساتەیان بزانیبا ئاسمانی بەرزیان جێدەهێشت و دادەبەزین تا ئەو نازدارە لەچنگی مەرگ رزگاربكەن..

نازدار دوورخرایەوە، ئەو دەگریاو بەبەرچاوی پیاوەكان و منداڵەكان و دارهەنجیرو قەیسی و هەنارو بەبەرچاوی رەزەكەیانەوە كەڕۆژانە نازدار پیایدا دەهات و دەچوو، برا بۆ مەرگ.

سەد مەتر لەولا هەموویانەوە یەك لەچەكدارە بێبەزەییەكان یەك و دووان و سیان و چوار.. فیشەكی نا بەجەستەی نازدارەوەو ئەویش وەك درەختێ لەرەگەوە هەڵیكەنن كەوت و درێژبوو، لاشەكەی كەمێ لەڕێگا خۆڵەكەوە دووربوو كەهەموو جار بۆ پێشوازی میوانێك یان هاموشۆی رۆژانەی پیایدا دەڕۆی.

چەکدارەکان دوای (نەبەردییەکەیان) هەڵدێن و دوور دەکەونەوە، شێرزاد یەکەم کەس دەگاتە سەر لاشەی ساردەوەبووی خۆشەویستەکەی، ئەوانی تر بەدوایداو لەنێو هەمووانیدا هاواری کوڕە گەورەکە لەو شەوە مانگە شەوەدا دەنگ دەداتەوە کەپڕ بەدەنگی دەڵێ (دایکم ڕۆ..)

## ماڵێک بۆ خۆشەویستی

١٣ ساڵ بەر لەو ڕووداوە، کاتێ شێرزاد داوای نازدار دەکات بیخوازێ نایدەنێ، ئەوان دڵیان بەیەکەوە دەبێ و شێرزادی تەمەن ٢٧ ساڵ کەف و کوڵی عەشقی لاوێتی خۆی دەکاتە گوڵێکی ڕەنگ سووری پەیمان و دەیخاتە سەر ڕێی ژیانی نازدارەکەی..

نازدار دادەمێنێ و نازانێ پەنا بۆچی بەرێت، لەدایکی دەپاڕێتەوەو لەباوکی دەلاڵێتەوەو هەردوو دەڵێن شووی تۆ بەدەستی براکانتە، براکان دەچن بەرقداو ڕازی نابن.. دەڵێن چۆن دەبێ کچی ئێمە دڵداری بکات و نایدەین.

شێرزاد خۆی دەچێتە لایان و پێیان دەڵێ پیاوی چاك بن و خوابناسن، نازی کچەکەتان دەکێشم و وەك چاوانم دەیپارێزم.. ئێ من خۆشمدەوێ و خۆیشی ڕازییە، بۆ نامدەنێ..

کارەکە دوادەکەوێ و گڕی عەشقی هەردوو دڵدار نێڵەنێڵی دەبێ، ئێوارەیەکی بەهاری هەردوو بڕیاری تیادەدەن بڕۆن، لەگوندی خۆیان دووردەکەنەوەو سوێند دەخۆن یان بۆ مەرگ یان بۆ یەکتر بن.

هـەردوو بڕیـار دەدەن ماڵێـك بكەنـە لانـەی عەشـقەكەیان و تاسـەر پێكەوەبـژین. لەشـەوێكی بەهاریـدا تاسـەی خۆشەویـستی و هـەژانی نـاخ و تامـەزرۆیی لێوەكانیـان ئاوێتـەی یـەكتر دەكـەن و لـەنێوان تـرس و دڵنیاییـدا، لـەنێوان بیركردنـەوەو توانـەوەدا، بڕیـار دەدەن خۆیـان بدەنـە دەسـت یـەكترو هەر لەو شەوەدا نازدار دەبێتە ژنی شێرزادەكەی.

بۆ سبەینێ دەچنە لای مەلاو لەسەر ڕێبازو پەیڕەوی ئاین یەكتر مارە دەكەن.

دیسانەوە كەسـوكاری هـەردوولا دەكەونـەوە گفتوگـۆ، بەڵام جووتـە بـرا بەوە رازی نابن و دەڵێن (ئەوە بێبەرییە لەئێمە، ئەوە خوشكی ئێمە نییەو لەكەی عارە، نەدەیناسین و نەبماننناسێ.. با بمانمێنێ بۆ كاتی خۆی).

لەو گوندەدا لەنگەر دەگرن و ماڵی پڕ لـەمیهرو خۆشەویـستییان گـەورەتر دەبێت.

بەدرێژایی ئەو سیانزە ساڵەی ژیانی ژن و مێردییان خودا سێ كوڕو دوو كچی جوانیان پێدەبەخشێ.. شەشەمیش بەرلەوەی چاو بەژیان هەڵبێنێ وای لێدێت!.

## ڕوو لەدادگا

پـاش ئـەوەی كوردسـتان ئـارامتر دەبێتـەوە ناوچـەكان ئاسـوودە دەبـن شێرزادی دڵگـەرم بـۆ خۆشەویـستە دوورەكـەی لەهـەقی خـۆی خۆشـنابێت و پەنا دەباتە بەر عەدالەت.

ساڵی ۲۰۰۱ تاوانبارەکان دەگیرێن، ئەوان جووتە براکەی نازدارو ئامۆزایەکیان دەبن، ئامۆزاکە هەر خۆی فیشەکەکانی ناوە بەسەرو سنگو دڵو هەناوی نازدارەوە، هەر بۆیە بەجیا لەدوو تاوانبارەکەی تر دادگایی دەکرێت.

ڕۆژی ۲۰۰۱/۷/۲۳ دادگایی (ئامۆزا) دەکرێ، بەڵام لەبەر ئامادەنەبوونی خودی شێرزادی شکاتکەرو پارێزەری دانراو بۆ داکۆکیکردن لەتاوانبار دادگایی کردنی دوادەخرێ.

ڕۆژی ۹/۱۰ سەرلەنوێ دادگایی کردن دەستی پێکردەوە، ئەمجارەیان شێرزادو کوڕە گەورەکەی لەوێ دەبن، دادگا بڕیاردەدات کەسێکی ناو دادگا وەك (وەسی)ی داواکاری مافی منداڵە وردەکانی نازدار بەشداریی بکات.

شێرزاد یەکەمین قسەکەر بوو کە بەدادگای وت:

-گەورەکانم، هۆی کوشتنی ژنەکەی من هەر ئەوەبوو کە شووی کردبوو پێم، ئەوان بەزەیی خوایان لەدڵدا نەبوو، هەر سەدمەترێ لەولا خۆمانەوە دایانە بەر ڕێژنەی گوللە، کەچوومە سەری تەواو بووبوو.

ئەوان دەمێك بوو لەژنەکەی من داخ لەدڵ بوون، بەڵام چی بکەم، لەسەر قسەی هەموو لایەك لەبراکانی خۆشدەبم و بکوژەکەش کەئامۆزای ئەوانە هەر لێی خۆشدەبم، چی بکەم بەختی خۆم وابوو.. ئیتر جەنابتان خۆتان دەزانن..

دوای ئەو ڕەنجی کوڕە گەورەی دڵگەرمانە بەسەرهاتەکەی بۆ دادگا گێڕایەوە، پێی وتن:

مامیشم‌و ئامۆزاکەی باوکیشم ئاگاداربوون کە بەزۆر پەلی دایکمیان راکێشاو دوای ماوەیەکی کەم گوێمان لەگریانی ئدایکم‌و دەنگی فیشەکی ئەوان بوو، دەسەلاتمان نەبوو، هەرچەندە سولح کراوە، بەلام داوا دەکەین بەپێی یاسا بڕیاریان بەسەردا بدەن..

ئەو رۆژەش بەهۆی ئامادەنەبوونی شایەتەکانەوە دادگا دواخرا، رۆژی ٩/٢٩ دادگا بۆ هەمان کێشە پێکهێنرایەوە، دوای ئەوەی سەرۆکی دادگا سوێندی براکەی شێرزادی دا، ئەویش وەك شایەت کەوتە قسەو وتی:

-هەرچەندە کاتی خۆی سولحی عەشایەری لەنێواندا کرابوو، بەلام براکانی براژنم بەوە رازی نەبوون، لەو مانگە شەوەدا بەبەرچاوی هەموومانەوە بردیان‌و کوشتیان، لەو رۆژەشدا ئامۆزاکەی شێرزاد ئامادەنەبوو، دادگا پشتی بەقسەکانی زووتری بەست کە لەلێکۆلینەوەی سەرەتاییدا وەك شایەت لێی وەرگیرابوو.

پاشان مەحزەری کەشفی رووداوەکە خرایە روو و چۆنێتی کوشتنەکەی باسکرایەوە، ئینجا تاوانباری بکوژی نازدار وەلامی پرسیارەکانی دایەوە، ئەو نەچووە ژێر تاوانەکە، ئەو وتی من نەمکوشتووەو ئەمەم بۆ دروستکراوە، بەلام دادگا دلنیابوو لەچۆنێتی تاوانەکەو پالەوانەکانی!

دوای ئەوەی داواکاری گشتی داوای سزادانی تاوانباری کردو پارێزەر داکۆکی لێکردو داوای ئازادکردنی کرد، دادگا بۆ لێکۆلینەوەی زیاترو یەکلاکردنەوەی داواکە کارەکانی دواخست بۆ رۆژی ٢٠٠١/١٠/٦.

لەو رۆژەدا دادگای بەرێز بڕیاریدا:

-ئامۆزا تاوانبارەکە بەزیندانی کردنی هەمیشەیی حوکم بدرێت، ئەویش بە لەبەرچاوگرتنی تەمەنی کە(٢٤)ساڵ بوو.

-بۆ منداڵە وردەکانی شێرزادو نازدار دەتوانرێ لەدادگای مەدەنیدا داوای قەرەبوو لەتاوانبار بکەن.

ئەوەبوو دواتر لە٢٠٠٢/٣/٢٧دا دادگای تەمیز رەزامەندی لەسەر ئەو بڕیارەی دادگای تاوانی سلێمانی نیشاندا..

## چارەنووسی هەریەکەو بەجۆرێ..!

شێرزاد دوای ئەو هەموو مەینەتییەی بەهۆی عەشقەوە دیی، لەماڵە بێنازدارەکەیدا لەیەك کاتدا بووەتە باوك‌و دایکی منداڵەکانی، زۆرجار هەناسەی ساردو فرمێسکی گەرمی دەسپێرێ بەیادی عەشقە ناکامەکەی‌و بەو ساڵانەی لەگەڵ خۆشەویسترین کەسیدا دەژیا.

ئامۆزای تاوانکار لەزینداندا هەمیشە لەخۆی دەپرسێ (بۆ وام کرد)، زۆرجار بکوژانی دیکەش کە بەهۆی تاوانی مرۆڤ کوشتنەوە بوونەتە میوانی هەمان زیندان سەرزەنشتی دەکەن‌و پێی دەڵێن (چۆن دەبێ پیاو ژن بکوژێت)!.

منداڵەکانی نازدار بەملی کەچەوە رووەو چارەنووسی خۆیان دەبنەوە، بەتایبەت رەنجی کوڕە گەورەی، ئەو لەبەژنی هەر درەختێکی باخەکەیاندا باڵای دایکی دەبینێ‌و زۆر دیمەنی خۆرکەوتن‌و زەردەپەڕو تریفەی مانگەشەو شێوەی دایکە کلۆڵەکەی بەبیردێننەوە.

وا شەش ساڵی رەبەقیشە لە(قەرەناو) جەستەی موبارەکی ئەو نازدارەو منداڵەکەی ناوسکی لەو خاکەدا ئۆقرەیان گرتووە.

رۆحیانەتی ئەو جەستەیە جارێکی تر باکی لەهەڕەشەی ئامۆزاو براکانی نییە.. بەڵام ئەو رۆحیانەتە هەمیشە لەگەڵ خەمەکانی شێرزادو رۆژو مانگو ساڵەکانی یەك بەیەکی منداڵەکانیدا دەژی. ئەم پایزەش دارسێوو دارهەنارو دارەکانی تری باخەکەی نازدار پێکەوە چاوەڕوانن ئەو باڵابەرزە دەستوپەنجە ناسکە بەناویاندا بێتو بچێت. چاوەڕوانن ئەم نازی ئەوانو ئەوانیش پێکەوە نازی نازدارەکەی خۆیان بکێشن.. بەڵام.. بەڵام نایبینن!

رۆژی ٢/٢٦ موختاره تەمەن حەفتا ساڵەکەی گوندی (گەردجان) هەواڵی بینینی لاشەی کوژراوێکی نەناسراوی گەیاندە دادگای رانیە، پێی وتن: ئەوەتا خراوەتە ناو ئەو بۆری ئاوەی بەژێر شەقامە گشتییەکەی لەنێوان گردجان و کانی ماراندا ردت دەبێت! پۆلیسی چوار قورنە دەنێرن بۆ بینینی و گواستنەوەی بۆ نەخۆشخانەو بەردەستی پزیشك..

دوای لێکۆڵینەوەو پەیدابوونی کەسوکاری، ئاشکرا دەبێ کەئەو کوژراوە شۆفێرێکی خەڵکی شاری (رومادی)یەو ناوی (جاسم)ەو تەمەنی هەر سی ساڵ دەبێ و بۆ رزق و نان پەیداکردن لەو خوارەوە دەگاتە ئێرە.

ئەو کەسەی بەچاکی جاسمی ناسیوەو لەرومادییەوە لەگەڵیا هاتووەو ئاگاداری کوژرانی بووە(برایم)ی ناوە، برایم تەمەنی ٢٦ساڵەو خەڵکی لای چوار قورنەیەو ساڵی ١٩٧٥لەگەڵ هەزاران کوردی دیکەدا رەوانەی ناوەڕاست و خوارووی عیراق کراون و ئەم لەرومادی گیرساوەتەوە، واتە ماڵی باوکی لەوێیە، ماڵە مامێکی هەر لەچوارقورنە ماون، برایم بەشۆفێرییەوە خەریك بووە، بۆ خۆی بەم شێوەیە بەسەرهاتی جاسمی بۆ دادگا گێڕاوەتەوە:

–چەند رۆژێ بەر لەرووداوەکە جاسمم ناسی، بەرێکەوت لەتەجنیدی رومادی بووینە هاوڕێ، من بۆ کاری (تسریح)بوون چوومە ئەوێ، جاسم ناونیشانی خۆی دامێ و کاتی گەڕامەوە باسی ئەوم بۆ سێ هاوڕێی خۆم کرد کە عومەرو عوسمان و خەسرەو بوون، خەسرەو وتی:

-جا لەوە باشتر هەیە...مادام خاوەنی پاسی کۆستەری٢١نەفەرییە، بە بیانوویەك لەگەڵ خۆت بیهێنەو لێرە پاسەکەی لێ زەوت دەکەین و بۆ خۆمان دەیفرۆشین...! ئەوە بوو پیلانمان داناو کەوتمەرێ.

## برایم و جاسم بەرەو سلێمانی...

برایم دەگاتەوە رومادی و بەناونیشانەکە ماڵی جاسم دەدۆزێتەوە، دەبینێ خۆی و خوشکە بچکۆلەکەی بەشتنی کۆستەرەکەوە خەریکن... کات بەرەو خۆرئاوابوون دەچوو، هەر کەجاسم میوانەکەی بینی یەکسەر ناسیەوەو سۆندەی فڕێ داو بەگەرمی پێشوازی لێکرد... چوونە ژوورەوەو برایم وتی:

*کاکە گیان، دەمانەوێ ئوتومبێلێ بەکرێ بگرین و بیبەینە رانیە تالەسەر خێر بووك بۆ خزمێکمان لەوێوە بۆ رومادی بگوێزینەوە، منیش لەکۆستەرەکەی تۆ باشترم شك نەبرد، چەندیش ئەفەرموویت ئامادەین...

لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە.

-ئوتومبیلی خۆتە بەسەر چاو..

بە٤٥٠دینار رێکەوتن و وەعدیان دانا سبەی سەعات (٦)ی بەیانی لەبەردەم سینەما (النصر) بەیەك بگەن و سەفەربکەن.. لەوکاتەدا جاسم، برایم هەڵدەگرێ و دەڕۆن... ئیتر بێ سەرو شوێن دەبێ و کەسوکاریشی شتێکی نازانن...

باوکە پیرەکەی جاسم دەگێڕێتەوە دەڵێت:

شەوی ١٩٨٩/٢/١٤ جاسمی کوڕم پێی وتم، باوە بەڵێنم بەکوڕێك داوە سبەینێ بەتایبەتی لەگەڵیا بچم بۆ سلێمانی و بەمەبەستی بووك گواستنەوە بەکرێیان گرتووم..

ئیتر ئەو کەسەم نەدی بێتە ماڵەکەمان، بەڵام کچە بچکۆلەکەم کەناوی(ڤیان)ە ئەوکاتەی کوڕەکە هاتبوو لەگەڵیا رێکبکەوێ دیبووی... تەنانەت جاسم ناوی ئەو کوڕەشی پێ نەگوتم.. ئەوە بوو زۆر دواکەوت، هەرگیز سەفەری وای نەکردبوو. بۆیە دڵم کەوتە مەراق و کەوتمە سۆراغی...!هەروەها پۆلیسم ئاگادار کرد، ئەوە بوو پاش چەند رۆژێك لە(فەوزیە)ی کچی پووریەوە هەواڵم پێ گەیشت کەجاسم لەگەڵ یەکێکی تردا سەردانی کردووە بۆ ماڵەکەی لە(تاسلۆجە)و دوای چا خواردن بەرەو رانیە بەڕێ کەوتوون، هەر بۆیە چووم بۆ رانیە، لەوێ زانیم جاسم کوژراوەو لەنەخۆشخانە لاشەکەیان دامەوەو دواتریش لەماڵێکی سلێمانی دا پاسەکەیمان دۆزییەوە کەژمارەکەی(انبار)ەو مۆدێلی هەشتاو سێیەو... کوڕەکەی من هێشتا ژنی نەهێنا بوو، نازانم چ گوناهێکی کردبوو، ئەو دڕندەیە دەستی چووە خوێنەکەی؟!

## برایم تەواوی بەسەرهاتەکە دەگێڕێتەوە...

دوای ئەوەی بەیانی زوو جاسم هاتە بەر سینەماکەو سواری کردم، بەرەو(فلوجە)کەوتینەڕێ، چونکە لەهێڵی نێوان ئەوێ و بەغدا کاری دەکرد، لەوێ نەفەری هەڵگرت و چووینە بەغدا، نەفەرەکان دابەزین و، چووینە گەراج نەفەری سلێمانیمان هەڵگرت و کەوتینەڕێ، دوای ئەوەی گەیشتین

نەفەرەکان دابەزین، لەرێگای بەرەو رانیەماندا لەتاسلۆجە لای دایە ماڵی کچی پووری، دوای چا خواردنەوە بەرەو رانیە دەرچووین، کە گەیشتینە کانی ماران رۆژ لەئاوابووندا بوو، لەوێ عومەرو عوسمانمان هەڵگرت و ئەوان وتیان خەسرەو لەچوارقوڕنە چاوەڕێمانەو با بچینە لای، ئەوە بوو چووین و ئەویشمان سوارکردو لەرێگای نێوان گردجان و کانی ماران لەئاستی کورە هەنگەکانی گردجان ئوتومبێلەکەمان پێ راگرت و دەستبەجێ عومەرو خەسرەو بەچەکەکانیان کەوتنە سەرو گوێلاکی جاسم، سەری خوێنی لێهات و بێهۆش کەوت، رامان کێشایە خوارەوەو هەر ئەوان تەقەیان لێکردو کوشتیان، پاشان خستمانە نا ئوتومبێلەکەوەو بردمان لەولاترەوە خستمانە ناو بۆرییە ئاوەکەی ژێر شەقامەکەو بەجێمان هێشت...!

بۆ رۆژی دوایی لەگردجان پاسەکەمان جوان شت و بەتەنیا خۆم سواری بووم و بەرەو سلێمانی لێمخوڕی، کە گەیشتمە ئەوێ یەکسەر چوومە لای دووبرا کە کڕیاری ئوتومبێل بوون، دوای مامەڵە کردن رێکەوتین کە بیاندەمێ بە(بیست وپێنج) هەزار دینار، پێشەکی نۆ هەزارو پێنج سەد دینارم لێوەرگرتن، بڕیاردرا کە گەڕامەوە بۆ تەواوکردنی مامەڵەی رەسمی سەنەوییە پاشماوەی پارەکەم بدەنێ، بەرلەوەی بڕۆم داوای ناونیشانیان کرد، منیش ناوی مامێکی خۆمم پێ وتن کە لەچوارقوڕنە نیشتەجێیە.. ئیتر گەڕامەوە بۆ لای عومەرو ئەوان و نیوەی پارەکەم دانێ، ئەوان رێنماییان کردم کە لای کەس باسی ئەو تاوانە نەکەم، گەر خوانەخواستە گیراشم وشەیەك نەدرکێنم، گەر ناویان بەرم ئەوا هەموو کەسوکارم لەناوچەی خۆیاندا لەناودەبن...

بەڕێز سەرۆکی دادگا لەبرایمی پرسی:

*ئـەی بۆچـی یەکـەمجار بـەدرۆ نـاوی دوو کڕیارەکـەی سـلێمانیت وەك بکوژی جاسم برد؟

بەشەرمەزارییەوە وتی:

-لەترسی هەڕەشەکانی عومەرو عوسمان و خەسرەو...

*ئەی بۆچی ناوی کابرایەکی دیکەت خستە بەردەمی دادگا؟

-بۆ شاردنەوەی راستی تاوانەکەو سەرلێشێوانی ئێوە بوو..!

*باشـە لـەماوەی چـوار مـانگی نێـوان تاوانەکـەو دەسـتگیرکردنت لـەوێ خۆت شاردبووەوە؟

-لەنێوان بەغداو رومادی و هەولێرو موسڵدا دەهاتمو دەچووم.

*ئـەی دووبـرا کڕیارەکـە بـۆ سـاغ کردنـەوەی مامەڵـەی ئوتومبێلەکـە سۆراغیان نەکردی؟

-بـەڵێ، مـاڵی باوکمیـان لـەرومادی دۆزیبـووەوە بـەڵام منیـان چـنگ نەکەوتبوو... کە دەستگیر کرام لەراستی مەسەلەکە حاڵی بوون.

## سەرنجێک و ناسینەوەی لەدادگا

بـۆ گرتنـی بـرایم لـەرێگای مـامی و مـاڵی باوکییـەوە پـۆلیس زانـی کـەئوتومبێلێکی نـوێی کڕیـوەو کـاری پێـدەکات، ژمارەکـەی درایـە پـۆلیس تـاگیرا، واتـە خـۆی و ئوتومبێلـە نوێیەکـە... پاسـە کۆسـتەرەکەی جـاسمیش لەگەڕاجی ماڵە خزمێکی دووبرا کڕیارەکەدا دۆزرایەوە.

لەشایەتەکاندا تەنیا دووانیان برایمیان لەگەڵ جاسمدا دیبوو، ئەوانیش ڤیانی خوشکی جاسمو فەوزیەی کچی پووری بوون، هەر کە پیاوکوژیان هێنایە قەفەزی تاوانبارییەوە هەردووکیان پەنجەیان بۆ درێژ کردو بەرەو رووی خۆی قسەکانیان بەدادگا وت کەلەماوەی پێک گەیشتنیاندا کردبوونی...

## یەکەمجار بڕیاری دادگا چی بوو...؟

دادگای جنایاتی سلێمانی دوای ئەوەی لای ئاشکرا بوو کە برایم بەمەبەستی کوشتنی جاسم ئامێرێکی نووك تیژی لەدواوە توند کێشاوە بەسەریدا ئێسکی سەری شکاوەو خوێنی بەربووەو بەوەگیانی لەدەست داوە. هەر بۆیە بەپێی مادەی (٤٠٦)وبە گوێرەی دەلالەتی (١٣٢) بڕیاری بەندکرنی هەمیشەیی بەسەردا داوە، دەلالەتی ناوبراویش بۆ ئەوەیە کەتاوانبار یارمەتی دادپەروەریی داوەو خۆی دانی بەتاوانەکەیدا ناوەو هەر سێ گومان لێکراویش (عومەرو عوسمانو خەسرەو)بەداوایەکی جیاواز دادگایی بکرێن، دواجاریش لەو رۆژەدا واتە ٩٨٩/١٢/٢٤بڕیار دراوە کە تەواوی داواکەو بڕیارەکە بنێردرێت بۆ دادگای تەمیز.

## وەڵامی تەمیز چی بووە...؟

دادگـای تـەمیز لـە١٩٩٠/٣/٢٧ بـەم شـێوەیە بـۆ جنایـاتی سـلێمانی دەنووسێ:

دەبیـــنین دادگـــای جنایـــات هۆکـــاری تاوانەکـــە لـــەو روانگەیـــەوە هەڵدەسەنگێنێ کەکەسێکی خراپەکار ئەو تاوانەی کردووە، بەڵام ئەوەیان نەخستۆتە روو کە تاوانی یەکەم (کوشتنی جاسم)ڕێ خۆشکردن بووە بۆ تاوانێکی دیکە کەئوتومبێل دزینە، هەر واش بووە، تاوانبارو هاوڕێکانی دوای کوشتنی جاسم ئوتومبێلەکەیان دزیوەو فرۆشتوویانە، بەوەش نیازی ئەوان هاتووەتەدی، کەواتە ئەو بڕیارە پیاچوونەوەی دەوێ‌و داوا دەکەین سەرلەنوێ دادگایی تاوانبار بکرێتەوە، بەلای ئێمەوە بۆ ئەم تاوانە گەورەیە رەوا نییە پەنا ببرێتە بەر مادەی ١٣٢، بەڵکو دەبێ سزایەکی وای تاوانبار بدرێت کەبەرامبەر بەتاوانەکەی بێ..

## پارێزەریش داوای هەیە...

لەدوا رۆژی ساڵی ١٩٩٠دادگا جنایاتی سلێمانی جارێکی ترو لەسەر داوای دادگای تەمیز دادگایی برایمی سەر لەنوێ کردوەو بەپێی مادەی ١/٤٠٦/ج لەیاسـای سـزادان‌و بەدەلالـەتی مادەکـانی ٤٧/٤٨/٤٩ی هـەمان یاسا تۆمەتیان خستەپاڵی، بەرێز داواکاری گشتی پشتگیری لەوەکرد بەپێی مادەو دەلالەتە ناوبراوەکان سزای رەوابدرێ، بەڵام پارێزەری بەرگریکەر لەتاوانبار وتی:

-گومـان لێكـراو یارمـەتی دادوەری داو هیـچی نەشـاردەوە لێتـان، گـەر خۆی دانی بەتاوانەكەدا نەنایە ئەوا تاوانەكە نادیار دەمایەوە، گەر لایـەنی كۆمەلاّیـەتیش بگـرین ئێمـە جـاسمی خوالێخۆشـبوومان لەدەسـتدا، ئـەی بـۆ ئـەمیش لەدەسـت بـدەین كەلـە هـەرەتی لاوێتیدایـە؟! ئایـا بەنـدكردنی هـەتا هـەتایی بـەس نییـە؟! سـزای ئەوەنـدەی بەسـە هـەموو تەمـەنی خـۆی لـەنێو دیواری بەندیخانەو ئەودیوی شیشەكانەوە بەسەر بەرێت... ئەوەندەی بەسە تا بەیەكجاری چاولێكدەنیّ ویژدانی ئازاری بداتو هەرگیز ئارام نـەبیّ...! گەر بەختی هەبێت، ئەوا كاتێ بەندیخانە جێدێڵی تـەواو پیرو پەككەوتەیـەو ژیانێكی وای بۆ نامێنیّ، بۆیە داواكارم بڕیاری یەكەمجاری خۆتـانی بەسـەرا بدریّ...

## دوا بڕیاری دادگا..

لەو شەش مانگەدا كە برایم میوانی هەمیشەیی كونجێكی بەندیخانە بوو، هێندەی ئەم ساتە تـرس سەرانسـەری گیانی نـەگرتبووەوە... بـەو لاوێتییـەی خۆیـەوە پـشتی كـوڕ بـوو بـوو، تـەمی ڕەش بـەری هـەردوو چـاوی دەگـرت، لـەرووی شـایەتەكاندا جـاسمی بـیّ گونـاهو بـیّ دیفـاعی دەدی، تـەنیا یـەك پرسیار رووبەری مێشكی وروژاوی داگیردبوو.

-بڵێی دادگا داوای پارێزەرەكە ببیستیّ؟

دەنگـی بڵنـدو مـرۆڤ پـەروەریی سـەرۆكی دادگـا هێنایـەوە ئاگـا، دادگـا بڕیاری دا:

١-حوكم بەسەر تاوانباردا بدات بەلەسێدارەدان.

٢- دەبێ قەرەبووی دوو هەزار دینار بداتە باوكو دایكی كوژراوەكە.

٣- دەبێ ٢٠٠ دینار بداتە پارێزەری هەردوو داواكار دایكو باوكی كوژراوەكە.

٤- دەبێ بكوژ لەوە بگات كە ئەوراقی داواكەی جارێكی تر دەچێتەوە بەرچاوی دادگای تەمیزو بۆی هەیە لەماوەی سی رۆژدا رەخنە لەم بڕیارە بگرێت...

سەرۆكی دادگاو ئەندامان هەڵسانە سەرپێو دادگا كۆتایی هات، ئامادەبووانی هۆڵەكە كەوتنە جووڵە، پورزاو خوشكەكەی جاسمو باوكو دایكە جەرگ سووتاوەكەی لەخۆشیاندا دەستیان كردە ملی یەكو...

تەنیا كەسێ كەكەوتە سەر چۆكو لەزەویەكە جیا نەدەبووەوە هەر برایم خۆی بوو..!

دوای مەلا بانگدانی رۆژی٧/٢ئەوکاتەی خاڵە حەمەی شاربازێڕ گەیشتە سەرحەوزی مزگەوت، بەرلەوەی بۆ دەست نوێژگرتن دابنیشێ، لاشەی پیاوێك تەواو سەرنجی راکێشا... لێی نزیك کەوتەوە، بینی هەردوو دەستو قاچەکانی بەستراونەتەوە، کەبەباشی سەرنجی دا، هەستی کرد تەواو بووەو مردووە..!

## ئەوە لاشەی کێ بوو؟..

سەرلەئێوارەی هەمان رۆژ، کاتێ لاشەی سەرحەوزەکە گەیەنرایە بەشی پزیشکی دادوەریی لەسلێمانی، لەراپۆرتی پزیشکدا ئەم زانیاریانە تۆمارکران:

ناو: شەماڵ قادر

تەمەن: ٣٥ساڵ

رەنگی قژ: رەش

پێست: گەنم رەنگ

بالآ: مام ناوەندی

چاوانی: رەش

جلو بەرگی: کوردی

هۆی راستەقینەی مردن: خنکاندن...!

## دایکی کوژراوەکە قسە دەکات..

رۆژی ٢/٨/١٩٩٤دایکە سەرسپییە٧٠ساڵەکەی شەماڵی خنکێنراو بەدادگای بەرێزی وت:

-من خۆم هیچم نەدیوە، ئەم گومان لێکراوانەش ناناسمو لەعومرمدا چاوم پێیان نەکەوتووە، لەوەو بەریش چونکە نایانناسین هیچ جۆرە ناخۆشیو دوژمنایەتییەك لەنێوانماندا نەبووە، من بێوەژنمو شەماڵی جوانەمەرگ دەیژیاندین، بەڵێ ئەو بەخێوکەری منو خوشکەکانی بوو.. بەر

له رووداوەکه بەرۆژێك شەماڵ وتی ((دایکه ئەڕۆمەوە گوندی (پ)بۆ سەر زەرعاتەکەمان...))، ئەوە بوو چاوم پێی نەکەوتەوەو رۆژی دوای رووداوەکه ئەو هەواڵە جەرگ برەیان بۆ هێنام، دواتر بکوژانی خەڵکیان نارد تا رێك بکەوین، بەڵام ئێمە نەمانکرد، ئێستا من داوای سزا دەکەمو داواکاریشم خوێنی کوڕەکەم پێبدەن..

## گومان لێکراوان کێ بوون؟..

ئەوانەی بەتۆمەتی لەناوبردنی (شەماڵ) گیرابوون، یان خۆیان بەدەستەوە دابوو، بریتی بوون لە:

-جەبار، تەمەنی ٢٦ساڵ، پیشە، کاسبکار

-حیکمەت، تەمەنی ٢٥ساڵ، کەمئەندام (برای جەبار)

-سەیران، تەمەنی ٢٤ساڵ (ژنی جەبار)

پارێزەری بەرگریکەر لەسەیرانی ژنی جەبار بەدادگای بەڕێزی وت:

-وا بۆ پێنج مانگ دەچێتو سەیران لە بەندیخانەدایە، ئەم کە خاوەنی منداڵە لە جەبار، قوربانیی راستەقینەی تاوانەکەیە، سەیران لەلایەکەوە شەماڵ دەستدرێژی کردووەتە سەر نامووسیو لەلایەکی تریشەوە لەلایەن خەڵکی گوندو کەسوکارەکەیو مێردەکەیەوە بەچاوی سووك تەماشای دەکرێ، ئەم هەرچەندە بێتاوانە بەڵام مێردەکەی وەك جاری جاران چارەی ناوێتو خۆیشی خەریکە باوەڕی بەخۆی نامێنێو رۆژ لەدوای رۆژ برینی قووڵتر دەبێت.. سەیران ئاگاداری کوشتنی شەماڵ نەبووە، تەنانەت کاتێ شەماڵ کوژراوە ژیانی ئەمیش لەمەترسیدا بووە، باشترین بەڵگەش ئەوەیە مێردەکەی هەر ئەو شەوەو لەدوای خنکاندنی شەماڵ بەربۆتە وێزەیو لێی داوەو ددانی شکاندووەو سەروچاوی بریندار کردووە، دواتر براوەتەوە لای چەند پزیشکێك بۆ چارەسەر.. لێرەدا من داوا لە دادگای بەرێز دەکەم

بڕیاری ئازادکردنی بدرێت، چونکە هیچ بیانویەك نییە بۆ هێشتنەوەی لەزیندانندا.

**سەیران بەسەرهاتی تاوانەکەی ئاوا گێڕابۆوە....**

بەر لەدادگایی کردن، سەیران کە برابووە بەردەمی دادوەر، بەم شێوەیە چۆنیەتی کوشتنی شەماڵی باسکردبوو:

-١٠ساڵە ژنی جەبارم،٣منداڵمان هەیەو حیکمەتی شووبرام کەنوقسانە لەگەڵ ئێمەدا دەژیو ژووری جیای خۆی هەیە، شەوی ڕووداوەکە مێردەکەم لای ئێمە نەبوو، چەند ڕۆژێ لەوەوبەر بۆ کەسابەت چووبووە ئەودیو، ئەوشەوە (شەماڵ)بۆ هێنانەدی نیازی خۆی درەنگانێ خۆی گەیاندە ژوورەکەی من، مناڵەکان خەوتبوون، دەیویست بەزۆر کاری خۆی بکات، لەوکاتەداو لەو نیوەشەوەدا مێردەکەم گەڕایەوە، لەدەرگای ژوورەکەی دا، شەماڵ نەیهێشت لێی بکەمەوە، دوای لەدەرگادانی دیکەو بانگ کردنم دەرگام کردەوە، هاتە ژووریێو شەماڵی بینی، شەماڵ دەمانچەکەی ڕاکێشاو هەڕەشەی کوشتنی لێ کردین، جەبار هێمنی کردەوەو دواتر فرسەتی لێ هێناو دەمانچەکەی لێ سەندو گرتیو پەلبەستی کردو لەگەڵ خۆی بردی، منو حیکمەت (کەبەهاتنەوەی جەبار بەئاگا هاتبوو)هەر ئەوەندەمان ئاگا لێ بوو، پاش ماوەیەك هاتەوەوسەعاتو دەمانچەکەو(٩٠)دیناری نێو قەمسەڵەکەی شەماڵی دایە دەست حیکمەتو وتی(ئەمانە بدەوە بەکەسوکاری، ئەمانە هی ئەون،کوشتم...کوشتم)،ئەوانەی وتو بەربووە منو ددانەکانی شکاندمو ئازارێکی زۆریدام، ئیتر ئەوە بوو هاتینەوە شارو دوای چارەسەری من خۆمان تەسلیمی پۆلیس کرد، من هیچ پەیوەندییەکی خۆشەویستیم لەگەڵ(شەماڵ)دا نەبووە، بەلام لەوەوبەر جارێکی تر

کەمێردەکەم لەماڵ نەبوو بەچەکەوە هاتە سەرم‌و بەزۆر مەرامی خۆی هێنایە دی. من نەموێرا ئەو نهێنییە لای مێردەکەم‌و کەسوکارم ئاشکرابکەم.

## جەبار دان بەتاوانەکەیدا دەنێت..

چەند رۆژێك دوای تاوانەکەی،ئەو کاتەی جەبار خۆی‌و ژنەکەی‌و براکەی دایە دەستی پۆلیس، لەیەکەم رۆژی لێکۆڵینەوەداو دواتریش‌و رۆژی دادگایی کردنەکەش، بێ ئەملاوئەولا و ئاشکرا تاوانەکەی گێڕابوٚوە... لەدادگایی کردندا جەبار وتی:

-دەوروبەری سەعات(١٢)ی نیوە شەوبوو، بە لەشی شەکەتەوە گەیشتمەوە گوند، کەچوومە ماڵەوەو دوای ئەوەی حیکمەتی برام لەخەو راپەڕی‌و هەرکە چووینە ژوورەکەی خۆم، سەیران بەپەشۆکاوی‌و شپرزەیی هاتە بەردەمم، منداڵە بچووکەکانمان لەشیرین خەودا بوون، شەماڵ کە لەوەوبەر بەهۆی سەردانی گوندەوە دیبووم‌و کەمێك یەکترمان دەناسی لەسوچێکی ژوورەکەدا راوەستا بوو. دەمانچە میکارۆفەکەی بەدەستەوەبوو، هەرزوو پێی لەپەیوەندیی خراپ‌و نارەوای خۆی‌و سەیران نا، وتی: ((خۆشم دەوێ‌و جارێکی تر پێی گەیشتووم))، بەڵێ بەزۆر تەعەدای لەسەیران کردبوو، من ئاگرم گرت، لەناوەوە دەکولام، بەلام بۆ چارەسەری دەمانچەکەی دەستی دانم بەخۆدا گرت‌و پێم وت:

-قەیدی چییە، گەلێ جار شتی وا روویداوە، مادام دڵتان پێکەوەیە منیش تەلاقی دەدەم‌و تۆ بیهێنە..!

دەمانچەی خستەوە ناو کیفەکەی‌و فرسەتم لێهێنا و لێمسەندو چینێکی باشم لێدا... بە وایەری کارەبا دەست‌و قاچیم بەستەوەو بەشتێك توند دەمیشیم بەستەوەو دام بەکۆڵمداو بردمە مزگەوت، لەوێ سەریم خستە ناو حەوزەکەوەو تا نەخنکا وازم لێ نەهێنا. دەمانچەو پارەکەی‌و سەعاتەکەی

دەستیم هێنایەوەو دامنە دەستی حیکمەت، بەلاّم بۆ شوێنەونی قەمسەڵەکەیم سووتاند..!

هاتمەوە ماڵێ لەسەیرانم دا، بەلاّم هەر رۆژی دوایی کەهاتینەوە شار بەزەییم پیایدا هاتەوەو بردمە چارەسەر..

من ئەو تاوانەم بۆ سڕینەوەی لەکەی عار کرد، دەنا من تاوانکار نیم و لەوەوبەر هیچ تاوانێکم نەکردووە.

## جەبار رووده‌کاتە زیندان...

دوای سەرنجدان لەوکێشەیە، دادگای سلێمانی لەو باوەڕەوە کە جەبار بەبڕیاری لەوەوپێشی شەماڵی نەکوشتووەو رووداوەکە بەهۆی لەکەدار کردنی ناموسی جەبارو ژنەکەیەوە بووە، بۆیە بەپێی ماددەی(٤٠٥)سزای تاوانکار(جەبار)ی دا کە بریتی بوو لە:

١-زیندانی کردنی بۆ ماوەی دووساڵ.

٢-دەبێ بڕی (١٠)هەزار دینار بداتە دایکی شەماڵ.

٣-شتەکانی شەماڵ دەنێرێتەوە بۆ دادگای کاروباری کەسێتی.

٤-هەردوو گومان لێکراو(سەیران)و (حیکمەت )ئازاد دەکرێن.

پاش دەرکردنی ئەو بڕیارە، پارێزەری (دایکی شەماڵ) قایل نەبوونی خۆی دەربڕی بەرامبەر بەبڕیاری یەکەم، ئەوەش لەپیاچوونەوەی دادگای تەمیزی هەرێمدا لێی کۆڵرایەوەو رای تەمیزیش هەر وابوو، لە سەرلەنوێ دادگایی کردنەوەی جەباردا، رۆژی ١٩٩٤/١٢/٢٧بڕیاری زیندانی کردنەکەی جەبار کرایە(٦)ساڵی تەواو، بەوەش پەردە بەرووی ئەم تاوانەشدا دادرایەوە کەبووە هەوێنی ئەم چیرۆکە هەواڵەمان.

قەدەری ژیانی٢٦ساڵەی (مەریوان)پیشەی پاسەوانی بوو لەو گەڕاجەی کەبوو بووە مایەی بژێوی خۆی‌و دایکە بێوەژنەکەی، بەپێچەوانەی زۆربەی پێشەوەرو کاسبکارانەوە دەژیان‌و شەوگارو رۆژگاری خۆی دەبردە سەر، بەڵێ ئەو شەوان لەسەر کارو نیوەڕوان دەچووەوە لای دایکەکەی..

سەرەتای وەرزی تشرین بوو، کات بەرەو نیوەشەو دەچوو، لەدەرەوە نمە نمە باران دەباری‌و شەقام‌و گۆرەپانی گەڕاجەکەو ئەو چەند ئوتومبێلەی تەڕ دەکرد کەبەئەمانەت بەگەراجەکە سپێردرا بوون..

بەرێکەوت نیوەڕۆی ئەو رۆژە مەریوان دەنگ‌و باسی سلێمانی‌و شتی دیکەی بۆ دایکە بەسۆزەکەی باسکرد بوو، ئەویش وەك زۆرجاری دی لێی دووبارە کردبووەوە کەپێویستە کچێ دەست نیشان بکات‌و بیکاتە هاوسەری ژیانی، مەریوان هەرچییەك وەڵامی بووایە دایکی پێی دەووت:

–رۆڵە هەر لەبەر من ئەو کارە بکە، با منداڵی تۆ ببینم، باجەرگی جەرگەکەم بلاوێنم، رۆڵە مەردی خوابە رەفیقی تۆ چوار پێنج ساڵە بوونە خاوەنی ژن‌و منداڵی خۆیان، دە چی تر دڵم مەشکێنەو ئەو کارە بکەو با لەبەری درەختی خۆم بخۆم، بهێڵە ئاواتی من بێتە دی..

ئەویش ئەملاو ئەولای دایکی بەرێزی ماچ دەکردو دەیووت:

–بەڵێ باشە، بەسەرچاو دایکە گیان... ئەمر دەکەی دایکی من..

مەریوان سەری کێشایە دەرەوەو هەموو شتێ ئارام بوو، هاتەوە ژوورەوەو لەسەر قەرەوێڵەکەی دانیشتەوەو چاوی بڕییەوە تەلەفزیۆنی نێو ژوورەکە.

## ڕۆژی دوایی مەریوان لەکوێ بوو؟!

بۆ سبەینێ، واتە٦/١٠، زۆر بەبێ کەسیو دوور لەدایكو کەسوکارو بەو پەڕی کەساسیو بێ نازییەوە مەریوان بریتی بوولەجەستەیەکی ساردی بێ جوڵەو بێ هەست، لە نیوەشەوی ڕابردوودا دەستی تاوان گیانی کێشا بوو...

لاشەی مەریوان لەپشتی گۆڕستانی شێخ ئەحمەدی هەندیو لەسەر ڕێگەکەی (معسكر) ساردو فڕێ درابوو، جێگای چەند فیشەکێ بەدەوری لاشەکەی مەریوانەوە بوو، بەڵام هیچ فیشەکێ بەرخۆی نەکەوتبوو.

ئەی باشە چۆن مرد؟! چۆن کوژرا... کێ ئەو کارەی کرد؟ بۆچی خەونو ئاواتی دایکە بەدبەختەکەی مەریوان لەناوبرا؟!

## شایەتی یەکەم چۆن باسی لەمەرگی پاسەوانەکە کرد؟

-هەر ئەو شەوە (ئاسایش) تەلەفۆنیان بۆ ماڵی ئێمە کردو وتیان وەرە بۆ گەڕاجەکەتان.

کاك ئاری خاوەنی ئەو گەڕاجەی مەریوان پاسەوانی بوو ڕۆژی ١٩٩٤/٦/٨بەو شێوەیە قسەی بۆ دادگا کرد، پاشان وتی:

-دەوری سەعات(١)ی شەو بوو کەتەلەفۆنەکە کرا، ئیتر یەکسەر چوومە گەڕاجەکەو لەوێ زانیم کەمەریوان فڕێنراوەو دوای ئەوەش دوو ئوتومبێل دزراوە، یەکیان سۆپەرێکی سپی مۆدێلی ٨٢، ئەوی تریان سۆپەرێکی سووری مۆدێل ٨٥،هەروەها تەلەفزیۆنێکی ڕەنگاو ڕەنگی ئێمەو تفەنگێکی کلاشینکۆف کەدابوومانە مەریوان.

## خاوەنی دوو ئوتومبێلەکەش قسەیان کرد

خاوەنی سۆپەرە سپییەکە وتی:

-هەر ئەو شەوە ئۆتۆمبیلەکەی من لەو گەراجەدا بوو، ئەوە بوو بردیان‌و دوایی بۆیان هێنایەوە، شکاتم بەرامبەر هیچ کەسێك نییە!..

خاوەنی سۆپەرەکەی دیکەش وتی:

-هاورێیەکم بەسەفەر هاتە سلێمانی‌و داوای ئۆتۆمبێلی لێکردم‌و منیش دامیێ، من خۆم لە(بانە)پزیشکم، کەدزەکان ئوتۆمبێلەکەیان لەو گەراجەدا فراند بوو زۆر عەزێتیان داوەو زیانی زۆریان پێ گەیاندووە، هەرچەندە ئوتومبیلەکە گیراوەو دەدرێتەوە پێم بەلاّم پێویستی بەپارەیە بۆ چاك کردنەوەی، داوا لەدادگا دەکەم پێیانی چاك بکەنەوە.

## ئەی دایکی داوای چی لەدادگا کرد؟

دایکە ٥٦ساڵەکەی مەریوان لەبەردەم دادگای بەرێزدا وتی:

- من بەچاوی خۆم مەرگی کورکەم نەدی، بەلاّم بۆیان باسکردووم کەچۆن چۆنی دزە تاوانبارەکان بێ ویژدانانە (مەریوان)یان کوشتووە... مەریوان ژنی نەهێنابوو، لەو کاتەوە کەباوکی تەلاّقی داوم ئەو بەخێوم دەکات، بەقوربانی بم درێخی لەگەڵدا نەدەکردم، بەلاّم ئێستا بێ کورو بێکەس ماومەوە، داوا دەکەم هەقی من لەتاوانباران بستێنن،هەقی جەرگی سووتاوم، نازانم بۆچی وایان لێکردم، کوێراییم دایە کەچووینە سەر لاشەکەی تەنیا (٥)دینار لەگیرفانیا بوو..(ئەمەی وت‌و دایەگریان)..

## بەسەرهاتی هەردوو تاوانەکە

کەریم یەکێ بوو لەو(٧)تاوانبارەی بەشداریی کردبوو لەهەردوو تاوانەکەدا، تاوانی کوشتنی مەریوان‌و تاوانی دزینی هەردوو ئوتومبیلەکە، کەریم لەگەڵ چوار هاوکاریدا دوای تاوانەکانیان دەستگیر کرابوون، بەڵام دووانیان بۆی دەرچوو بوون، تەنیا کێ بێ لەعەدالەت هەڵبێت‌و ئاسوودە بێ؟! کەریم قسەی بۆ دادگا کرد ئەوانی دیکەش هەروەك ئەو قسەیان کرد، کەریم وتی:

یەکێ لەبرادەرەکانی ئێمە لەپێش مەریواندا پاسەوانی گەراجەکەبوو، بەڵام دەرکرا بوو و بێ ئیش بوو، لەگەڵ ئێمەدا رێکەوت کەشەوێ بچینە گەراجەکەو تاچەند توانرا ئوتومبێل ببەین، ئێوارەی ئەو رۆژە بڕیاردرا کەئەو کارە بکەین، شەوی رووداوەکە لەدەوری سەعات(١١)دا بەکۆستەری باوکی برادەرێکی بەشدارمان برادەرەکانی دیکەمان کۆکردەوەو لەنیوە شەو تێپەری کردبوو کەگەیشتینە ئەوێ، خۆمان کرد بەگەراجەکەدا، دابەزین‌و چووینە ژوورەکەی مەریوانی پاسەوان، هەردوو دەستیمان توند بەستەوەو بەوایەرێکی کارەبا خنکانمان، بەڵێ وایەرەکەمان خستە ملی‌وتوند رامان کێشا تاچاوەکانی زەق بوون‌و رەنگی زەرد هەڵگەراو هەناسەی لێبڕا، مەریوانمان خستە نێو کۆستەرەکەوە، تەلەفزیۆنی ژوورەکەو کلاشینکۆفەکەشمان برد، ئینجا هەردوو سۆپەرەکەمان دەرکردو رۆیشتین، بەهەواری تازەدا بەرەو ئەو رێگایەی ساردا و لەپشتی گۆرستانەکە کەوتینەرێ، لەوێ (مەریوان) مان فڕێداو(شێروان)چەند فیشەکێکی پێوەنا،

لەیەکتر جیابوونەوەو بەسەر ئۆتۆمبیلەکاندا دابەش بووین، بۆ بەیانی زوو بەرەو ناوچەی پشدەر کەوتینە ڕێ، لەرێ یەکێ لەئوتومبیلەکان پەکی کەوت و هەموومان لەو کاتەدا(٥)کەس بووین، ئۆتۆمبیلەکەمان جێهێشت و هەموو سواری ئەوی تریان بووین، ویستمان ئۆتۆمبیلەکە لەوێ بفرۆشین و بکرێت بەودیودا، بەلاّم بۆ رۆژی دووەم لەلایەن حکومەتەوە گیراین.. ئێمە کەئەو کارەمان کرد تەنیا(٣) کەس چووینە گەراجەکەو دووانی ترمان لە هەوارەبەرزە لەماڵی حەمە چاوەڕوانمان بوون..

## دادگا سزای تاوانبارەکان دەدات

دادگای جنایات بۆ ئەو کێشەیە گوێی لەپارێزەرانی گومان لێکراوان گرت، هەروەها گوێبیستی قسەی داواکەرو شایەتەکان بوو، داواکاری گشتی داوای توندترین سزای کرد بەرامبەر تاوانبارەکان و فەرمووی:

-باچی دی تاوانی درندانەی بەم شێوەیە بەها پیرۆزەکانی ژیان و کۆمەڵمان نەشێوێنێ...

سەرۆکی دادگا، بڕیاری دادگای بەم شێوەیە راگەیاند:

-تاوانەکە بەوجۆرە ئەنجامدراوەو کاتێ(مەریوان) خراوەتە ناو پاسەکەوە شایەتێ لە ئوتومبیلە بەرازیلییەکەی خۆیدا بووەو ئەوەی بینیوە، کەتاوانکاران دەڕۆن هەواڵ دەداتە ئاسایش و دواتریش مەریوان بەمردوویی دەبینرێ، دووان لەتاوانباران لەلایەن پۆلیسی پشدەرەوە دەگیرێن، یەکیان لەعەربەت و یەکیان لەسلێمانی و ئەوەی تریشیان ویستبووی بەرەو ئێران

هەڵبێت، بەڵام لەڕێگا دەگیرێ، دووانەکەی تریش کەبەشداری تاوانەکانن خۆیان شاردۆتەوەو داواکەیان جوداکراوەتەوەو دواتر دادگایی دەکرێن.

دواتریش بەرێز سەرۆکی دادگا بڕیاری حوکمەکانی بەمجۆرە ڕاگەیاند:

١- لەسێدارەدانی کەریمو دووانی تر لەتاوانبارەکان بە لەسێدارەدان تا مردن، (تەمەنی ئەو سیانە٢٢، ٢١، ٢٦ساڵ بوون).

٢-حوکمدانی دووانەکەی تر بەزیندانی هەمیشەیی (تەمەنیان٢٠ساڵو ١٩ساڵ بوو).

٣- دەبێ هەر پێنجیان بڕی(٢٠)هەزار دینار بدەنە دایکی مەریوان.

٤- دەست بەسەر تفەنگی (R.B.K)-ی تاوانبارەکان دەگیرێو ڕەوانەی وەزارەتی کاروباری پێشمەرگە دەکرێن.

٥- بۆ حوکمدراوەکان هەیە داوای پیاچوونەوەی ئەم بڕیارانە بکەن لەلایەن دادگای تەمیزەوە.

## کەمکردنەوەی بڕیارەکان...

دادگای تەمیزی هەرێمی کوردستان ڕۆژی٢١/٨/١٩٩٤واتە دوو مانگو ١٣ڕۆژ دوای دادگایی کردنی تاوانبارەکان، پاش وردبوونەوەو پیاچوونەوە بەسەر بڕیارەکاندا، ئەم بڕیارە نوێیانەی ڕاگەیاند:

١- یەکێ لەتاوانبارەکان حوکمەکەی لەسێدارەدانەو دەکرێ بەزیندانی کردنی هەمیشەیی (چونکە کاتی تاوانەکە تەمەنی لە٢٠ساڵ کەمتر بووە).

٢- دووەمیان لەسێدارەدانەوە دەکرێ بە هەمیشەیی(مؤبد)چونکە دەرکەوتووە بەشداریی فیعلی نەکردووە لەکوشتنی پاسەوانەکەدا.

٣- لەبەر هەلومەرجی تاوانەکەو چونکە یەکەمجارە تاوان دەکات، سێیەم بەزەیی هەڵدەگرێ و ئەویش دەکرێ بەزیندانی هەمیشەیی.

٤- دووانەکـەی تـر کـە حـوکمی زینـدانی کردنـی هەمیـشەیی دراوە بەسەریاندا پەسەندە.

دوای ئەوەی (شەوکەوت)ی تەمەن (٤٩) ساڵ لەلایەن کەسوکاری خۆیــەوە شــکاتی لێکــرا، رۆژی ٢٠٠٢/٣/٢ بەتۆمــەتی کوشــتنی (توانا)ی برازای دەستگیرکراو خرایە زیندانەوە.

لــەرۆژی ٢٠٠٢/٤/٢٧ دا بــۆ جێبــەجێکردنی بڕیــاری دادوەری لێکۆڵینــەوەی سلێمانی لـە(گرێـزە) تیمێك كـەپێکهاتبوو لەئەفسەری پۆلیس‌و پزیشکی دادوەری لەگەڵ باوکی (توانا)، سەعات ١٠,٣٠ی پێش نیوەڕۆ گۆڕی ئەو جوانەمەرگە تەمەن (٢٥) ساڵەیان هەڵدایەوەو دوای ئەوەی پزیشکەکە دابەزییە ناو گۆڕەکە کفنەکەی لەسەر (توانا) لابــرد، دەســتیکرد بەپــشکنینی لاشــەکەو ســەرنجدانی.. پــاش تـەواوبوونی کارەکـەی لەگۆڕەکـە هاتـەدەرەو ئامادەبووان خۆڵەکـەیان دایـەوە بەسـەردا، لـەو نـاوەدا بـاوکی توانـا بەچیـچکانەوە دانیـشتبوو سەرنجی ئێسك‌و پروسکی جگەر سۆزەکەی دەداو هۆن هۆن ئەسرین لەچاوەکانی دەڕژان.

دواتر پزیشکەکە راپۆرتی خۆی نووسی‌و تیایدا ئامـاژەی بەوەدا کەکوژراوەکە فیشەکێك بەر بڕگەکانی ملی کەوتووەو بەوە مردووە، ئیدی هیچ فیشەکی دی بەئەوەوە دیار نییە.

## توانا بۆچی کوژرا؟

رۆژی ٢٠٠٢/٧/٨ دادگــــایی تۆمــــەتبارکرا لــــەداوای ژمــــارە (٢٩٤/ج/٢٠٠٢) بۆ ئەو تاوانە، دوای ئەوەی نۆرەی قسەی (رەحمانی سایەق) هات، بەمجۆرە سەربوردەی مەرگی کوڕەکەی گێڕایەوە:

-ڕۆژی ١٩٩٥/٧/٥، سەرلەبەیانی بوو کەئوتومبێلەکەم خستەکارو بۆ کارو کاسبی ماڵم جێهێشت، ئەو ڕۆژە تائێوارە نەگەڕامەوە ماڵ، ئێوارە هەر کەهاتمەوە هەواڵی کوژرانی توانای کوڕم وەك بروسکە دای لەدڵ و دەروونم، دوای ئەوەی سۆراخمان کرد زانیمان کە لەباریکە لەلایەن شەوکەتی مامیەوە کوژراوە، نەمزانی بەئەنقەست کوشتویەتی یان لەئەنجامی دەمەقاڵێ بووە، یاخود قەزاو قەدەر ئەوەی کردووە، هەر خۆم لاشەکەیم شت و دوایی لەگرێزە بەخاکمان سپارد.

براکەم و کوڕەکەم لەسەر مەسەلەی زەوی وزار هەندێ ناکۆکیی لەنێوانیاندا بوو، هەر بۆیە ئەو کارەساتە ڕوویدا، بەڵام دوای ئەوەی خزم و خۆشەویستان کەوتنە بەینمانەوە بڕیارمدا لەخوێنی کوڕەکەم خۆشبم.. چی بکەم، ئەمیش برامەو خاوەنی خێزان و منداڵە، چی بکەم خوا وایکرد..

هەر لەدادگادا زانرا کە بەهەزاران دینار (سولح) لەسەر خوێنەکەی (توانا) کراوە..

دایکیشی بەدادگای بەڕێزی وت:

-ئێمە لەگرێزە دەژیاین، بەڵام توانای جوانەمەرگ بۆ کاسبی دەچووە باریکە، بیستمان فیشەکێ بەر ملی کەوتووە، لەوەوبەر هیچ شەڕو ناکۆکییەك لەنێوان خێرلەخۆنەدیوەکەی من و شەوکەتی مامیدا نەبوو، بەڵام لەسەر گرفتی زەوییەکە بووە شەڕیان و ئەو کارەساتە ڕوویدا.

من دەستبەرداری داواکەمو هیچم لەشووبراکەم ناویۆ لێی خۆشدەبم..!

## شەوکەت پاشگەز دەبێتەوە!

هەمان رۆژ لەدادگادا، شەوکەت لەقسەکانی لەوەوبەری کە لەلێکۆڵینەوەدا بەپۆلیسو دادوەری وتبوو پاشگەزبووەو بەمجۆرە کەوتە قسەکردن:

–من هیچ گوناهێکم نییەو ئەو تۆمەتەی خراوەتە پاڵم راست نییەو من توانام نەکوشتووە.. رۆژی رووداوەکە توانا هاتەماڵەکەم، پاش ماوەیەك کەوتە پاککردنەوەی تفەنگەکەی منو رێکەوت فیشەکێ لەتفەنگەکە دەرچوو بەر ملی کەوتو ئەوە بووە هۆی مردنی.. ئیتر نەشەڕمان بووەو نەهیچ..

دوای ئەوەی دادوەر پرسیاری دانپیانانی لەوەوپێشی لێکرد، وتی:

–ئەوەی لەزمانی منەوە نووسراوە راست نییە، نازانم بۆچی وانووسراوە!

کاتێکیش دادگا لێی پرسی ئەی چۆن خۆت نەتگەیاندە نەخۆشخانە، ئەو وتی:

–ئاخر من نەمتوانی، بەڵکو ناسیاوو دراوسێ بردیان بۆ نەخۆشخانە!

## پارێزەرو داواکاری گشتی وتنیان چی؟

دوای قسەی ئەوان، پارێزەرەکەی شەوکەت بەدادگای وت:

-دادگا دەیەوێ بەپێی مادەی یاسایی ٤٠٥ دادگایی تۆمەتبار بکات، ئەویش لەتاوانی کوشتنی برازاکەی خۆیدا، بەلام چونکە لەقۆناغەکانی لێکۆڵینەوەدا دانی بەتاوانەکەیدا ناوەو خۆیشی کەسی نزیکی کوژراوەکەیەو ئەوان خۆیان، واتە باوکو دایکی توانا لێی خۆشبوون، هەربۆیە داواکارم دادگای بەڕێز هەموو ئەوانە لەبەرچاوبگرێت.

داواکاری گشتیش بەمجۆرە هەڵوێستی خۆی راگەیاند:

-دیارە هەر بەو فیشەکەی دەمانچەکەی شەوکەت، توانا پێکراوەو لەئەنجامی خوێن بەربووندا گیانی سپاردووە، ئەوان لەسەر هەندێ زەوی‌وزار بووەتە ناخۆشییان، دوای کوژرانی ئەو باوکی ٢٣ هەزار دیناری لەشەکەوت وەرگرتووەو بەوە لێی خۆشبووە، هەرچەندە رووداوەکە بەبڕیاری لەوەوپێش ئەنجام نەدراوەو لەوساتەدا شەوکەت تووڕەبووەو دەمانچەی پێوەناوە، بەلام داواکارین کەبەپێی مادەی ٤٠٥ کەمادەی کوشتنە دادگایی تۆمەتباربکرێتو سزای بدرێت.

## بڕیاری دادگا

بەبڕوای دادگا تاوانەکە روونو ئاشکرایەو بێپێچو پەنایە، هەر لەو ساتەشدا روویداوەو لەوەو بەر بڕیاری نەدراوە، دادگا بەپێی مادەی ٤٠٥ بڕیاری دا کە:

(بە١٠ ساڵ زیندانی کردن بڕیار بەسەر شەوکەتدا بدرێ).

ئەو رۆژە کەسەرەتای مانگی هاوین بوو، دایكو باوکی (توانا) بەرەو گرێزە بەدەروونی گەرمەوە گەڕانەوەو شەوکەت سەرلەنوێ برایەوە زیندانەکەی کە چوار مانگو شەش رۆژی تیادا بردبووە سەر.

هەفتەیەکە لەگەڵ راژەنینی بێشکەدا فرمێسک لەچاوانی دەڕژێن و سوێی دڵی دانامرکێتەوە..

شیرین لەخۆی دەپرسێ:

-باشە کەی من وەختی سەفەرو سەردانیماڵە باوکم بوو؟ بەتایبەت کەهەموو رۆژێ (یونس) لێم دەپاڕایەوەو دەیگوت ئاگاداری کۆرپەکەمان بە..

-گەر من نەمبردایە بۆ (دوز) بۆ سەردانی برا قاچ شکاوەکەم ئەوە بۆ دەقەوما..

چوار مانگ و هەفتەیەك لەمەوبەر مێردەکەی هیوای خۆی بەستبوو بەلەدایك بوونی منداڵی نۆبەرەیان.. هەمیشە لەگەڵ شیرینەکەیدا باسی لەو رۆژە پڕشادییە دەکرد کەکۆرپەکەیانی تیادێتە دنیاوە..

بەلاّم قەدەر کاری خۆی کردو رۆژگاری چەپگەرد دەستی لەیونس وەشاندو سەفەرەکەی دوز-ی گەڕانەوەی بۆ نەبوو..

## سەردانی ژنبراکەی..

هەر چۆن سالاّنێکی دوورودرێژە کوردانی کەرکوك پەرەوازە دەکرێن و لەزۆر شوێنی ئەم کوردستانەدا خەمی ئاوارەییان لەکۆڵ ناوەو خزمەکان لەیەکتر دوورو دابڕاوکراون.. ماڵی یونس و شیرینی هاوسەریشی بەهەمان شێوە..

بەتایبەت لەدوای راپەڕینەوە بەهۆی پەرتبوون و ئاوارەکردنیانەوە کەمتر بەدیداری کەسوکار شاددەبوون..

مەگەر پرسەیەك، لێقەومانێك، یاخود بۆنەیەك کۆیبکردنایەوە..

خزمەکانی ئەوان بەسەر چەمچەماڵو سلێمانی و هەولێرو دوزخورماتوو و جێگای دیکەدا دابەش بووبوون..

رۆژی ٢٠٠٠/٧/١١ لەو قرچەی گەرماو گڕەیەدا بەهەندێ ئاوی ساردو بەدەرِوونی گەرمو هەڵقرچاوەوە سواری ئوتومبێل بوونو بەرەو (دوز) کەوتنەڕێ..

لەڕێگا زوو زوو یونس تەماشای ژنەکەی دەکردو هێندەی مەراقی ئەوی بوو، دوو ئەوەندە دڵی لای کۆرپەکەی ناوسکی بوو.

گەیشتنە (دوز)و ئەو شەوە لەماڵی باوکی شیرین لەنێو کەسوکارو نزیك برا نەخۆشەکە کاتیان بەسەربرد.. هەموو سوپاسگوزاریان بوون کەبەو گەرمایە، دڵسۆزیی کێشی کردوون بۆ لایان..

### عەسرێک لەگەڵ خزمان..

بۆ رۆژی دوایی، پاش نیوەڕۆ سیان لەخزمەکانی یونس خۆی هاتنە لایان، هەرسێ داوایان لێکرد بچنە دەرو هەوایەکی باڵی خۆیان بدەن..

یونس زۆر دڵی پێوەنەبوو، بەلاّم ئەوانو بەتایبەت کەمال زۆری لێکرد.. لەپەناوە بەچرپە پێی وت:

-کوڕی باوکم، دەمەو ئێوارە تۆزێ سەری خۆشمان گەرم دەکەینو دووسێ قسەی خۆش دەکەین، ماڵت نەشێوێ لەم غەریبایەتیە وادڵمان تەقی..!

یونس رازی بوو.. نزیك عەسر چوو بۆلای خزمەکانی، هەندێ بەنێو بازاڕدا سوڕانەوە، پاشان چوونە ماڵی کەمالو لەژێر سێبەری درەختی حەوشەداو لەدەوری مێزێك کۆبوونەوە.

کـــات بـــەرەو تـــاریکی دەچـــوو، لەگـــەڵ هەڵـــدانی پێکەکانـــدا گەلێ باس‌وخواس دادەمەزرا.. پەلەی مەست بوونیان بوو.. دەنگیان بەسەر یەکتردا بەرزدەکردەوە.. هەر لەخۆوە یونس بەباسێکەوە گرتی‌و بەری نەدا.. ئاشێکی کۆنی بەبادەکرد، توانجی دەگرتە کچە خزمێکی نزیکی ئەوان..

دانیشتنەکە ناخۆش بوو.. بێخوداحافیزی یونس ماڵیانی جێهێشت.. گەڕایەوە ماڵی خەزورەکەی.. مڕومۆن‌و وەڕس.!

شیرین لێی نزیك بووەوە..

-چی دەبوو گەر ئێوارە زوو بهاتیتایەوە.. با ئەم خواردنەوە نامۆبارەکە نەبوایە..

یونس وەڵامی نەدایەوە.. لەولاوە باوکی شیرین پرسی:

-یونس کوڕەکەم نان ناخۆیت بۆتی بهێنن؟

-نا مامە.. برسیم نییەو بەزیادبێ..

## هاتنەوەی خـــزمەکـــــــان.!

خەریك بوو بۆ خەوتن جێگاڕادەخرا، لەناکاو لێدانی دەرگای حەوشە رایچڵەکاندن.. بەرلەوەی باوکی شیرین ببزوێ، یونس راپەڕی‌و رووەو حەوشە ملی نا..

دەرگای کردەوەو بینی کەمال‌و دوو خزمەکەی تری هاتوونە سەری.. سەرنجی دا تەواو خۆیان مەستکردووەو هەرسێ سەرخۆش بوون.. هەر لەوێوە بەگژیا هاتن.. کەمال وتی:

-ئێوارە زیادەڕۆیی‌و قسەی قۆڕت زۆرکرد..

ئەوەی تریان وتی:

-چۆن باسی خزمی ئێمە بەو شێوەیە دەکەیت؟

ئـەمیش کـوردە غـیرەت گرتـیو پیایانـدا هەڵـشاخایەوە، لەناکاوێکـدا سـێهەمیان تێــی سـرەواند.. بەدوایـدا کـەمال چـەقۆی دەرهێنــاو کـردی بەسەروچـاویدا.. یـونس دەس بەدەموچـاوەوە کـەمێ دوورکەوتـەوە، یـەك لەشـەڕکەرەکان پـەلاماری خـشتێکی داو تـاهێزی تیـابوو لەپـشەوە کێـشای بەسەریدا.. یونس هاواری لێ هەڵسا..

خەزوورەکەی گەیشتە سەری، بەدوایدا شیرینی ژنی..

شیرین زریکاندی:

-هەیرۆ.. چی قەوما.. بۆ کوێ.. بۆ کوێ هەڵدێن حەرامزادینە..

ئەوان هەڵاتنو ئەمانیش بەیونس-ەوە خەریك بوون..

بەپەلـە ئوتومبێـل پەیـداکراو گەیەنرایـە نەخۆشـخانە.. بـەڵام هـەر لـەڕێگا بـەهۆی خـوێن بـەربوونی زۆریو بـەهۆی لێـدانی سـەریەوە نیـوەمردوو بووبوو.. لەنەخۆشخانە گیانی سپارد..

هاوارو لالانەوەی شیرین ئـەو نـاوەو ئەوشـەوە خامۆشـەی خرۆشـاند.. بۆ سـبەینێ لاشـەی یـونس لەکـەرکوك بـەخاك سـپێردراو کـەمالو دووانەکـەی تریش رووەو چەمچەماڵ هەڵاتن..

لـەوێ دوای سـۆراغو گـەڕانو شـکاتی بـاوكو کەسـوکارەکەی یـونس، لەلایەن پۆلیسی هەرێمەوە دەستگیردەکرێنو رووەو عەدالەت دەکرێنەوە..

## رووەو بەندیخانە..

رۆژی ٢٠٠١/٤/٢٩ دادگـای جنایـاتی کـەرکوك لـەو تاوانـە دەکۆڵێتـەوەو دادگایی تاوانباری یەکەم (کەمال) دەکات، ئەوانی دیکەش بەجیا دادگاییان لەڕۆژی تردا دەکرێت.

دادگا بڕیار دەدات کەمال حوکمی زینداني کردنی هەمیشەیی بەسەردا بدرێ.

ئیدی، دەمەو نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە کەمال دەبرێ بەرەو ئەو زیندانەی جێگای ئەو تاوانبارانەیە کەدادگا حکومی بەسەردا داون..

هەر نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، شیرین کوڕە چوار مانگەکەی بەسنگەوە دەگرێتو دادگا جێدێڵێ، بەڵام لەگەڵ هەنگاوەکانیدا جار جارە سەرنجێکی منداڵە هەتیوەکەی باوەشی دەداتو بیری دەچێتەوە بۆ ئەو شەوەی تاوانکارەکان (یونس)یان کوشتو نەیانهێشت منداڵی نۆبەرەی خۆی ببینێ..

کوێستان لەیەکێ لەگەڕەکەکانی سەرووی سلێمانی دەژیا، لەبەر هەژاریو نان پەیدا کردن پەنای بردە بەر کارەکەریو لەماڵی خانمێکی تا رادەیەك دەوڵەمەند(٣) مانگ بوو کاری دەکرد، بەیانیان کەدەگەیشتو عەباکەی لەخۆی دەکردەوە، قۆڵی لێ هەڵدەماڵیو کارەکانی دەکرد، ئێواران ماڵی خانمی جێ دەهێشتو دەگەڕایەوە ماڵی باوکەکەی... نێوان خانمو کوێستان باش بوو، خانم لەوەوبەر خانمی ماڵو مێردی خۆی بووەو رۆژانە میوان لەماڵیا بووەو هەمیشە دەرگای ماڵە مێردی لەسەرپشت بووە، ماڵەکەی جارانی ئەو جێی هامشۆی پیاوچاکانی شارو دەرەوەی شاربوو، کەچی ئێستا زۆربەی کات بەتەنێ خۆیو کوێستان لەماڵە گەورەکەیدانو ئەو زۆربەی کات لەگەڵ بیرەوەرەکانیدا دەژیا... رۆژی ١٩٩٢/٢/١٠ رووداوێك شادیی ماڵەکەی نەهێشتو خانم بەدزینی ئاڵتوونەکانی کەوتە گومان لەنزیکترینو ئاشناترین کەس بە ماڵەکەی و ژوورەکەیو کەنتۆرەکەی، ئەویش کوێستانی تەمەن (٢٠)ساڵ بوو..

**خانم وتی...**

رۆژی ١٩٩٢/١١/١٥ خانم لەبەردەم دادگادا وتی:

-بەرێزینە، ئەو بەیانییە چۆن زانیم ئاڵتونەکانم دزراوە، بابۆتانی بگێڕمەوە، هەر کە چوومە ژووری خەوتنو دوای دەرهێنانو ئەم دیوو ئەو دیوو کردن بەجلەکانم دەستم برد بۆ ئەو قوتووەی هەمیشە ئاڵتوونەکانم دەخستە ناوی، چیم بینی؟ هەرکە سەری قوتووەکەم لابرد بینیم چی ئاڵتوونم هەیە دزراوە، بۆیە قوتووەکەش سووك بوو، ئاڵتوونەکانم بایی

٨٠٠ هەزار دینار بوو، بەراستی ئەو کتوپڕییە سەرسامو خەمباری کردم، دەمو دەست گومانم لەکوێستان کرد،

چونکە هەر ئەو بەو پەڕی سەربەستی هەموو شوێنێکی ماڵەکە دەگەڕاو بۆی هەبوو دەست لەشتەکانی منیش بدات...

هەر کە چوونو هێنایانەوە بەردەمم دەست بەجێ دانی پیاداناو وتی من دزیومە، ئینجا پێی وتین: من لەگەڵ مەجیدی دڵدارمدا تەگبیرم کردبوو کە ئاڵتوونەکانی خانم بەرمو بیدەمە دەست ئەوو بیفرۆشێو خەرجی گواستنەوەو ماڵ دروست کردنی پێ دابین بکەین، ئەو خۆی دانی پیاناو یەك لەئامادەبووەکانیش نازداری خزمی خۆم بوو.

## ئەی شایەتەکە چۆنی گێڕایەوە؟

کاك ئەحمەد،کەژنەکەی خزمی خانمە، رۆژی دادگا وتی: ئەو ئاڵتوونەکانی دزیوە، بەو مەبەستەی خانم گێڕایەوە...

دوای ئەوەی خانم ئاگاداری پۆلیسی کردو کاتێ کوێستان گیرا دانی بەتاوانەکەیدا نا، تەنانەت کەهێنایانەوە ماڵەکە بۆ کەشفی (دلالە)چۆنێتی دزی کردنەکەی گێڕایەوە، چووە بەردەم کەنتۆرە چوار تاکییەکەو بەچەقۆکەی دەستی دەرگای کەنتۆرەکەی کردەوەو لەچەکمەجەکەدا قوتووەکەی دەرهێناو بردیە دەرێ لەسەر(مبردە)کەی داناو بەعەباکەی خۆی شاردییەوە، پاشان لەگەڵ لێکۆڵەرەوەکان لەماڵ هاتە دەرو لەفولکەی کاوەی ئاسنگەر لەوێستگەی پاسەکاندا وەستاو وتی مەجید لێرە چاوەڕێی دەکردم، قوتووەکەم دایەو پێی وتم: گەر باسی ئەمە بکەیت ئەوا دەتکوژم...

بەڵێ گەورەم، من دڵنیام کە دزی ئاڵتونەکان لەکوێستان بەولاوە کەسێکی دیکە نییە...

## گومانلێکراو بەرگریی لەخۆی دەکات...

هەرچەندە کوێستان لەلێکۆڵینەوەی پۆلیسداو پێشتریش لەماڵی خانم بەپێی قسەکانی (خانمو ئەحمەد)دانی بەتاوانەکەیدا نابوو، بەڵام رۆژی دادگایی کردنی بەجۆرێکی تر قسەی کرد، کوێستان وتی:

-من بێ گوناهم، من دزیم نەکردووە، ئەو شەوەی پۆلیس منی گرت چەند سەعاتێ لەوەوبەر کەلەماڵی باجی خانم کارم دەکرد گوێم لە دەنگە دەنگی باجیو روپاکی خزمی خۆی بوو، باجی دەیووت: با..با، تۆ بردووتن.. ئەویش دەیووت: نەخێر من چۆن کاری وادەکەم... کەمن گیرام تاهەفتەیەك داکۆکیم لەخۆم کردو پێم وتن من نەمدزیوە، بەڵام کە زۆریان لێ کردم بۆئەوەی وازم لێ بێننو هێندە پرسیارم لێ نەکەن وتم راستە من بردوومن.. هەروەها وام نیشاندا کەمن دڵداری خۆم هەیەو داومە بەو، واتە داومە بەمەجید، بەڵام بڕوام پێ بکەن من مەجیدم تەنیا بەهۆی خوشکەکەیەوە دەناسی کەپێشتر پێکەوە لەکارگەیەکی پسکیت کارمان دەکرد... کەبردمیانەوە ماڵی باجی خانم لەترسی ئەوانو هەڕەشە وتم من ئەو کارەم کردووەو بەدرۆوە وتم لەفولکەی کاوە داومە بەمەجید، خوا ئاگادارە ئەو چەند مانگە بەخۆڕایی کراومەتە ژوورەوە، من تاوانم نییەو هەرگیز ئەو کەسە ناپاکە نیم دزی لەخانمی خۆم بکەم،لەخوام داوایە تاوانبارەکە ئاشکرابکاتو ئەو کاتەش باجی دڵی لەمن پاك بێتەوە...

## رای دادگا بەم شێوەیە بوو...

لەبڕیاری دادگای بەرێزدا بۆ ئەو کێشەیە، بەم شێوەیە کارەکەو تاوانەکە باسکرا.

-دانانی کوێستان بەدزی ئاڵتوونەکان تەنیا بەقسەی خانمو شایەتەکانێتی کەهیچیان بەچاوی خۆیان تاوانەکەیان نەدیوە، ئەوە نەبێ گوێیان لەکوێستان بووە کەتاوانەکەی خستۆتە ئەستۆی خۆی، بۆ مەسەلەی مەجیدیش ئەوا ئێمە داوای سەربەخۆمان دژی کردۆتەوەو لەگەڵیا لێکۆڵینەوە کراوە، کوێستان لای پۆلیس وای وتووە، بەڵام لای دادوەری لێکۆڵینەوە رۆژی دوای ئەوە لەقسەکانی پاشگەزبووەتەوەو وتویەتی(ترساومو تۆقاوم بۆیە خۆم کردووە بەدز)، کەشفی دەلالەکەش بەبڕیاری دادوەر نەبووە، کەواتە بڕیاری دادگا ئازادکردنی دەست بەجێی کوێستانە گەر گومانی تاوانی دیکەی لەسەر نەبێ... ئێمە بڕیارەکەمان دەنێرینە دادگای تەمیزی هەرێمو چاوەروانی وەڵامی ئەوان دەبین، کەئەو قسانە تەواو بوو، روناکی گەڕایەوە رووی کوێستانو وەك بیەوێ لەدڵی خانمدا خۆشەویست بێتەوە سەرنجی دەدا، ئەویش بەرێزەوە هەڵساو تەماشایەکی کوێستانی کرد... دەشێ لەو کاتەدا کەسێکی تر بەبیری خانمدا هاتبێ کەبەدەستی چەپەڵی ئەو هەموو ئاڵتوونەی دزی بێت!.

## وەڵامی بڕیارەکەی دادگا چی بوو؟

لەنووسراوێکی رۆژی ١١/٩/١٩٩٣ دا، دادگای تەمیزی هەرێمی کوردستان رەزامەندیو پشتگیری لەسەر بڕیارەکەی دادگای جینایاتی

سلێمانی نیشانداوە، واتە کوێستان لەبەردەم یاسادا بێ تاوان دەرچوو..
لێرەدا لەگەڵ خوێنەری ئازیزدا دەپرسین:

-دەبێ کێ ئاڵتوونەکانی بردبێ؟ کێ بێ بایی ٨٠٠هەزار دینار ئاڵتوونی جۆربە جۆری لەو خانمە بەرێزە دزیوەو نەکەوتە بەردەستی دادگا؟

بەڵام هەرچۆن عومری درۆ کورتە، نهێنی دزیش درەنگ بێ یان زوو هەر ئاشکرا دەبێ ژووری بەندیخانەش دەرگای والایە بۆ پێشوازی لەتاوانکاران.

(پەیمان) لەئەنجامی بەشداری تاواندا گیراو چووە بەندیخانەوە، ساڵێك نابێ بڕیاری زیندانی کردنی پانزە ساڵی ڕەبەق بەسەر ئەو بێوەژنەدا دراوەو بەدبەختە سەری لەخۆی و جووتێ منداڵی بچووکی شێواندو ئێستا بۆ چارەنووسی ڕەشی فرمێسك دەڕێژێ...پەیمان نموونەیەکی گەلێ جیاوازە لەژنانی کورد، کەهەمیشە بەگژ ڕۆژگارو ئاکامەکانی ژیانیان و ڕێکەوتە نالەبارەکاندا چوونەتەوە... پەیمان دوور لەناوەکەی، دوور لەداب و نەریتی کۆمەڵایەتی هەڵسوکەوتی کردو ژیانی دوورودرێژی نێو زیندان ئەنجامی ئەو هەڵسوکەوتە خراپەی ئەون..!

## توێژەری کۆمەڵایەتی لە(پەیمان) دەکۆڵێتەوە...

ڕاپۆرتێکی توێژەری کۆمەڵایەتی لە(بنکەی پۆلیسی گرتن و گواستنەوەی سلێمانی) شەرحی حاڵی پەیمان دەکا بۆ دادوەر (بەر لەدادگاییکردن و حوکمدانی بەچەند مانگێك)، لەو ڕاپۆرتەدا هاتووە:

-ئەم ژنە تا دووەمی ناوەندی خوێندوە، زۆربەی ژیانی باوکی دوور لەخێزانەکەی بووە، کە گەڕاویشەتەوە نێویان پیروپەککەوتە بووە و نەیتوانیوە ئاڕاستەیەکی ئەوتۆی کچە جوانەکانی بکات.

پەیمان هەندێ چاو لەدەرو سەرلێشێواو بووە، تالە (٢٢)ساڵیدا شووی کردووە بەکوڕێك کەخۆشیویستووە، ئەویش لاوێکی ژیرو فامیدە نەبووە، هەرهێندەی پەیمان ئەقڵی بەدنیا شکاوە، کەژن دەگوێزێتەوە درێژە بەرەفتاری ناپەسەندی سەرخۆشیی بەردەوامی و بەدمەستییەکەی دەدات! هەر بەدوای مانگی (هەنگوینی)ەکەیدا دەیان شەو بەبێهۆشی براوەتەوە بۆ ماڵەوەو تەسلیم بەژنە جوانەکەی کراوە!! ئەو خێزانە هەر لەسەرتاوە بەختەوەر نەبوون، تەنانەت(٣) ساڵ ژیانی ژن و مێردی و لەدایك بوونی

کچێك و کوڕێك تروسکەی هیوایان بۆ چارەنووسی خێزانەکە درووست نەکردووەو گەڵێ جار پەیمان لەدەستی مێردەکەی تۆراوەو داوای جیابوونەوەی کردووە، کە گەڕێنراوەتەوە بۆ ماڵە دۆزەخەکەی، باوکی دوومنداڵی لێیداوەو گرفتەکە زیاتر تەشەنەی کردووە!

ئیدی لەسەر داوای ژنە جودابوونەتەوە... پەیمان و منداڵەکانی چوونەتەوە ماڵی باوکە هەژارەکەی کەبەسکێ تێرو بە(دە)برسین، ئەنجام دایکەکەی لەماڵ دەیانکاتە دەرو ئیتر پەیمان بەتەواوی خۆ بەدەستی قەدەری چەوتەوە دەدات و بۆ (ژیان)ی خۆی و منداڵی دەبێتە (هاوڕێ!)ی کەسانی وەك عوسمانی فیتەر... نەك هەر هیی ئەو، بەڵکو هیی هاوڕێکانیشی!!

عوسمان یارمەتی دەدات و بەڵێنی هێنانیشی دەداتێ... سەرەتا پەیمان نازانێ ئەم عوسمانە چ کارەیە، دوایی دەیناسێ کەبەدزی پارە پەیدا دەکات، بەڵێ ئەو کاتە بەباشی دەیناسێ کە داوای لێ دەکا بەشداری دزینی ئوتومبێل بکات لەگەڵیاندا... پەیمان و دوو منداڵەکەی وەك (خێزانێك)بۆ ئەنجامدانی دزییەکان لەلایەن عوسمانەوە بەکار دەهێنرێن.

### (پەیمان) باسی خۆی دەکات...

پەیمانی تەمەن(٢٧)ساڵ دوای ئەوەی لەگەڵ چەند تاوانبارێکدا (دزی) دەکات و دەگیرێت، بەجیا لەوانی تر لێی دەپرسرێتەوەو دادگایی دەکرێت، لەوەڵامی پرسیارەکاندا بەچاوی پڕ لەشەرمەوە دەڵێ:

-کەمێردەکەم تەڵاقی دام بەدوو منداڵەوە حاڵم پەرێشان بوو، عوسمانی فیتەر بەڵێنی دامێ بمهێنێ، بەڵام هەر مارەی نەکردم و دوایخست. دەست کورت بووم و کەداوای لێکردم شووی پێ بکەم رازی بووم، پرسی دایك و

باوکیشم کردو ئەوانیش رازی بوون، نیشانەی کردم، ئیدی سەردانی ماڵەکەمانی دەکردو لەگەڵ خۆی دەیبردمو هەرجارەی جۆرە مۆدێلێکی ئوتومبێلی پێبوو!

شەوێکیان عوسمانو دوو هاورێی هاتنە دوام، سواری بەرازیلییەکی کرێیان کردمو لەگەڕەکی (رعایە)ئەوان دابەزینو ئوتومبێلێکی (کرۆنا)یان دزیو بەهەردوو ئوتومبێلەکەوە چووینە ئۆردوگای(باریکە)، کەلەوێ پارەی دەدامیو لەگەڵیدا دەژیام، ئوتومبێلە دزراوەکەیان لەماڵێکدا شاردەوە بیفرۆشن، ئیتر ئەوە بوو شەوێکیان لەوێ گیراین...!

*پەیمان لەلێکۆڵینەوەدا وتویەتی:

-من چەند جارێ لەگەڵ عوسماندا خەوتووم، هەروەها لەگەڵ دوو هاورێ شەریکە دزەکەی چەند شەوێکیش پێکەوە دەمانخواردەوە!

### ئەو شەوەی براکەی سەردانی کرد...!

برایەکی پەیمان کەتەمەنی ١٨ساڵەو بە بۆیاخچێتی گوزەرانی خۆی دابین دەکات، بەدادگای وت:

- من رازی نەبووم شووی دووەمی بکات بەعوسمان، کەلەگەڵیشی چووە باریکە بەتەواوی لەخوشکەکەم عاجز بووم، رۆژێ دایکم زۆری لێکردمو وتی:

-کوڕی خۆم،خێرت دەگات سەرێ لەو هەش بەسەرە بدە، بزانە چی دەکات؟ ئاخر کوڕەکەم گوناحە، خۆ خوشکتە، خوا وای پێخۆشە بەقوربانت بم...

بەگوێم کرد، چوومو لەباریکە دۆزیمەوە، عەسر هەندێ قسەمان کردو شەو عوسمانو دوو هاورێی(کەدەرکەوت شەریکە دزی بوون) خەوتن،

بەرێکەوت ئەو شەوەی من لەوێ بووم پۆلیس دای بەسەریاندا، نیوەشەو دەنگی تەقە لەشیرین خەو رایچڵەکاندم. یەکیان کوژراو یەکیان برینداربوو وئەوی دیکەشیان گیرا، خوشکەکەی منیش، دووبارە دەڵێم من رازی نەبووم لەگەڵ ئەو کوڕەدا بڕوا، بەڵام عوسمان هەڕەشەی لێدەکردمو جارێکیش لێی دام...بڕوا بکەن دایكو باوکیشم رازی نەبوون بەو بڕیارەی پەیمان...

*دواتر، ئەم برایەی پەیمان ئازاد دەکرێو دەچێتەوە ماڵی خۆی، بەڵام هەمیشە غەمبارو دڵشکاو...

## یەکێک لەدزەکان دەدوێ..

یەکێك لەشەریکە دزەکانی عوسمان، ئەو شەوە لەباریکە بەبرینداری دەگیرێو بەوردی لەچۆنێتی ئەنجامدانی تاوانەکانی خۆیان دەدوێ کەچەند ساڵێکی رابردوو، بەهاوکاری چەند کەسێکی دیکەی(باریکە)و ناوچەی تر چەند ئوتومبێلێکیان دزیوەو لەچواریاندا(بەکرۆناکەوەی لەسەری گیران) پەیمان بەشداریان بووە...

پەیمان خۆیشی دانی بەوەدا ناوەو وتویەتی کەسیانیان بەپارەی باش داوەتەوە بەخاوەنەکانیان..

## عوسمان.. چی لێ بەسەرهات؟!

دوای ئەو ژیانە، دوای بەکارهێنانی (پەیمان) بۆ ئەو مەبەستە گڵاوەو رێزنەگرتنی هیچ وجودێکی ئینسانی ئەو ژنە سەرلێشێواوە.. دوای دڵئێشانی براکەیو کەسوکاری لێی، دوای دزینی بەری رەنجی کەسانێ کەبەئارەقی نێوچاوان ئوتومبیلیان بۆ ماڵو منداڵیان کڕیوە، ئەو شەوەی لەباریکە پۆلیس دەدەن بەسەریاندا بەچەکەکەی بەرەنگار دەبێتەوەو

بەگوللـەی پـۆلیس دەپێکـرێ‌و دواتـر دەمـرێ... دەڕوات‌و بـێ ئـەوەی پارەوپول‌و خۆشییەکانی ژیانی دنیای لەگەڵ خۆیدا بباتە گۆڕی تەنگەوە!

هەر چۆن ژیان‌و ڕێکەوتەکانی، پەیمان شکێن بوون لەگەڵ کچێکی وەك پەیماندا، پەیمان خۆیشی پەیمان شکێن بوو لەگەڵ خۆیداو دواتر لەگەڵ هەردوو منداڵەکەی..

لێرەدا گەلێ پرسیار دێنە گۆڕێ، لەوانە:

-دەبێ تاوانی ئەو دوو منداڵە چی بێ؟

-باوکیان وای کرد، دەستەڵاتی ئەوان چی بوو؟

-دایکیان وای کرد، دەستەڵاتی ئەوان چی بوو؟

-عوسمان ژیانی دایکیانی بەو دەردە برد، دووبارە دەستەڵاتی ئەوان چییە؟

داخۆ، پێویست نییە، خانەیەك، دایەنگایەك، دامەزراوێك هەبێ ئەم منداڵە بێ نازانە بگرنە خۆیان؟! ڕەوایە دوو خونچە گوڵی ئاوا لەگەڵ تاوانکارێکی وەك پەیماندا ژیانی زیندان ببەنە سەر؟!!!

لـەدادگـای سـلێمانی، ئـەو هـەموو شـایەتو شـكاتكەرو سـەیركەرە ئەوەنـدەی تـر بیری (ئەختـەر)ی تەمـەن (٢٣)سـاڵو دایكـی كـوڕو كـچێكی ئاڵۆزتر كردبوو، گیانێكی بەپارێزەرەكەی بوو كە جار جار تێی دەڕوانی، حەوت مانگ لەوەوبەر عوسمانی مێردی بەدەستی ئەو تاوانبارەی ئەوبەری كـوژرا، ئـەو تاوانبـارەی نـاوی(سـەردارە)و دراوسـێیانەو هەموو(بازیان)ئەوەشیان بیستووە كەئەختەری خۆشویستووە!

دەنگـی سـەرۆكی دادگـا رایـچڵەكاند.. دوا بڕیـاری(حـوكمی)دادگـا بـەم شێوەیە راگەیەنرا:

١-بـەپێی مـاددە ١/٤٠٦/ح لەیاسـای سـزادانو بەدەلالـەتی مـاددەی ٧٩ حوكمی زیندانی كردنی هەمیشەیی بەسەر تاوانبار سەردار عەبدوڵلاّدا درا.

٢-ناچار دەكرێ بەوەی بڕی شەش هەزار دینار بداتە هەرسێ منداڵەكەی عوسمانو وەك یەك بەسەریاندا دابەش بكرێت.

٣-هەرسێ قاوغە فیشەكەكە لەلایەن پۆلیسی بازیانەوە لەناو دەبرێت.

٤-كلاشـینكۆفەكەی سـەردار دەسـتی بەسـەردا دەگیرێـتو دەنێـررێ بـۆ پۆلیسی سلێمانی.

بەرلەخوێندنەوەی بڕیارەكانی حوكم، لەبڕیاری دادگادا ئاماژە بۆ ئەوەش كرا كەئەم داوایە، كە تایبەتە بە تاوانبار سەردارو لێپرسینەوەی ئەختـەر بۆ ئەو تۆمەتی دەست تێكەڵكردنەی لەگەڵ سەرداری دراوسێیان بەداوایەكی جیاواز دەبێت.

بەرلـەوەی گـوێ لـەئیفادەی شایەتەكان بگـرین، جـارێ بـابزانین عوسمـان تەمەن (٢٧)ساڵ چۆن كوژرا؟!

*شەوی ٦/٢/١٩٩٢عوسمان چوار میوانی هەبوو، هەرچەندە باران دەباری و کارەباش نەبوو، بەڵام قسەو باسی بەرتیشکی فانۆسەکە لەدەرەوەی دابڕی بوون، هەرسێ منداڵەکەی عوسمان خەوتبوون، ئەوشەوە(عەلی)براشی لەماڵیان بوو.. لەسەعات نۆی شەودا ئەختەری ژنی عوسمان ژوورەکەی جێهێشت ودوای کەمێ گەڕایەوە، هێندەی نەبرد جارێکی دیکەش بەرەو حەوشە هەنگاوی نا..! ئەمجارەیان عەلی سەرنجێکی دایە براژنەکەی.. کەبۆ سێیەم جار بەلایتەکەی دەستییەوە رووی کردەوە حەوشەو هەر لەگەڵ دەرگاکردنەوەو هاتنە ژوورەوەی هەوایەکی ساردا گەڕایەوە، عەلی و کاکی چاویان بڕییە یەکترو هەردوو بەدڵیاندا هات..

-ئەم ژنە بۆ هێندە روو دەکاتە حەوشە؟!

ئەختەر کەمێ دواکەوت و عوسمانی مێردی زەردەخەنەیەکی ئاراستەی میوانەکانی کردو بەرەو دەرەوە ملی نا.. هێندەی نەبرد دەنگی چەند تەقەیەك و زریکەو هاواری ئەختەر، عەلی و میوانەکانی راپەراندو پێکەوە رووەو حەوشەکە رایان کرد، کە چوونە ئەوێ بینیان عوسمان کەوتووەو تفەنگێ لەتەنیشتییەوە جێماوەو یەکسەر پێی وتن:

*سەردار بوو..سەرداری دراوسێمان تەقەی لێکردم..

-ئەی کوا.. چی لێهات؟!

*نازانم..رایکرد.. ئاخ.. بمگەیێننە نەخۆشخانە..

عوسمان بە(٣) فیشەکەکەی لەشییەوە تەواو ماندوو بوو بوو. تەنیا دوو رۆژ لەنەخۆشخانەی سلێمانی مایەوەو ئیتر گیانی سپارد، لەو دوو رۆژەدا

کەسوکاری چوونە سەردانی، بەڵام گرنگترین قسەی بۆ کەسە نزیکەکانی خۆی کرد، بەڵێ تەنیا قسەی بۆ دایكو باوکی کردبوو..

دایکی وتی:

-کەلە نەخۆشخانە لێم پرسی ئەو پیاوکوژە بۆ لەحەوشەکەی ماڵی ئێوەدا بوو، چونکە خەڵك وەستابوون قسەی نەکردو وتی دوایی پێت دەڵێم.. بەڵام بەر لەدوو رۆژ بەقوربانی بم هاتە سلێمانیو لەبەرچاوی مندا بەباوکی وت (باوکە ئەختەر پەیوەندی خراپی لەگەڵ دراوسێکەماندا هەیەو ناوی سەردارە)..!

باوکیشی وتی:

من کەلەنەخۆشخانە لەهۆی رووداوەکەم پرسی وتی هەر ئەوەیە کەپێری بۆم باسکردیت، کەدوو رۆژ لەوەوبەر هاتە ماڵمان باسی ئەو هەتیوەی کردو وتی: لەدەم خەڵکییەوە باسی پەیوەندی نێوان ئەختەرو ئەو کوڕەی دراوسێمان کراوە...

## ئەی دراوسێکان لەوە چۆن دوان؟

لەدراوسێکانی عوسمان، ئەوانەی دادگا پرسیاری لێکردن، رای جیاوازیان هەبوو سەبارەت بەو باسی پەیوەندییەی نێوان ئەختەرو سەردار...

یەکێکیان وتی:

-من نەبیستوومەو نەدیومە هیچ جۆرە پەیوەندییەك هەبوو بێت، بەڵام لەوە ئاگادارم کەنێوانی عوسمانو ئەختەر زۆر خۆش بوو...

یەکێکی تر وتی:

-ئێوارەیەك سەردار هاتە لامو وتی با تفەنگەکەم لای تۆبێ، عوسمان لەوێ نییەو سەرێ لەماڵیان دەدەم، ویستی بچێتە لای ئەختەر..! منیش وتم کاکە عەیبە، عوسمان هاوڕێتەو دراوسێتە، پاشان خۆی لەوێ نییە چۆن دەچیتە ماڵەکەی، بەڵام ئەو بایەخی بە قسەکەم نەداو چوو، هەر بۆ بەیانی ئەمەم بەبرایەکی عوسمان راگەیاند..

## رای (عەلی) لەسەر براژنەکەی ناوابوو..

-بەو چەند جارە چوونە دەرەوەیەی ئەختەر گومانم لێ پەیدا کرد، بەتایبەت کەپێشتر لەخەڵکم بیستبوو پەیوەندی خراپی لەگەڵ دراوسێیەکیاندا هەیەو دواجار کەلە سەعات نۆو نیودا چووە حەوشەو زۆری پێچوو، کاکی رەحمەتیم بەهەمان شێوە گومانی لێکردو ئەوەبوو شوێنی کەوتو سەرداریناموبارەکی لەحەمامەکەدا گرتو ئەویش ئەو کارەساتەی لێ قەوما..!

## ئەختەر چۆن بەرگری لەخۆی دەکات..؟!

هەرچەندە ئەختەر پارێزەری بەرگریکەریشی هەبوو، هەر لەسەر داوای ئەویش یەکەمجار لەتەوقیف ئازاد کرا، بەڵام خۆیشی قسەی هەبوو، ئەو بۆ بەرگری لەخۆیو پووچەڵکردنەوەی ئەوتۆمەتەی خراوەتە پاڵی وتی:

-من بۆ ئیشی(سەرئاو) چوومە دەرێ، لایتەکەم پێبوو ولەحەوشە هیچم نەدی، لەگەڕانەوەدا باوکی منداڵەکانم دیو لایتەکەی لەدەست وەرگرتمو

بەرەو حەوشەکە چوو، ویستم بچمەوە ژووریٚ لەو کاتەدا ئەو کارەساتە قەوما...! کەمن و عەلی و میوانەکانمان گەیشتینە سەری وتی سەردار بوو.. مێردەکەم تفەنگەکەشی لیٚ سەندبوو، ئەو لەناو حەمامەکەوە تەقەی لیٚ کرابوو، من هیچ پەیوەندییەکم نەبووە بەسەردارەوە، ئەوەنەبیٚ دراوسیٚمان و هاوڕێی عوسمان بوو، من بەدرێژایی ئەو(٧)ساڵەی لەگەڵ مێردی خۆمدا ژیاوم زۆر بەختەوەر بووم.. داوای سزادانی بکوژی مێردەکەم دەکەم، چونکە ئەو بیٚ گوناه کوژراو لەگەڵ هیچ کەسێکیشدا دوژمنایەتی و ناکۆکی نەبووە.

## میوانه هەمیشەییەکەی بەندیخانه چی وت؟

سەرداری تەمەن(١٨)ساڵ، جاران پیشەی کاسب و ئێستا زیندانیی هەمیشەیی لەیەکێك لەبەندیخانەکاندا، بەسەرهاتی تاوانەکەی بەو شێوەیە گێڕایەوە:

-سەرلەئێوارەی ئەو شەوە لەبەردەم ماڵی خۆماندا عوسمانم بینی، وتی میوانمان هەیەو شەویٚ سەرمان لیٚ بدەو بۆ خۆمان دۆمینە دەکەین، منیش دوای نان خواردن بەخۆم و تفەنگەکەمەوە چووم. بەبیٚ ئەوەی لەدەرگابدەم چوومە ژوورەوە، یەکسەر یەکێك لایتی گرتە دەم و چاوم، منیش دوای میل هێنانەوە داوام کرد لایتەکە بکوژێنێتەوە، بەڵام بەگوێی نەکردم و ئەوەندەم زانی هاتەپێش و پەلاماری لوولەی تفەنگەکەی دام. منیش دەستم بە پەلەپیتەکەکەدا ناو چەند فیشەکێکم پێوەنا. من خۆم نەشاردۆتەوەو ئەوەش راست نییە کەلەحەمامەکەدا قاوغە فیشەك و خوێن بەجێمابێت...! نازانم چۆن ئەوە روویدا...یەکسەر حەوشەکەم جێهێشت و رامکرد... هیچ

پەیوەندییەکی ناشەریفانە لەنێوان منو ئەختەردا نەبووەو وەك خوشکی خۆم سەیرم کردووە...

## ڕای دادگا بەم شێوەیە بوو...

دادگای جینایاتی بەڕێز، بەرلەراگەیاندنی حوکمەکەی بەسەر سەرداردا، بڕیاری دەستەی سەرۆکایەتی بەم شێوەیە ڕاگەیاند:

-کاتێ عوسمان گومانی لەچوونە دەرەوەی ژنەکەی پەیدا کرووەو شوێنی کەوتووە، دوای ئەوەی لایتەکەی دەستی لێ سەندووە ئاراستەی هەموو شوێنەکانی کردووەو لەناو حەمامەکەدا کەسێکی دیوە، کەبەرەو ڕووی چووەو لێی نزیك بووەتەوە ئەو کەسە تەقەی لێ کردووەو بەبرینداری کەوتۆتە سەر زەوی، ئیتر ژنەکەی کە لەو کاتەدا لەحەوشەکەدا بووە، رایکردووەو میوانەکانی بانگ کردووەو هەموو هاتوونە سەر عوسمانو ئەویش دوای ئەوەی ناوی بکوژەکەی پێ وتوون هێنراوە بۆ نەخۆشخانە.. بەلأم تاوانبار (سەردار عەبدوڵلا)شوێنی تاوانەکەی جێهێشتووەو هەلهاتووەو پاشتریش خۆی شاردۆتەوە تا رۆژی ٢/١٨ دەستگیرکراوەو یەکسەر دانی بەتاوانەکەیدا ناوە... وەك دەرکەوتووە تاوانبار لەکاتی تەقەکردندا لەناو حەمامەکەدا بووە، هەرسێ قاوغە فیشەکەکەو چەند دلۆپە خوێنێ لەسەر زەوی حەمامەکە بەجێ مابوون، پاشان چوونە ژوورەوەی ماڵێك لەشەوێکی بارانو بێ کارەباو بەبێ ئاگاداریی خاوەن ماڵ بۆ خۆی سەرپێچییەکی دیکەیە... هەرچەندە هۆکاری تاوانەکەی سەردار بەتەواوی ڕوون نەبۆتەوە بەلأم بەشێکی لێکۆڵینەوە ئەوە دەسەلمێنێ کەپەیوەندی

خۆشەویستی لەنێوان سەردارو ئەختەردا هەبووەو هاتنی تاوانبار بۆماڵی عوسمان بەهۆی ئەوپەیوەندییە ناڕەوایەوە بووە، هەروەها کوشتنی عوسمان لەلایەن تاوانبارەوە بۆ دەرچوون و دەستگیر نەکردنی و ناشکرا نەبوونی بووە لەشوێنی رووداوەکە، کەواتە حوکمی بەسەردا دەدرێت بڕیاریش درا ڕەچاوی ئەوە بکرێت تاوانبار تەمەنی لەبیست ساڵ کەمترە.

نیـوەڕۆی ڕۆژی ١٤/٥/١٩٩٠دوای بیـستو پێـنج ڕۆژ دووریـی فـاتیح لـەژنوماڵـە خنجیلانەکـەی، بـەخۆیو جانتاکـەی دەسـتیەوە لەبـەر دەرگـا ڕاوەسـتاو، دوای سـڕینی ئارەقـەی ڕووی بەدەسـتی ڕاسـتی لـەدەرگای دا، چاوەڕێ بوو(دولبەر)ی ئامۆزاو ژنی(٣)ساڵەی دەرکەوێو بە وشەی شیرین بەخێرهاتنـەوەی لـێ بکـاتو جانتـا لەدەسـتی وەربگرێـتو بـەرەو ژوورەوە پێشی بکەوێ، بەوەش ماندوێتی کاروفەرمان لەجەستەی دەربچێت، بەڵام فـاتیح تووشـی سەرسـامی بـوو، دولبەرەکـەی دەنگـی نییـە، جـارێکی تـرو دووانو سیان لەدەرگای دا، بەڵام بێ سوود بوو، نییە لەماڵ!!

تـا بـانگی عەسر فـاتیح بەماڵـە بـراو خـزمو ناسـیاودا گـەڕاو دولبـەر لای کەسـیان نـەبوو، تەنانـەت کەسـیان سۆراخیـشیان نـەدەزانی... بەپەسـتیو مێـشکی جەنجاڵـەوە گەڕایـەوە گـەڕاجی چەمـچەماڵو سـواری ئوتـومبێلی کـەرکوك بـووەوە، هـەر کەگەیـشتە ئـەوێ ڕاسـتەو ڕاسـت بـەرەو مـاڵی مـامی(خـەزووری) کەوتـەڕێ، پێـشوازی گـەرمی ئـەوان کـەمێ لـە بـێ تاقـەتی فـاتیحی کـەم کـردەوە، بەڵام هـەر کـە وەڵامیـان دایـەوە (نـەهاتووە بۆ ئێـرەو هەواڵی نازانین) ئەوەندەی تر پەشۆکا... ئۆقرەی نەگرتو لـەوێ شـەوی ڕۆژ نـەکردەوە، بـەدەروونی وروژاوەوە کەوتـەڕێ، لـەڕێگا تـەنیا یـەك پرسـیار ڕووبەری مێشکی داگیر کردبوو:

-خوایە گیـان، دەبـێ دولبـەر چـی لێ هـاتبێ، دەبـێ لـەکوێ بـێ، لـەکوێ؟!

هەر کەگەیشتەوە چەمچەماڵ، خۆی گەیاندە مـاڵی حەمەی برای، نەیدەزانی چـی بڵـێو چـی بپرسـێو چـی وەڵام بداتـەوە، ڕەنگـە لـەماوەی پێکهێنـانی ژیانی خێزانیداو بەدرێژایی هەر (٣٤)ساڵەکەی تەمەنی، ڕۆژی ڕەشـی ئـاوای بەخۆوە نەدیبێ...

ئەو شەوە خەو نەچووە چاوی، حەمەی براشی بەدیارییەوە ئێشکی گرت، حەمە بەدەم وەنەوزەوە لێی پرسی:

*کاکە گومانت لەکێیە.. لەمەوبەر کێ هاموشۆی کردوون؟

دەمو دەست وەڵامی دایەوە:

-تەنیا دڵشادی مامە قالە هاموشۆی کردووین، تەنیا ئەو لە هاوڕێکانمدا جارجار هاتۆتە ماڵی ئێمە، گەر مەسەلەکە گومان بێت، تەنیا گومانم لەوە...!

## دڵشاد لەکوێیە؟

بەیانی زوو، بەڕووی گرژو پەشێوەوە فاتیح چووە ماڵی مامە قالە، پرسیاری دڵشادی هاوڕێی کرد، وتیان:

-لەدوێنێوە ماڵی جێهێشتووەو نازانین بۆ کوێ چووە!

گومانی زیادی کرد، یەکسەر خۆی گەیاندە بنکەی پۆلیس و لەوێ ئەرزو حاڵی نووسی و سکاڵای خۆی بەم جۆرە تۆمار کرد:

(ژنەکەی من کەناوی دولبەرە ئامۆزای خۆمەو ماوەی ٣ ساڵە خێزانمە، دوێنێ بەمۆڵەت لەسەربازی گەڕاومەتەوەو نە لەماڵ و نەلەلای هیچ یەك لە کەسوکارمە، دولبەر تەمەنی ٢٦ساڵەو باڵای مام ناوەندییەو سپی پێست و چاوو قژ ڕەشە)...ئەفسەری بنکەکە بانگی کردە ژووری و لێی پرسی:

*فاتیح، گومانی چی لەژنەکەت دەکەیت، پێت وایە لەکوێ بێ؟

بەلێوی وشك و شەی پچرپچرەوە وەڵامی دایەوە:

-گەورەم، نازانم، نازانم چووە بۆ کوێ، من گومانی خراپی لێ ناکەم، ئێمە هیچ گیروگرفتێك لەنێوانماندا نەبووە، نازانم بڵێم چی...

دوای ئەوەی ئەفسەرەکە ڕێگایدا دابنیشێ پێی وت:

*باشـه، کـێ زۆر هاموشـۆی ماڵتـانی کـردوەو پەیوەنـدی بـەهێز بـووە لەگەڵتاندا؟

دوای کەمێ رامان، سەری هەڵبڕی و قورگی پاك کردوەو وتی:

-دڵشاد، دڵشادی مامە قالە...

ئەفسەرەکە قەڵەمەکەی گرت بەدەستەوەو وتی:

*ناوی تەواوو پیشەی و ناونیشانی؟

فاتیح وەڵامی دایەوە:

-دڵـشاد قـادر..نـاوی بـاپیری نـازانم.. ماڵیـان لەگـەڕەکی خۆمانـەو جەنگاوەری فەوجی سووکی ژمارە....

بەزەردەخەیەکەوە ئەفسەرەکە پرسی:

*باشە دڵشاد ژنی هەیە؟

ئەویش وتی:

-نەخێر.. نەخێر ژنی نەهێناوە...

## دەستگیرکردنی دولبەرو هاوڕێکەی....

یـانزە رۆژ بەسـەر تۆمـارکردنی سـکاڵاکەی فـاتیح دا تێپـەڕی، لـە(رانیـە) پۆلیس دولبەریان دۆزییەوە کە لەگەڵ (دڵشاد)دا ئەو ماوەیە لەو ناوە بوو بوون، بەگیراوی هەردووکیان هێنرانەوە شارەکەی خۆیان، ئەفسەری بنکەکە موختاری گەڕەکەکەی فاتیحی ئاگادار کردو ئەویش ناردی بەدوای فاتیح داو هەواڵەکـەی پـێ وت، فـاتیح نـاردی بـەدوای بـاوکی دولبـەرداو پێکـەوە چوونە بنکەی پۆلیس...

ئەفسەرەکەی پێی وتن:

-ئێستا دەتوانن داوا بنووسن و ئێمەش دولبەرتان بدەینەوە دەست، بەڵام ئەوراقی دڵشاد دەسپێرین بەبنکەی نەهێشتنی تاوان...

داوا نووسراو دولبەر بانگ کراو درایەوە بەباوکی و مێردەکەی، چەند مەترێك لەبنکەکە دوور کەوتنەوە، باوکی بەدڵی پڕو حاڵی پەرێشانەوە رووی کردە کچەکەی و پێی وت:

-فەرموو، ئەوە خۆت و مێردەکەت، بڕۆ، بڕۆ لەگەڵیا...

دولبەر هەموو جەستەی دەلەرزی و بەرەنگی زەرد هەڵگەڕاوەوە بانگی کردە باوکی:

-باوکە، باوکە گیان...

باوکی هەنگاوەکانی خێرا کردو بێ ئەوەی ئاوڕی لێ بداتەوە لێیان دوورکەوتەوەو رۆیی... یەکەمجار بوو فاتیح نەزانێ لەگەڵ دولبەرەکەیدا بدوێ، یان هەر نەتوانێ تەماشای بکات... شێوەی دولبەر لەبەرچاوی فاتیح دا ژنە جوانەکەی جارانی نەبوو، بەڵکو بەجەستەیەکی بێ گیان و لاشەیەکی مردووی دەبینی...

## بڕیاری فاتیح چی بوو؟.

فاتیح، هەروەك لەلێکۆڵینەوەی سەرەتاییدا لەپۆلیس و بەردەم دادوەری چەمچەماڵ و پاشتریش بەهەمان شێوە لەرۆژی دادگایی کردنیدا، پێی لێ ناو بەڕوونی باسی کرد:

*هەر کە لەڕاستیی مەسەلەکە گەیشتم و لەناپاکی دولبەر دڵنیابووم، بڕیارمدا بەکوشتن تۆڵەی ئەو هەڵە گەورەیەی لێ بستێنم، دڵم بەوە خۆش بوو باوکی و کەسوکارمان لەکارە(جوانەکەی)ئەو ئاگادارن و شکور بۆ خوا منداڵیشمان نەبوو تا بەگەورەیی، بەم کارەساتەوە بتلێتەوە...

ئەو شەوە چووینە ماڵی حەمەی برام، نازانم چۆن ڕۆژمان لێ بووەوە، من سوور بووم لەسەر بەجێهێنانی بڕیارەکەم، بەڵام نەمدەزانی چۆن و کەی؟ بۆ بەیانی هەر لەخۆمەوە پەلیم گرت و هاتینە سلێمانی و شەوێك لێرەماینەوە، بەر لەوەی بگەڕێینەوە چوومە بازاڕو کێردێکی تیژو زەرفێکم کڕی و لەگەڵ دولبەردا هێنامنەوە...

## ئەی دولبەر وتی چی؟!

هەر ئەو ڕۆژەی بەدەستگیرکراوی دولبەر بەبنکەی پۆلیس سپێردرا، ئا بەم شێوەیە ئیفادەی خۆی دا:

-گەورەم، وا بۆ(٣)ساڵ دەچێ لەفاتیح مارەکراوم، لەدەرەوەی دادگای شەرعی لێی مارەکرام، فاتیح کوڕی مامەو هەر بەهۆی ئەوەشەوە منیان دایە، پەیوەندی ژن و مێردیمان زۆر خراپەو هەمیشە ناتەباین، ژیانم لەتەکیا ناخۆشەو لەوماڵەدا کەهەر هەردووکمانی تیا دەژین پەشێوحاڵ و غەمگینم، زۆر جا لێم دەداو ئازارم دەدات، ئەمە سەرەڕای ئەوەی پیاوێکی ڕەزیلەو هەرگیز خەرجیم پێ نادات و تەنانەت پارەی چوونە لای دکتۆریشم ناداتێ، دواجار کەلێرە بوو، شەوەکەی شەڕم بوو لەگەڵیا و کەڕۆیشتەوە بۆ فرسەتێ گەڕام ماڵەکەی بۆ بەجێبهێڵم و لەدەستی ڕزگارم بێ، ئەوە بوو بەر لە دە دوانزە ڕۆژ هەندێ جلی خۆم پێچاوەو بڕی ٢٠٠دینارم خستە باخەڵمەوەو چوومە ڕانیەو لەوێ لەماڵی(.....) مامەوە کەگەورەی عەشیرەتەکەمانە... هەرچەندە لەوەوبەر نەمدیبوو ونەمدەناسی!

بەڵام بۆ ئەوەی کەدڵشادم لەگەڵدا بوو‌بێ ئەوە ڕاست نییەو شتی وانەبووەو من تەنیا ڕۆیشتووم، ئەو تەنیا هاوڕێی فاتیح بووەو من هیچ

پەیوەندییەکی ئەوتۆم نەبووە لەگەڵیاو نەخۆشمویستووەو نەهیچو.. ناپاکیم لەگەڵ مێردی خۆمدا نەکردووە.....

**سەرنج......**

لەبەرتیشکی قسەکانی باوكو دایکی دولبەرو لێکۆڵینەوەدا، لەقسەکانی دولبەردا ئەم سێ خاڵە دەردەکەون:

١-گەر پەیوەندیی نێوان دولبەرو مێردەکەی هێندە خراپو نالەباربووبێ، دەبوو لەوەوبەر دایكو باوکەکەی بەحاڵی کچەکەیان زانیبا.

٢-باوکی دولبەر ئەوە بەدرۆ دەخاتەوە کە ئەو پیاوە ناسراوەی رانیە کە(دولبەر دەڵێ چوومە ماڵیان) گەورەو سەرۆك هۆزیان بێ.

٣-دولبەر وا دەردەخات کەدڵشادی نەدیبێ، بەڵام هەردوو پێکەوە دەستگیر کراون....

**فاتیح بڕیارەکەی دەباتە سەر....**

ئەو رۆژەی لەسلێمانی دەگەڕێنەوە، کات ئێوارەیەکی درەنگ دەبێت، ئەوان بەمەبەستی چوونە کەرکوك سواری ئوتومبێلی ئەوێ دەبن، بەڵام کەدەگەنە نیوەی رێ (چەمچەماڵ) ژنە دەڵێ من نایەم بۆ ئەوێ و لێرە دادەبەزم، فاتیح لەگەڵیا دادەبەزێو داوای لێ دەکات بچنەوە ماڵی خۆیان، بەڵام دولبەر رازی نابێ، ناچار فاتیح پێشنیازی چوونە سەردانی ماڵە خزمێکیان لەگەڕەکی شۆڕش دەکات، لای دولبەر پەسەند دەبێو بەوشەوە تاریکە دەکەونە رێ، رێگایان دەچێتە سەر رێی کێڵگەو باخی بەروبوومی کشتوکاڵی، هەرچەندە دولبەر، بەچەقۆی ناوزەرفەکەی دەستی مێردەکەی نازانێ، بەڵام رۆیشتنی بێ دەنگی فاتیحو دیمەنی ئەو رێگایەو شەوی

تاريك خورپە بەدڵيدا دەهێنن، لەنيوەی ڕێگاداو بەشێوەيەكی كتوپڕ، فاتيح فرسەت لەژنەكەی دێنیٚ و دەيخاتە سەرزەوی و بەدەستێكی سەری دەگریٚ و بەدەستەكەی تری كێردەكەی دەردێنیٚ و سەری دەبڕیٚ، لەماوەيەكی كەمدا سەری دولبەر لەلەشی جيادەكاتەوە، دەيخاتە زەرفەكەيەوەو لاشە بیٚ سەرەكە جێدەهێڵیٚ.!

بەلەشی شەكەت و سەروچاوی ئارەقاوييەوە دەگاتە بنكەی پۆليس و بەدەم هەناسەبڕكێوە لەمفەوەزی ئێشگكر دەگەيەنیٚ:

–ئەمە سەری ژنەكەمە، ماوەيەكی كەم دەبیٚ بڕيارەكەم جێبەجێكرد و سەرم بڕی، چونكە ئەو خيانەتی لەمن كرد، بەڵیٚ لەمنی ئامۆزاو مێردی....!

ئێشگكر كەدولبەری ناو زەرفەكەی دی هێندەی تر واقی وڕما، فاتيح بواری قسەی نەداو پێی وت:

–ئەمەم لەپێناوی شەرەفمدا كرد، لەپێناوی سڕينەوەی لەكەی عاردا...

## دڵشاد چی بەسەرهات؟!

وەك پێشتر ئامازەی بۆ كرا، دڵشادی هۆكاری ناپاكی كردنی دولبەرو لەخشتەبەری، دەبوو بەجيا لێی بپرسرايەتەوە، بەلاّم بەگوێرەی بڕياری دادگا (دوابڕيار) وا دەردەكەویٚ ئەو چەكدارەی دۆستی دولبەر لەگرتن رزگاری بووبێت! هەر بۆيە دادگا داوا دەكات بەپێی مادەی ٤٢١ لەياسای سزادان دەستگيربكرێت بۆ لێكۆڵينەوە....

## کەسوکاری دولبەر ناوا قسەدەکەن...

کاتێ دادگای جنایاتی سلێمانی دادگایی تاوانبار(فاتیح)ی کرد، لەئەنجامی پرسیاری دادگای بەرێزدا کەسوکاری ژنە کوژراوەکە بەم شێوەیە هاتنە دووان:

*باوکی دولبەر وتی:

-بەڵێ کچەکەم لەرانیە گیراو کەهێنرایەوە من دامەوە دەستی مێردەکەی، ئەو لەگەڵ دڵشاد قادردا گیرابوو، من لەوەوبەر ئەو کوڕەم نەدیبوو، نەشمبیستبوو پەیوەندی خراپ لەنێوان ئەوو دولبەردا بووبێ، چونکە من لەکەرکوك دەژیم و لەمانەوە دوور بووم، من شکاتم نییەو داوای هیچ لەبکوژی کچەکەم ناکەم،چونکە فاتیحی برازام لەپێناوی شەرەف و ناوبانگی خێزانەکەماندا ئەو کارەی کردووە،هەروەها کچەکەم راستی نەوتووە کە ئەو کابرایە خزمی ئێمە بووبێ، بۆیە لەرانیە چوبێتە ماڵیان!!

دایکی دولبەر وتی:

-من هەرگیز رەخنەم لەهەڵسوکەوتی کچەکەم نەبووە، تا لەگەڵ ئەم دۆستەیدا گیرا، لەوەوبەر رەوشتی جوان بووە، هەروەها پەیوەندیی لەگەڵ مێردەکەیدا زۆر باش بووە، بەلاّم فاتیح بەهۆی ئەو کارەی خۆیەوە کوشتی و من هیچ داوایەك دەرهەقی ناگرم....

*حەمەی برای فاتیح وتی:

-من تا ئەم کارەساتە هیچم لەبراژنەکەم نەدیبوو، پەیوەندیشی لەگەڵ کاکم زۆر باش بوو، ئەو کوڕە بووە هۆکاری سەربڕینی....!

*ژنەکەی حەمەش وتی:

-بەخوا دەمێك بوو باسی پەیوەندی خراپی دولبەرو دڵشادم لەدەمی خەڵکی بیستبوو... دڵنیام کەئەو ماڵەکەی لە داخی کاکە فاتیح جێنەهێشتبوو، بەڵکو شوێن دۆستە دوابڕاوەکەی کەوتبوو...!

## بڕیاری بەندکردنی فاتیح...

دادگای جنایاتی سلێمانی ڕۆژی ١٩٩٠/١١/١٣ بڕیاری دا بەبەندکردن (حبس شدید)ی تاوانبار فاتیح بۆ ماوەی (٤)ساڵ، بەڵام کەداوای ناوبراو ڕەوانەی دادگای تەمیز کرا بۆ پێداچوونەوە(دیارە دادگای تەمیز خاوەنی گەورەترین دەسەڵاتو دوابڕیارە)، لەتەمیز بەرگریی زیاتر لەبکوژەکە کراوەو ئەو چوار ساڵەی بۆ کراوە بەتەنیا ٢ساڵ...چونکە ئەو کارەی لەپێناوی سڕینەوەی پەڵەی عاردا کردووەو لەوەوبەر تاوانی نەکردووەو ئەو بڕیارەش ڕۆژی ١٨//١٢/١٩٩٠ڕاگەێنراوە.

## چەند پرسیارێک؟

ئەم تاوانە لەڕۆژگارێکی ژیانی ئەم میللەتەدا ڕوویداوە کە بەهۆی ڕژێمی دژ بەمرۆڤەوە لاوان ڕەوانەی سەربازی دەکران و لەژن و ماڵ و خێزان و ژیانی ئاسایی دوور دەخرانەوەو کەسانی وەك (دڵشاد)ی ئەم چیرۆکە هەواڵەش جاش و چەك لەشان بەکوچەو کۆڵانەکاندا دەسوڕانەوەودەبوونە تێکدەری ژیانی دەیان (دولبەر)، هەربۆیە لەکۆمەڵگای فرەچین و لەجێگایەکی پڕ لەعەشیرەتی وەك شوێنی ڕووداوەکە ئاسایی بوو تاوانی ئاوا ڕوویدات، بەڵام ئاخۆ گەر(لێکۆڵەرێکی کۆمەلایەتی) ڕوناکبیر، گوێ لەرازی ئەو دولبەرەو هەموو دولبەرەکان بگرێ کاتێ دەدرێن بەشوو، ژیانیان چاکتر نابێ؟ ئاخۆ لەم کۆمەڵگایەدا چەند دولبەری دیکەش وەك ئاژەڵ سەربڕابن؟!!!

لەچیای (سەگرمە)ی سەر بەناحیەی سەنگاو، لەدوا رۆژەکانی مانگی ئابی۱۹۹۲دا، بۆ(داربڕین) دەیان خێزانی ئەو ناوچەیەو شاری چەمچەمال بەقەدپاڵی چیاکەدا هەڵدەگەڕان، بەدەم هەڵڕشتنی ئارەقی ماندوویتییەوە(دار) دەبڕدراو چاك دەکراو کۆمەڵ دەکرا، بە نیازی بردنەوەیان چ بۆ خۆیانو زستانەکەیان، یان بۆ فرۆشتنەوەو دابین کردنی نان... سێ رۆژ بوو شێخ جەبار خۆیو هێرۆی کچیو حەمە رەشیدی ژن برای لەوناوەدا شەکەتی دار بڕین بوون، بەتایبەت شێخ جەبار کەتەمەنی لەپەنجا تێپەڕی بوو، هێرۆ بالأبەرزو چاو گەشو بەدیمەن، بەلأم هەمیشە ماتو نیگەران بوو، تەنانەت لەکاتی پشوو ونان خواردنو ئاوهێنانیشدا حەواسی ئەوەی نەبوو لەگەڵ دەستە خوشکەکانیدا بدوێ...

## جەزا دەگاتە ئەو ناوە

تازە خۆر بوو بووە سەروەری ئەو ناوچەیەو تیشکی زێڕینی بەسەگرمەدا پەخش کردبوو(جەزا)و یەك دوو هاوڕێی گەیشتنە ئاستی جێگای حەوانەوەی ماڵی شێخ جەبار، هێرۆ هەر کە چاوی پێی کەوت ئەو رۆژەی چەند مانگێ لەمەوبەری بیرکەوتەوە کەچۆن ئەم جەزایە ئێخەی(بەختیار)ی خوازبێنی کەری گرتبوو پێی وتبو(گەر جارێکی تر بچیتەوە خوازبێنی هێرۆ خراپت پێ دەکەم) پاشانیش پێی وتبوو!(من ساڵێکە داوام کردووەو حەزم لێی کردووەو چاوەڕوانیم، هەردەبێ بۆ خۆم بێت)... هێرۆ خۆی خەریك کردو ئەوانیش دوورکەوتنەوەو بەچیاکەدا هەڵگەڕان، شێخ جەبار چاوی بەدوایانەوە بوو، تادوورکەوتنەوە هەر دەیڕوانییە جەزا... ئەم جەزایە لەچەمچەماڵ ماڵیان دراوسێی ماڵی شێخ جەبارەو پەیوەندی نێوان ئەمانو ماڵە باوکی ئەو زۆر ئاساییە، هێندە نابێ ساڵێ لەمەوبەر چەند جارێ

دایکی جەزا بۆ خوازبێنی هێرۆ چووەتە لای دایکی، بەڵام بەوە رازی نەبوون... (جەزا) لاوێکی بالاًمامناوەندی تەمەن ٢٢ساڵ، گەنم رەنگ و چاو گەش و قژ رەش...

## کوژرانی جەزا..!

رۆژی ٨/٢٦، دوای نانخواردنی نیوەڕۆ جەزا بە رەمەزانی هاوڕێ و ئامۆزاو هاوکاری داربڕینی دەڵێ: من دەچمە سەر چیاکەو فەریکە قەزوان دێنم و پاشان دەیانکەمە تەزبیح، رەمەزان داوای لێ دەکات بەتەنیا نەڕوات، بەڵام بەگوێی ناکات و دەڕواو ئەو لەسەر کانییەکە جێدەهێڵێ، دوای دوو سەعات دەنگی تەقە دێ و پاشتر شوانێك ئاگاداری خەڵکی ئەو ناوە دەکات کەبریندارێك لەسەرەوە کەوتووەو حاڵی خراپە...! کەرەمەزان و شێرکۆی هاوڕێیان دەگەنە سەر بریندارەکە دەبینن(جەزایە)و دوو فیشەکی کلاشینکۆف بەر سکی و قۆڵی راستی کەوتووەو ئەوەی قۆڵی ئێسکەکەی هاڕیوەو ئەوەی سکیشی لەپشتییەوە دەرچووە... دەم و دەست پێیان دەڵێ شێخ جەبار ئەو کارەی کرد، هەروەك رەمەزان و شێرکۆ لەبەردەم دادگادا دواتر باسیان کردووە جەزا پێی وتوون: کەخەریکی قەزوان کردن بووم شێخ جەبار بەخۆی و تفەنگەکەی دەستیەوە بەرەو رووم هاتووەو بەبێ هیچ قسەیەك لوولەی تفەنگی تێکردووم و چەند فیشەکێکی پێوەناوم کەدوانیان پێکاومی.. لەرێگاش کەبەرەو چەمچەماڵیان بردووە هەرهەمان شتی وتۆتەوەو ئەوەشی باسکردووە: کەشێخ جەبار بەرلەوەی تەقەم لێ بکات وتی:

چی ئەکەی لێرە؟ بۆچی هاتووی بۆ ئەم ناوە؟

ئـيتر لـەڕێگا گيـانی دەردەچـێ و دواتـر لەنەخۆشـخانە دەردەكـەوێ كەفيشەكەكەی سكی تووشی خوێن بەربوونی كردووە..!

ڕەمـەزان بەدادگاشـی وتـووە: مـن دەمزانـی كەجـەزای ئامۆزام پەيوەنـدی لەگەڵ هێرۆدا هەبووەو بەنيازی هێنانی بووە..

## باوكی جەزا داوا تۆمار دەكات..

هـەر كەلاشـەی جـەزا دەگاتـەوە مـاڵ، هـەردوو شـايەت ڕەمـەزان و شـێركۆ ئاگـاداری بـاوكی دەكـەن كەبەسـەرهاتەكە ئـاوابووەو ئـەويش شـكات لەشێخ جەبار دەكات...

شێخ جەبار چی بەدادگا دەڵێت...؟

-من بێ تاوانم، لەگەڵ خێزانی خۆمداو لەگەڵ حەمـە ڕەشيدی ژن برامدا ڕۆژی ٨/٢٤ چووينە ئەو ناوە بۆ داربڕين، چونكە هەژار حـاڵين و پێويستمان بەوەيە، سێ ڕۆژ بوو لـەوێ بـووين، نيوەڕۆی سێيەم ڕۆژ دوای نـان خـواردن لــەنزيك جێگــای كارەكەمانــەوە دانيـشتبووم دەنگــی دەســتڕێژی تەقــە دايـچڵەكاندم، پاشـان تەقەكـە نـزيكتر بـووەوە لـێم، منـيش دەسـتم دايـە تفەنگەكـەی حەمــە ڕەشـيدو چــەند فيـشەكێكم بەهــەوادا تەقانــد... دوای سەعاتێ شوانێ ئاگاداری كردم كەبرينداری دلوای يارمەتی دەكات، كەئاوڕم دايـەوە دەبيـنم كـەس و كارەكـەم هـەموو ئـەو ناوەيـان جێهێـشتووە، منـيش لەچياكە دابـەزيم و سـواری ئوتومبێـل بـووم و چـوومە (سـلێمانی)!!، دوای ڕۆژێ زانيم كوژراوەكە جەزايـەو منيش تاوانبـار كراوم بەكوشتنی، دەست بـەجێ خـۆم دايـە دەسـتی پـۆليس.. هـيچ ناكۆكييـەك لەنێوانمانـدا نييـەو نـەبووە، نەشـم بيـستووە داوای هێـرۆی كـچمی كردبـێ، بـەڵام بەرلەماوەيـەك

بیستم هەرەشەی لەکوڕێك کردبوو کەهاتبووە خوازبێنی هێرۆ، من نەخۆشمو چەند جار نەشتەرگەریم بۆ کراوە، تکا دەکەم بمبەخشن..

## شایەتێکی گرنگ

حەمە رەشید،هەر چۆن دیبوی بەدادگای بەرێزی وت:

—من سەرقاڵی دار بڕین بوومو گوێم لەتەقەبوو، کەئاوڕم بۆ ئەو شوێنە دایەوە کەتەقەی لێوەکراو، (هەر ۱۰۰ مەترێك دەبوو) بینیم شێخ جەبار دیارەو تفەنگەکەی منی بەدەستەوەیە، کەشوانەکە هاواری کردو ویستم بگەمە سەر بریندارەکە" بەرلەوە شێخ جەباری زاوام پێی وتم کەلەناو دارەکانەوە کەسێکی نادیار تەقەی لێ کردووەو ئەمیش بۆ بەرگری لەخۆیی رووەو سەرچاوەی تەقەکە وەڵامی داوەتەوە،منیش دەست بەجێ تفەنگەکەم لێ سەندو ژنو منداڵەکانم لەگەڵ خۆمدا بردەوەو ئەو ناوەمان جێهێشت..دوای فەحسی کلاشینکۆفەکە بۆم دەرکەوت گومان لێکراو(٦)فیشەکی تەقاندووە... من بەر لەتەقەکانی شێخ جەبار گوێم لەتەقەی تر نەبوو، هەروەها چەکداری دیکەشم لەو ناوەدا نەدیبوو!

## بەرگری پارێزەرەکەی

بەرێز پارێزەری بەرگریکەر لەشێخ جەبار، رۆژی ۱۹۹۳/٥/٣ داوای دواخستنی دادگایی کردنی گومانلێکراوی کرد چونکە بەباشی خۆی بۆ بەرگریکردن ئامادەنەکردبوو، ئەوە بوو رۆژی ۱۸/٥دادگایی کردن بەئەنجام گەیەنراو پارێزەر وتی: جگە لەقسە گێڕانەوەی کوژراوەکە لەزمانی شایەتەکانەوە هیچ بەڵگەیەکی دیکە نییە بۆ کوشتنی بەئەنقەستی جەزا لەلان شێخ جەبارەوە، گومانلێکراویش ئەو کارەی بۆ بەبەرگریی لەگیانی

خۆی کردووەو گەر دادگاش قەناعەتی نییە بەئازاد کردنی تکا دەکەم بەپێی مادە(٤٢) سزا بدرێ کە ئەویش بەرگریی رەوایە لەخۆ..

## بڕیاری دادگا:

دادگای جنایاتی سلێمانی بڕیاریدا:

١-حوکم دان بەسەر شێخ جەباردا بە(١٥)پانزە ساڵ بەپێی ئەحکامی مادەی(٤٠٥) حساب کردنی ماوەی گرتنەکەی لە١٩٩٢/٩/١ تاوەکو ١٩٩٣/٥/١٧.

٢-دەست بەسەراگرتنی تفەنگی کلاشینکۆف (کە جەزای پێ کوژراوە)و رەوانەکردنی بۆ وەزارەتی کاروباری پێشمەرگە بۆ بەکارهێنانی بەپێی یاسا.

هێرۆ: وەڕستر لەرابردوو، هەمیشە مات، روو لەلاوازی، بەڵام چاوەکانی هەر گەش بوون وەکو جاران..

نیوەڕۆی یەکجار ساردی رۆژی ۱۹۹٤/۲/۱۰بوو، هەوری رەش بەجارێ ئاسمانی(سلێمانی)ی گرتبۆوە، یەکەمجار نم نمو دواتر بەخوڕ باران دایکرد،پاش کەمێکی تر ئۆتۆمبیلەکەی پۆلیسخانە لەئاستی دەرگای بەندیخانەدا وەستاو بەپەلە پۆلیسێك دابەزیو بەهەردوو دەستی یارمەتی ئەو پیرەژنەی‌دا کە(٥)مانگو نیوی تەواو بوو میوانی ئەم بەندیخانە دڵتەنگە بوو، ئوتومبیلەکە سەرەوخوار شۆڕبووەوە، پاسەوان دەرگای بۆ کردنەوەو پۆلیس ژنەی پێش خۆی نا، ویستی خۆ دانەوێنێ تابەدەرگا بچووكو تەنگەکەدا بڕواتە ژوورەوە، لەوڕیو بێ ئاگاییدا نێوچاوانی سرەواندە سەرەوەی دەرگاکە، واپێ دەچوو هەر بەخۆشی نەزانی بێ، کەچووە ژوورەوە دەستی برد سرکەیی سەری کەمێ داگرتو عەباکەی دایەوە بەسەری‌داو بەدەستەکەی دیکەشی بوخچەکەی لەبن باڵی گیر کرد، بەرلەوەی پۆلیسەکە بەژووری بەندیخانەی بسپێرێتەوە لەسەرخۆ ئاوڕێکی دایەوەو بۆی وەرچەرخا، پۆلیس خۆی گەیاندە ژێر چەتری سەردەرگا و ئەمیش بەپا وپێلاوی لاستیکی تەڕەوە یەك دوو هەنگاوی ناو، سەری هەڵبڕی رووەو ئاسمان، هەروەك بیەوێ بارانی شوبات بەباشی سیمای بشواتەوەو بەخواوەندیش بڵێ:

–ئەمە چی بوو خوایەگیان، ئەمە چی بوو لەچارەی منی قوڕبەسەر نووسرابوو!

دەنگی پۆلیسەکە بەئاگای هێنایەوە!

–فەرموو، فەرموو سەلمەخان بچۆرە ژووری.

بەچاوەکانی بەقسەی کردو ماتو مەلوول هەنگاوی نا، دەنگی داخستنی دەرگاو قفڵ دانی رایچڵەکاند... خونچەی هاودەمی چەند رۆژو شەوەی ژووری بەندیخانەی بەچاوی فرمێسکاوییەوە لەپێشوازیدا بوو.

**لەژوورەوە...**

کات بەرەو عەسر دەڕۆیی... خونچە بەدەورو خولی سەلمەدا دەهات و دەچوو، ئەم دیوو ئەو دیوی بەعەبا هەڵخراوەکەی سەلمە دەکرد، لەتەنیشتیەوە چیچکەی کردو لەسەرخۆ پێی وت:

–خوا ئاگای لێیە دایکم بمایە هەر بەقەد تۆ خۆشم دەویست، دەبا نانەکەت بۆ گەرم بکەمەوە، ئاخر تۆیەکی (٦٠)ساڵەی لاوازو نەخۆش کەی بەرگەی ئەوە دەگریت دوو رۆژ نان نەخۆیت!

*ناخۆم کچم پێم ناخوریێو بەری دڵم گیراوە.

–بەڵام خواش ئەمەی قبوڵ نییە.

سەلمە بۆخچەکەی تەنیشتی نایە سەر رانی و فرمێسک چووە چاوانی.

*ئەوە چییە، لەدادگا دایانیتیێ؟

–ئا، کورە گەورەکەم لەحەوشەی دادگا دایمێ، کوێربم بۆی چەند مانگە بوومە مایەی دەردەسەری بۆ خۆی و ژنەکەی، وتی دایەگیان ئەمە جلی پاکی خۆتی تیایەو هەندێ کولیچەشە پەروین بۆی کردوویت، هەر ئەوەی وت و گریان قوڕگی گرت، بەقوربانی بم، دیارە دڵی خەبەری پێ دابوو دایکە چارە رەشەکەی (٨)ساڵ حوکم دەدرێ.

*ئەوەندەیان حوکم دایت؟! لەخوا بەزیادبێ وماڵیان ئاوابێ، خۆ دەڵێن رووداوی کوشتنی واهەیە بیست ساڵ زیاتری بەناوچەوانەوەیە.

–ئاخر هەموو قسەی باشیان کردو خۆشم پەشیمان بوومەوە.وتم من باوکی فەرەیدوونم نەکوشتووە.

*ئێ..ئێ، چی تر، دەقەرزارم بیت ئەگەر هەموویم بۆ نەگێڕیتەوە...

-ئارامت بێ کچی خۆم، ئێستا حەواسم نییەو شەوی ئێرە دوورو درێژە، داینێ بۆ شەو... شەوێ هەموویت بۆ باس دەکەم خونچەگیان.
ئەوەی وت‌و پشتیکەی چاك کردو راکشا، چاوە بەقولاَچووەکانی بڕییە سەقفە رەش داگەڕاوەکە.

## ناوا دادگایی کرام...

بەخەمبارییەوە چایەکەی بەردەمی تێکدا، خونچە دەستی برد کولیچەیەکی تری لەزەرفی ناو بوخچەکە دەرهێنا.
*دە ئەمەش بخۆ دایەگیان، دیارە پەروینی بووکت تۆی زۆر خۆشدەوێ کولیچەی واجوانی بۆ کردوویت.
-ئەرێ وەڵلاَ..ئافرەتی چاکە، ئاخر چەند ساڵە ئاگاداری ژیانی پڕ لەکلۆڵی من بوو بەدەست ئەو پیرەمێردەوە...
*دادگا چۆن بوو، وتیان چی؟
-هەر کەپیاوە رۆب لەبەرەکان دانیشتن، کەوتنە قسەی نێوان خۆیان، منیش لەقەفەزەکەدا چاوەڕێ بووم، یەکەمجار هەردوو دشەکەم‌و رووناکی کچم قسەیان کرد، دشە گەورەکەم وتی:
-(عەسر پێم زانی کەوەستا حەسەنی کاکم مردووە، کەچوومە ماڵیان سەلمە وای باس کرد چووەتە دەرێ‌و هەزار دینار پارەی پێبووەو لێیان داوەو پارەکەیان بردووە، بەوە وەزعی تێك چووەو شەوێ لەماڵی خۆیان لەکاتی خەودا مردووە.. بەلاَم دوای پرسەکەی ئاشکرا بوو کە براژنەکەم خنکاندویەتی، ئەوە بەقسە بلاَبۆوە، ئێ خۆ خۆیشی دانی بەوەدا ناوە، نازانم چۆن ئەم کافرە دەستی چووە گیانی ئەو پیرەمێردە، بەلاَم ئاگاداری

ئەوەشم کە(٣)ساڵە بەینیان تەواو نییەو زوو زوو شەڕیان دەبوو... من داوا لەدادگا دەکەم تۆڵەی لێ بستێنێ..

*ئەی خوشکەکەی تری مێردەکەت وتی چی؟

-ئەویش بەهەمان شێوە، شکاتی خۆی کرد، وتی من ماڵەکەم لەگەڕەکی ماڵی وەستای خوالێخۆشبووی کاکمەوە نزیکە، منالی دراوسێکان خەبەریان دامێ، کەچووم تەنیا سەلمەو پەروینی بووکی لەوێ بوون، کاکیشم بەمردوویی لەجامخانەکە دانرابوو وبەتانی بەسەردا درابوو، هەروەها بەپارچە جامانەیەك دەموچاوی پێچرابوو، کەجامانەکەم لێ کردەوە لاڵ بم کاکم بینی خوێن لەدەمییەوە هاتبووە دەرو سەروچاوی بەنینۆك ڕنرابوو و دانێکیشی شکابوو... بەپەلە بردیانە مزگەوت و نەیانهێشت ئاگاداری پۆلیس بکەین، ئەوە بوو دوای چەند ڕۆژێ لەقەبر دەرهات و فەحس کرا..

پاشان دشەکەم وتی:

گەورەم، بکوژی کاکم سەلمە زیاتر کەسی تر نییە.

*ئەی روناك خان هەڵوێستی چۆن بوو؟ ئەویش وەك دشەکانت بوو؟

-نەوەڵلا، ئەو کچی خۆمەو دەزانێ چل ساڵە ئەو باوکەیان کەئێستا بەجێگای خۆی گەیشتووە چ زوخاوێکی بەگەروومدا کردووە، روناك پێی وتن دایکم لەزەمانی مەلیکەوە ژنی باوکمە کەچی دڵی لێی پیسبوو، ئاخر کەی دایکم لەرێی ئەوەدایە. باوکم ژیانی لێکردبووە دۆزەخ. هەمیشە جنێوی سووکی پێ دەداو لێشی دەدا، جارێکیان فەرهادی برام لەداخا خەریك بوو خۆی بکوژێ، ئێمە لەمندالییەوە دووچاری ئاژاوەی ناو ماڵەکەمان بووین.

## ئەوانیتر وتیان چی؟

شەو، پۆلیسێکی ئێشکگر لەودیو دەرگاکەوە بانگی کرد:

*هیچتان پێویست نییە؟

ئەمانیش وتیان نەخێرو سوپاسیان کرد، خونچە گڕی عەلادینەکەی خۆشکردو وتی:

*باتۆزێ بتشێلم، ئەمڕو سەرمات بووەو باران لێی داوی.

-ناخونچەگیان، لێم گەڕێ وەختە دڵم دەپچڕێ... کچی خۆم خەمی منت نەبێ، خۆمن هەموو عومرم هەر لەبەندیخانەدا بردۆتە سەر، باوەڕبکە چل ساڵە قەت نەم وتووە ئۆخەی.

*ئێ توخوا، ئەوانی تر وتیان چی؟

-دوای قسەکانی روناکی کچم باسی قسەی دکتۆر کرا کە دوای لەگۆڕ دەرهێنانەوەی لاشەکە نەزانراوە چۆن مردووە، بەلام قسەی دراوسێ و فەرەیدون کرایەوە کەدیویانە رەنگی پێستی شین هەڵگەڕاوە، ئینجا باسی ئەوە کرا کەچۆن منیان بردۆتەوە ماڵی خۆمان و گێڕاومەتەوە چۆن کوشتومە،ئاخر دەمم شکێ کە گرتیانم قسەم کرد، بەلام ئەمڕۆ لێی پەشیمان بوومەوە، ئینجا پیاوێکی مەحکەمە قسەی کردو چاوی بڕیە منو وتی:

(ئەم ژنە رۆژی١٩٩٣/٨/١٧مێردەکەی خۆی کوشتووە، هۆکەشی ژیانی پڕلەئاژاوەیان بووە، خۆی لای پۆلیس دانی بەتاوانەکەیدا ناوە کەچی ئەمڕۆ لەقسەکانی پاشگەز دەبێتەوە، کە خنکاندوویەتی ئەویش بەرگری لەخۆی کردووەو بەدەستی خۆی سەروچاوی زامدار بووە، ئەوانەی دیویشیانە وتویانە شین هەڵگەڕاوە، کەواتە دەبێ سزای رەوای خۆی وەرگرێ).

*ئەی تۆ وتت چی؟

–هیچ، نەیانهێشت جارێ قسەبکەمەوە. ئەو قسانە ئەوەندەی تر ئەژنۆی شکاندمو نەمتوانی بەپێوە بوەستمو کەوتمە لەرزینو بۆی دانیشتم... ئیتر پارێزەرەکەم قسەی کرد، بەقوربانی دەمی بم وەك برایەکی دڵسۆز دیفاعی لێم کرد، ئەو پێی وتن (دەبێ لەزروفی ئەم ژنە بکۆڵنەوە، هەروەها لەهەڵسوکەوتی مێردەکەی، گەر قسەی سووکی خوالێخۆشبوو نەبووایە ئەم ئەو کارەی نەدەکرد، مێردەکەی سالآنێکی دوورو درێژ زوڵمی لێ کردووە، ئەم پیرەو گوناهە، تکا دەکەم بەزەییتان پیایدا بێتەوەو کەم حوکمی بدەن، ئێ خۆ عومریشی هیچی ئەوتۆی بەبەرەوە نەماوە تا لەبەندیخانەدا بیباتە سەر، مناڵەکانیشی تاوانیان چییە لەماڵێکی بێ باوكو دایكدا بژین)

## ئەوانیتر چییان بۆ دادگا تۆمار کردووە؟

*حاجی شەریفی دراوسێیان بەدادگای وتووە:

–نیوەڕۆ بانگیان کردم کەبچمە مزگەوتو وەستا بشۆم، من گەلێ جار لەرێی خودا کاری وادەکەم، لاشەکەی بۆنێکی ناخۆشی لێ دەهات، دیاربوو لەشەوێوە زایە بووە، رەنگی پێستەکەی شینی تۆخ هەڵگەڕابوو! جێگای چنگو خوێن بەڕوویەوە دیار بوو، هەروەها دانێکی پێشەوەشی شکابوو! نازانم چۆن مردووە، بەڵام ئەوە دەزانم کەبەمەرگی خواو ئاسایی گیانی نەسپاردووە، پێم وایە جلە پاکەکانی بەری دوای مردنی لەبەری کرابێت!!

*عەبدول، دراوسێکەی دیکەیان وتبووی:

–منیش هەروا دیم، بەمەرگی ئاسایی نەمردووە، منیش وتم باخەبەری پۆلیس بدەین بەڵام ژنەکەیو کوڕەکانی رازی نەبوون!

*ناهیدەی دراوسێش وتوویەتی:

-بەخوا شەو گوێم لەدەنگی شەڕو هەرایان نەبووە، بەڵام نیوەڕۆ هاواریان لێ هەڵساو زانیمان وەستا حەسەن نەماوە! کە چووین وتیان دز هاتۆتە سەرمانو لێی دراوە!!

## تاوانەکە بەمجۆرە ئەنجام دراوە

درەنگانی شەو، سەلمە کەمێ سەرمای بوو، خۆی بۆ گرمۆڵە کردو وتی:

-خونچە، ئێستا تۆ لەجێی کچی منی، با هەموو شتێ بزانی، کەی من لەڕێی ئەوەدا بووم وام پێ بوترێو کاری وابکەم، کەی دەبوو چارەنووسی عومری من بەندیخانەبێ، دیارە لەنێوچاوانم نوسرابوو، رۆڵە لەهیچمان کەم نەبوو، منداڵەکان سوێندیان بەسەرم دەخوارد، بەڵام (وەستا) هەمیشە سوکایەتی بەمن دەکرد، خەریك بوو فەرهاد لەداخا خۆی بکوژێ، حەوت منداڵم لێی هەبوو بەڵام خوا چواریانی بۆ هێشمەوە، جاروبار دەچووینە گوندەکەمان لەلای چیای بەرانان، چەندە ئامۆژگاری باوکیان دەکرد بێ سوود بوو.. رۆژێ قسەیەکی خۆشم لێ نەدەبیست، دوای ئەوەی لەچارەم نەنوسرابوو لەنامیقی مێردی یەکەمم خێر ببینم لەیەك جیابووینەوەو نسیبم بوو بەنسیبی باوکی فەرەیدوونەوە.. ئاخ لەو عومرەی من لەگەڵیا ژیام، زۆرجار دەپاڕامەوە بەمەرگی خۆم شادبم...ئێوارەی ئەو رۆژەی رووداوەکە منو فەرهادی کوڕم لەئاهەنگی ژنهێنانی ئامۆزایەکم گەڕاینەوە، وەستا لەگەڵما گرژ بوو، نانمان خواردو لەگەڵ بووکەکەم(ژنەکەی فەرەیدوون) کەمێردەکەی لەماڵ نەبوو ئەو شەوە بۆخۆمان قسەمان دەکردو سەیری تەلەفزیۆنمان دەکرد، شەو درەنگ چووینە سەربان، لەوێ مامەوە تاکوڕەکەمو بووکەکەم خەوتن ئیتر لەسەر داوای وەستا هاتمە خوارەوەو لەجامخانەکە چوومە جێگاکەیەوە.. کەچی کەدرەنگ تر کەوت بەبێ هۆ

کەوتە جنێو پێدانم، جنێوی سووک کەهی ئەوەنین باسکرێن... ڕۆڵە ئەو خەوتو من خەو نەچووە چاوم، وەك ماخۆلانم لێهاتو ئۆقرەم نەدەگرت، هەموو سالآنی رابردوو پەنگ بوونمان لەگەڕەکداو لەناو کەسوکاردا وەك فلیم دەهاتەوە بەرچاوم... بەتایبەت ئەو جنێو پێدانەی کاری لەمێشكو ئێسقانم دەکرد، ئەو پێمی دەووت:

-تۆ خراپیت، ئەزانم چەند ساڵە بەدزی منەوە لەگەڵ نامیقی کۆنە مێردت رادەبوێری!!

جاتوخوا من لەرێگای ئەوەدام، کێ بێ شەرەفی خۆیو منالی هێندە لا هەرزان بێ.. ڕۆڵە، خەلەفاو بوو، خوا سەری لێ تێکدابوو، ئەو شەوە دنیا خەوتبوون کەچی ئاخر شەڕە هەر جوێنی پێدەدام، منیش عەقڵم لەدەست داو وتم شەرت بێ حەقی سی چل ساڵ عومری سووتاومت لێ بکەمەوە، خەوتو کەوتە پرخە پرخ، منیش چووم پەڕۆیەکم هێناو خستمە سەر دەمو لووتی، کەوتە خۆ راپسکانو چنگ وەشاندن، بەلآم خوایە تۆبە سوودی نەبوو، هەناسەی لێ بڕا، بڕوام پێبکە ئا لەوکاتەدا پەشیمان بوومەوە، هەرچەند رام وەشاند، لێی پاڕامەوە بمبوریو چاوبکاتەوە بەلآم بێ سوود بوو... مردو دامپۆشی... بەیانی زوو روانیمە کراسی بیجامەکەی بینیم خوێنی پێوەیە، خێرا گۆڕیم، فەرهاد هاتە خوارەوەو بەیانی باشی کرد، نەیدەزانی دایکی کلۆلی لەچ بەیانییەکی باشدایە!! هەروەها پەروین دابەزیو دەمو چاومی خوێندەوە، بانگم کردو وتم(دز) دەستی لێ وەشاندووە! دواتر دەمەو نیوەڕۆ مردنی وەستامان ئاشکرا کردو دەرودراوسێ دابارین، نێژراو پرسەی بۆ دانرا، ترسی خوا لەدلما بوو. خوایە تۆبەبێ، دواتر بەکەسو کاری ئەو، منو فەرهادو پەروین بەگرتن دراینو یەکسەر لەوێ دانم بەتاوانەکەدانا... ڕۆڵە ئەمە راستی

مەسەلەکەبوو، خۆزگە ئەوەم نەکردبا، بەلاّم منالّەکان و کەس وکارو گەڕەك ئاگادارن ئەو پیاوە چی بەمن دەکرد !!

یەکەمجار بوو خونچە بەسەرهاتی واببیستیّ، ئەو بەتۆمەتی(دزی) کردن لەبەندیخانەدا توند کرابوو، لەو ماوەیەی هاتبووە ئەویّ سەلمە راستیی مەسەلەکەی لای ئەوو کەسی تر نەدرکاندبوو... ئەوەندەی لەدەست هات کەمێکی دیکە دلّخۆشی ئەو پیرێژنە بەدبەختە بداتەوەو چاوانی لێك نیّو بۆ چەند ساتیّ سەلمەو ژووری بەندیخانە جێبهێلّیّو خەو بەدنیایەکی ترەوە ببینیّ... کات بیووە بەرەبەیان و سەلمە هەر دانیشبوو، مندالّەکان بەبەرچاویا دەهاتن و دەچوون، جار جارە یەکێکیانی دەگرت و تێر لاملی ماچ دەکردن، مەلا بانگی داو هەستا بۆ نوێژ خۆی ئامادەبکات، لەگەلّ کۆتایی بانگەکەدا سەری بەرزکردەوەو لەناخەوە وتی:

-خوای گەورە، بمبورە، بەر رەحمەتی خۆتم بخە خوایە گیان.

شەوی ٩/١٠بانگی خەوتنانی فەرموو، کەریم چووە سەر بەرماڵ نوێژی دابەست، ئافتاوی خێزانی هەستی کرد کوڕە بچکۆلەکەی لەحەوشەوە بەرەو دەرگای دەرەوە چوو، شوێنی کەوت، بینی قاپی کراوەتەوەو منداڵەکەی بەدیار کوڕێکی بێهۆشەوە واقی وڕماوە، سەرنجی کوڕەی دا بوراوەتەوە، لێی نزیک بووەوەو بۆی دانەوییەوەو تێی ڕوانیو نەیناسی، بەزەیی پیاهاتەوە، دەستی دایە باڵیو هێزی دایە خۆیو ڕایکێشایە نێو حەوشەکەیان.. کەریم لەنوێژ بووەو ڕووەو حەوشە هەنگاوی نا، کە ئەو دیمەنەی بینی حەپەسا، بێ ئەوەی بدوێ یارمەتی ئافتاوی داو بەهەردووکیان کوڕەیان بەرەو ژوورەکەیان کێش کرد، ئاویان پرژاندە دەموچاوی، کەمێ هۆشی هاتەوە، کوڕە هیچی نەوت، بەترسەوە سەرنجی ژنومێردەی دەداو ڕەنگی زەرد هەڵگەرابوو...

کەریم لێی پرسی:

-بۆ وات لێ هاتووە؟ چی قەوماوە؟!

کوڕە وەڵامی نەبوو...

ئافتاو لێی پرسی:

-خەڵکی کوێیت؟..ماڵتان لەکوێیە؟

بەدەستی ئاماژەی بۆ لای چەپ کردو بەدەنگی نزم وتی لەخوار ئێوەوەین...

کەریم وتی:

-لێی گەڕێ، هەڵسە قۆرییە چایەکە بخەرەوە سەر عەلادینەکە باگەرم بێتەوەو چایی بۆ تێکە...

## هاتنی پۆلیس...

پاش ماوەیەك لەدەرگا درا، كە چوون كردیانەوە دووكوڕی ترو چەند پۆلیسێك هاتنە ژوورەوەو هەواڵی لاوەكەیان پرسی و یەكێكیان وتی:

-خاڵە گیان وتیان رزگار لێرەیە...

كەریم وەڵامی دانەوە:

-كوڕێك لێرەیە نازانین ناوی چییە، لەژوورەوەیە...

پۆلیسێك وتی:

-تەواوە، ئەوە برای ئەمانەو تاوانی كردووە، تەقەی لەدووان كردووە...

كەریم شپرزە بوو، ویستی بدوێ و ئافتاو بواری نەداو وتی:

-نەكەریم و نەمن نایناسین... لەبەر قاپییەكە لەهۆش خۆی چوو بوو، بەزەییم پیایدا هاتەوەو هێنامانە ژوورەوە...ئەیەڕۆ كێی كوشتووە؟!

یەك لەكوڕەكان وتی:

-باوكی و باوەژنەكەی...

بەدەم چوونە ژوورەوە ئەوەی تریان وتی:

-خاڵە گیان ئێمە كوڕی كاك عومەری بازرگانین، ماڵمان لەخوار خۆتانەوەیە...

رزگار هەموو لەشی وەك شۆڕەبی دەلەرزی و بەبێ دەنگی تێی دەڕوانین، یەك لەپۆلیسەكان باڵی گرت و پێی وت:

-فەرموو پێشمان كەوە...

ئەوان لەماڵ دەرچوون و ئافتاو هەردوو دەستی نووساند بەسنگییەوەو وتی:

-ئاخر زەمانە... ئاخر زەمان.!

## رزگار کێ بوو؟

تەمەنی ١٩ساڵ، خوێندکاری ئامادەیی بەشی وێژەیی بوو، رزگار یەکێ بوو لەمنداڵەکانی کاك عومەر(لە ژنی یەکەمی)، دایکی ١٢ساڵ لەوەوبەر بەنەخۆشییەك وەفاتی کردبوو، باوکیشی ژنێکی دیکەی هێنابووەوەو(٣) منداڵی لێی بوو بوو، رزگار لەماڵێکی دیکەدا دەژیا کەباوکی لەپشت ماڵەکەی خۆیەوە بۆ ئەوو خوشكو براکانی تەرخان کردبوو، بەر لەو شەوەو لەو رووداو خوێناوییە بەقسەی خوشكو براکانی خۆی(رزگار) ناسروشتیو شپرزە حاڵ بوو، شەوان درەنگ دەهاتەوە ماڵو زۆر جار بەگلەیی بوو لەباوکی، دوای رووداوەکەش خوشکەکەی وتبووی (لەدۆلابەکەیدا حەبی ڤالیۆمو دەرزیم بینی کەپێشتر نەمدیبوو بەکاریان بهێنێ)... هەروەها پەیمانی خوشکی وتبووی:

-لەوەوبەر رزگار وانەبوو، نازانم بۆچی وای لێهات، رووی خۆش نەمابوو، تەنانەت کە ئەنجامی تاقیکردنەوەکەشی وەرگرتو دەرچوو بۆ پۆلی شەشەم وەك ساڵانی رابردوو شادمانی پێوە نەدەبینرا!

## تاوان..تاوانی کوشتنی باوکی خۆی..

رزگار راستو رەوان لە لێکۆڵینەوەی سەرەتاییداو پاش ساڵێك چەند رۆژێك کەمیش لە دادگادا دانی بەتاوانەکەیدا ناو هەردوو جار وتبووی:

-دوای مردنی دایکمو ژن هێنانەوەی دووەمی، باوکم لەگەڵماندا گۆڕاو زۆر خراپ بوو، مامەڵەی لەگەڵماندا باش نەبوو وهیچ بایەخێکی ئەوتۆی پێ نەدەداین، ئەوانە کاری لەهەمووومان کردبوو، من دەمویست تۆڵەی ئەوانەی لێ بستێنم، کەنیازی خۆم بەهەڤاڵی برادەرم وت بەدەنگمەوە هاتو

دەمانــچەیەکی بێــدەنگی پەیــدا کــرد. ئێــوارەی ئــەو رۆژە (٩/١٠/٩٩٣) هەردووکمان چووینە ماڵی باوکمو لەوێ من چوومە ژوورەکەی و هەقاڵیش لەئاودەستەکەدا دەمانچەکەی هێنایە سەرپێ و چووم لێم وەرگرت و چووینە ژوورەکەو پێوەم نا، بەلاّم ئەو نەمردو رێکەوت بەر باوەژنەکەشم کەوت و ئەوی کوشت، من نیازی دزینی پارەی باوکمم نەبوو، ئەو هەرچەندە دەوڵەمەندبوو بەلاّم من تەماعم نەکردبووە پارەکانی، دەڵێن بۆیە ئەوەت کردووە تا پارەکانی بەریت و لەگەڵ هەڤاڵدا بچنە هەندەران، بەلاّم ئەوە بریاری ئێمە نەبوو، من هەر دەمویست تۆڵەی هەڵسوکەوتی خۆی لێ بکەمەوە...

دواجاریش رزگار بەدادگای وتبوو:

-ئەمە یەکەم جارە دەگیرێم و لەوەوبەر نەتاوانم کردووەو نەگیراوم..

## وەڵامی برا گەورەکەی

فەرەیدونی برا گەورەی رزگار کەپیشەی کاسبکار بوو لەوەلاّمەکانیدا بەدادگای وتبوو:

-ماڵمان جیابوو، بەلاّم باوکم مەسرەفی باشی نەدەکرین، رزگار خوێندکاری ئامادەیی بوو، کەچی باوکم مانگی تەنها(٣٠)دیناری دەدایە بۆ خەرجی! خوا هەقە باوەژنەکەمان وەك دایکمان وابوو، هەموومانی خۆش دەویست... نازانم رزگار ئەوەی بۆ کرد.. کاری هاورێی خراپ بوو یان تەگبیری چوونە دەرەوە...نازانم!!!

## باوكی زامدار كارەساتەكە دەگێڕێتەوە..

كاك عومەر ی (٥٥)ساڵ بە حەسرەتو ماندوێتییەوە قسەی كردبوو، ئەو بەسەرهاتی تاوانەكەی بەمجۆرە گێڕابووەوە:

-پەیوەندیم لەگەڵ رزگارو منداڵەكانی تر زۆر باش بوو، خەرجی و ئەركیان لەسەر خۆم بوو، جیاوازیم نەدەكردن لەگەڵ سیانەكەی لەزەكیّ خوا دابوونی، زەكیّ هەموویانی وەك جگەر گۆشەی خۆی دەزانی، ئەو ئێوارەیەی رووداوەكەیان قەوماند رزگارو هاوڕێكەی (كە لەلێكۆڵینەوەی پۆلیس لای دادوەر زانیم ناوی هەڤاڵە) هاتنە ماڵمانو كەرزگار هاتە ژوورەكەی من(١٠٠)دینار خەلاّتی دەرچوونیم پێداو پیرۆزبایم لێكرد پاشان داوام لێكرد، كەرۆژی دوایی بچیّو بەشە ئاردەكەمان وەربگرێت...چووە دەریّو دوای ماوەیەك لەگەڵ هاوڕێكەیدا هاتەوەو بینیم دەمانچەیەكی بەدەستەوەیە، سەرم سوڕما، بیّ ئەوەی وشەیەك بڵیّ رووی دەمانچەی تیّ كردم، بیّ ئەوەی دەنگی تەقە ببیستم هەستم بەدوو فیشەك كرد چوونە گۆشتمەوە، شپرزە بوومو دانیشتمو خوێن فیچقەی كرد... زەكیّ هاتە ژوورەوەو كە خوێنەكەی منی بینی حەپەسا، بەبینینی دەمانچەی دەستی رزگار یەكجار شپرزە بوو، هانای بۆ برد لێم گەڕیّ، بەلاّم بیّ سوود بوو، هێزم دایە خۆم پەلاماری بدەمو دەمانچەكەی لیّ بستێنم بەلاّم نەمتوانی، ئەو دەستی نایەوە بەپەلەپیتكەداو بەرشانی ژنەكەم كەوت، بینیم كەوتو بێهۆش بوو، وەك شێت كەوتە دەمانچە پێوە نانەوەی منو(٣) فیشەكی تری نا بەدەستو قاچمەوەو ژوورەكەیان جێهێشت... بەرچاوم لێڵ بوو بەلاّم هۆشم لای خۆم مابوو، بینیم كوڕەكەمو هەڤاڵ چوونە دەر... وەك وتیان كەمنداڵە بچووكەكەم دراوسێی بانگ كردبوو و لەو كاتەدا كەئێمەیان بەرەو

نەخۆشخانە بردبوو هەڤاڵیش ئەوی بەرەو کۆڵان راکێشابوو... ئەوە بوو هەر ئەو شەوە ئەوان گیران، دڵنیام ئەو دوو تاوانکارە ویستیان بمکوژن تا پارەکانم ببەن و پێی دەرچن بۆ دەرەوەی وڵات، هەروەها پێم وایە هاندەری رزگار بۆ ئەو تاوانە هەڤاڵی هاوڕێی بووە چونکە تەگبیری بۆ کردووەو دەمانچەی بۆ پەیدا کردووەو لەجێبەجێ کردنیشدا لەگەڵیا بوو و یارمەتی دا...

## رزگار.. دوای (٢٥)ساڵ رزگاری دەبێت..!

رۆژی ١٩٩٤/٩/١٧کە دادگایی رزگار کرا دۆسیەی (هەڤاڵ) جودا کرایەوە تا سەربەخۆ دادگایی بکرێت، قەناعەتی دادگای بەرێز بەو جۆرە بوو کە رزگار ئەو کارە نامرۆڤانەیەی بۆیە کردووە تا پارەکانی باوکی ببات و لەگەڵ هاوڕێکەیدا بەرەو وڵاتان سەری خۆیانی پێهەڵبگرن... تاوانەکە دووانە، یەکیان هەوڵی بەئەنقەست کوشتنی باوکی، دووەمیشیان کوشتنی باوەژنەکەی لەو رووداوەدا... ئەو مرۆڤێکی کوشتووەو مرۆڤێکی تریش کە باوکێتی بە(٥)فیشەکەوە لەمەرگ نزیک بووەتەوە، گەر دڵسۆزانی نەخۆشخانە فریای نەکەوتنایە ئەوا ئەگەری مردنی یەکجار زۆر بووە...

کەواتە تاوانەکە هەردوو ماددەی ٤٠٦و٤٠٥دەیانگرێتەوەو بەپێی ئەو ماددانە حوکم بەسەر رزگار درا بەم شێوەیە:

١-زیندانی کردنی رزگار بەهەمیشەیی.

٢-دەبێ لەگەڵ هەڤاڵ کەدادگایی کرا بڕی ١٠هەزار دینار بدەنە عومەر(باوکی رزگار)وەك قەرەبووی مادی و مەعنەوی. هەروەها بڕی دوو هەزار دینار بۆ منداڵە بچووکەکانی زەکی.

٣-دەست بەسەرداگرتنی دەمانچە(تارق) کەو ناردنی بۆ پارێزگا...

## ئەی رزگارەکانی دیکە؟!!

–راستەو بەجێیەو ڕەوایە کە رزگار عومەر سزای ئەو تاوانە سەختو گەورەیەی خۆی وەربگرێتو لەچوار دیواری زیندانەوە بڕوانێتە ژیانو هەندەرانو چارەنووسی...

–راستە لەژیانی ئێمەو کۆمەڵی کوردەواریدا دایكو باوك مەزننو کەمجار رێکەوتووە کوڕ دەستی بچێتە خوێنی باوکی خۆی یان کەسوکاری...

–بەلاّم داخۆ رزگارێك کە بەپلەی باش بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی دەرچووبێت، بۆ لێرە خۆی بەنامۆ دەزانێت!!! بۆ بەحەب بخەوێتو ئامانجی هەندەران بیت؟!!

–داخۆ سەدان رزگاری دیکەش خەونی رەنگاو رەنگ بەشەقامو باخچەو کارکردن (هەرکارکردنێ بێ) لەدەرەوە نابینن؟

–لە رزگاریش بترازێت، داخۆ چەند خاوەن بڕوانامەو خاوەن ماڵو(هەندێکیان سامانیش) دەخوازن بۆی دەرچنو بەرەو فیردەوسی خەونەکانیان بکەونەڕێ....

–دەبوو نیشتمانی لەدوژمن پاك کراوە. نیشتمانی خاوەن داستانی راپەڕینو بەرەو دیموکرات. بەجۆرێ بوایە نەك (رزگارەکان) راکەن لێی، بەڵکو بۆی بێنەوە...بەلاّم نەفرەت لەشەڕ... نەفرەت لەبرسێتی.. نەفرەت....

(ئاسۆ)ی تەمەن (٢٧) ساڵی خێر لەخۆ نەدیو، دوای ئەوەی حەوت ساڵی رەبەق بەدەگمەن نەبووبێ دەرگای ماڵی نەترازاندبوو، حەوت ساڵی دووروودرێژ لەگەڵ دەردو نەخۆشیدا دەژیا، حەوت ساڵی تەواو ئازاری (ژیری سامناک)ی دەچەشت...

لەوەوبەر، پێش ئەوەی دووچاری ئەو دەردە بێت، ئاسۆ خوێندکارێکی هێمن و لاوێکی زیرەك و ئەندامێکی بەکەڵکی خێزانەکەی بوو، بەڵام دواتر، لەگەڵ مامەڵەی خراپ و لێدان و ئازاردان و بەسەرداکێشانی لەلایەن ئەو بێ ویژدانەوە ئاسۆ گۆڕرا... لەماوەی ئەم حەوت ساڵەی نەخۆشیدا، زۆربەی کات، زۆربەی شەوو رۆژەکانی.. ئاسۆی کلۆڵ شێوازەی بیرکردنەوەی پچڕپچڕبوون... هەستی بە بەرپرسیاری نەدەکرد، هەرگیز بڕیاری بۆ نەدەدرا، نە بڕیاری گەورەو نە بچووك.! توانا و وزەی روو لەکزی بوون، (دەرمان) بۆ ئەو سەرچاوەی ژیان بوو، پێی هێور دەبووەوەو کەمێ لەئازارەکانی کەم دەبووەوە، هەر کەدەرمانەکەشی لێ ببڕایە ئەوا بەجارێ ئۆقرەی لێ دەبڕا...ئاسۆ باش دەیزانی سوودێکی بۆ کۆمەڵەکەی و تەنانەت بۆ خێزانەکەی نییە، بگرە بۆ خۆیشی، بەڵام شایانی ئەوە بوو بژی،وەك هەر یەکێك لەو خەڵکە، وەك من و تۆ. بامن و تۆ هەرگیز تووڕەش نەبین و دەستیش لەخەڵکی نەوەشێنین..

ئاسۆ هەمیشە غەمبار بوو، گەلێ جار لەکونجی ژوورەوە بەهێمنی دادەنیشت، یان دەچووە بەر دەرگا و گەر کەسێکی وای نەدیبا ئەوا چاوە ماندووەکانی دەبڕییە(گۆیژە)وئیدی بەبالای بەرزی چیاکەدا هەڵدەگەڕاو گەر یەکێ بیدیایە نەیدەزانی دەڕوانێتە کوێ و چی بەبیری ئاڵۆزو شپرزەیدا دێت! جاری وایش هەبوو، ئاسۆ نەخۆشی زۆری بۆ دەهێناو تووڕە دەبوو... بەجارێ دۆو دۆشاوی تێکەڵ دەکرد!!

## شەوی(٢٥)ی حوزەیران و مەرگی ئاسۆ

دوای راپەڕین، شەوێکی حوزەیرانی هاوین بوو، دایکی ئاسۆ بەر لەوەی لەگەڵ منداڵەکانی دیکەیدا بچێتە سەربان و بخەوێت، گەڕایەوە هۆڵەکەو دەستی دایە چەرچەفی بەرپێی ئاسۆو جگەر گۆشە نەخۆشەکەی داپۆشی...لەناو دەرگای ژوورەکەدا بۆی وەستاو ئاوڕێکی لێ دایەوە، تێی راماو لەوە دەچوو پێی بڵێ:

- بنوو... بەقوربانت بم... خەوی خێرت بێ... بنوو، سەبەبکارت بەکۆی زوخاڵ بێت...

دایکی سەرکەوتە سەربان و لەجێگای خۆیدا راکشاو (کوڕە نوقسانەکەی)لەژێر پێڵووەکانیدا خەوت و... ئاسۆش لەخوارەوە بەو پەڕی دڵنیاییەوە دەستی کردبووە گەردنی خەوێکی شیرین... بەرلەوەی بنوێ (کابرای هۆڵەکە )مایەی هەموو دڵنیاییەکی ئەو بەستە زمانە بوو...!

کابرا نەخەوتبوو.. شەیتانەکان لەناو سەریدا وەك پورەی هەنگ دەهاتن و دەچوون، پاش ئەوەی دڵنیا بوو لەوەی ئاسۆ خەوی لێ کەوتووە، هەڵسا، کەمێ راما، لەسەرخۆ چووە دەرەوە،ویستی بڕیارە گڵاوەکەی جێبەجێ بکات، ویستی ئاسۆی نەخۆشی بێ دەسەڵات و بێ چارە بکوژێت!! هەر بەوە دڵی دانەمرکابوو کەخۆی تێکی دابوو، دەشیویست بیکوژێت!.. ئەو مرۆڤە بکوژێ کەهەموو رۆژێك و هەموو شەوێك دەیبینی!...

لەو سەر گەڕایەوەو بلۆکێکی کۆنکرێتی پێ بوو، نزیك ئاسۆ بۆی وەستا، بەدەستە رەشەکانی بلۆکەکەی بەرز کردەوەو بەهەموو هێزێکی خۆیەوە ئاراستەی سەرسنگی کرد...کوڕە کەمێ جولا، کڕوزەیەکی (نیوەشەو خوڕپێن) لە لێوەکانییەوە هاتنەدەر، ئەمجارەیان پیاوە

خانەنشینە تەمەن (٥٧)ساڵەکە وەك دڕندەیەك بلۆکەکەی سەر لەنوێ بەرز کردەوەو دای بەتەوقی سەریدا.. ئاسۆ دوا هەنسکو دواهەناسەی پێکەوە مردن..

## ئاسۆ دەبرێتە ژێر زەمینەوە!.

بکوژەکە، وەك ئەوەی راوچییەکی لێهاتوو بێتو نێچیرێکی قەڵەوی چنگ کەوتبێ، پەلاماری ئاسۆی داو بەراکێشانو بەرزکردنەوە گەیاندییە ژێرزەمینەکە، لەوێ کارێکی وای کرد ئەگەر ئەستێرەکانی ئاسمانی ئەو شەوە هاوینییە بیاندیبا هاواریان دەکرد:

-نەکەیت، ئەم تاوانەش نەکەیت، ئێمە لێت خۆش نابین!..

گەر تریفەی مانگە شەویش چاوی لێ بوایە، لێی دەپاڕایەوەو دەیگووت:

-چۆن دڵت دێ، بۆلێی ناگەڕێی، ئاخر چەند چرکەیەك لەمەوبەر رۆحیانەتی کوڕە کلۆڵەکەت بەرەو ئاسمان هەڵکشا...

گەر باڵندەی نێو قەفەزیش ئاگادار بوونایە، دەگریانو دەیانووت:

-دەستی لێ مەدە، ئاخر دەمێکە ئەویش بەندی نێوقەفەزە، توخوا ئازاری جەستەی بێ گیانی مەدە..

ئەگەر، دایکە حەسرەت دیدەکەشی ئەو دیمەنەی بەچاوی خۆی بدیایە، دەیزریکاندو دەیووت:

-وای لێ مەکە دڕندە، وای لێ مەکە.. ئەمڕۆ بێ یاسبەی هەر خۆم شکاتت لێ دەکەمو دەڵێم ئەم تاوانبارە بوو یەکەمجاریش لەکوڕەکەی منی داو شێتی کرد، هەر خۆی بوو حەوت ساڵ لەمەوبەر کوڕی خوێندکاری منی شپرزە کردو مێشکی تێکدا...

ئەستێرەو تریفەی مانگ‌و باڵندەکان‌و دایکی ئاسۆ ئەو تاوانبارەیان نەدی، ئەویش لەهیچیان نەسڵەمیەوەو مەرامی خۆی ئەنجامدا..

## نهێنییەکانی شەوی تاوان..

هەر کەلاشەکەی لەژێر زەمینەکە دانا، بەپەلەو بەدەروونێکی ئاڵۆزەوە سەرکەوتەوە سەریێ، لەو ساتەدا برا بچووکەکەی ئاسۆ بۆ دەست بە ئاوگەیاندن لەسەربان هاتبووە خوار، چاوی بەبکوژی براکەی کەوت، بەڵام ئەوەی بەبیردا نەهات نزیکترین کەس تاوانی وای کردبێت، ئەم خۆی خلافاندو ئەویش دوای کارەکەی چووەوە سەربان، لەموبەق دەستی دایە کێردێکی گەورەو گەڕایەوە لای جوانەمەرگی ژێرزەمینەکەو، سێ گونیەی بەتاڵیشی پێ بوو، وەك درندەترین بوونەوەر کەوتە لاشەی ساردەوەبووی ئاسۆ، دەستەکانی..قاچەکانی..سەری.. هەرهەموویانی لێ کردەوە، بەدەستی رەش‌و سوورەوە، بەورەی لەرزیوو تۆقیوەوە کوڕە بێ گوناهەکەی دابەشکرد بەسەر گونیەکاندا..!

ماڵەکەیان نزیك جادە شەستییەکە بوو، بەچەند جارێك گونیەکانی بردە دەرو بەرەو چۆڵاییەکەی بردن، لەدوورەوە سەگە هارەکان بەوەڕین پێشوازییان لێ دەکرد، ئەمیش کەلێیان نزیك دەبوەوە دیاریی دەستی پێشکەش دەکردن‌و دەیخستە بەردەمیان، نەیویست لەهەموو زەوی خوادا ئەو مرۆڤە قەبرێکی پێ ببرێت! هەر بۆیە دەرخواردی سەگی هاری دا !!

مەبەستی بوو بەم کارەی زامێکی هەمیشەیی بەدڵی دایك‌و براکانیدا بچزێ، کەلە تێکچوون‌و مردنەکەی کاریگەرتر بێ.. ویستی نیشانەیەکی دیکە بنێ بەتەوێڵی تاوانەکانی (سلێمانی)یەوە کەهەرگیز سڕینەوەی بۆ نەبێت...!!

## گومانلێکراو کێ بوو ؟

کەسێك کەگومانی کوشتنی ئاسۆو پارچە پارچەکردنی خرابووە پاڵ، تەنیا (باوك)ی خۆی بوو.. ئەو پیاوەی بەناوی چاودێری کردنیەوە لەنزیکییەوە دەخەوت! ئەو پیاوەی ساڵی (٨٨)ئاسۆی خوێندکاری ژێری بەلێدانێکی خراپ تێکدابوو!کاتێ دایکی ئاسۆ شکاتی لێ کرد گرتیان، رۆژی١٩٩٥/٢/٢٥لەلێکۆڵینەوەدا دایکی ئاسۆ بەپۆلیسی وت:

–مێردەکەم کوڕی ناوەنجیمی شێت کرد، دوای ئەوە بەدرێژایی سێ ساڵ بەهۆی هەر شتێکەوە بووایە بەبێ هۆ جنێوی پێ دەداو لێی دەدا، کوڕەکەی من تەنیا پێنج رۆژ ماڵەکەمانی جێهێشت، کەپارەی لێ بڕابوو گەڕایەوە نێومان، ئەو شەوەی تاوانەکەی دەرهەق کرابوو من ئاگادار نەبووم، بەڵام کوڕە بچووکەکەم باوکی بەشپرزەیی دیبوو..

دواتر غەفووری زاواشم گێڕایەوەو وتی(جارێکیان مێردەکەت داوای چەکی لێ کردووم بۆ کوشتنی ئاسۆو نەمداوەتێ)..

هەر دایکی ئاسۆ رۆژی دادگایی کردن(١٩٩٥/٦/٢٤)وتی:

–ئەو بەیانییە لەخەو هەڵساین، ئاسۆ لەجێگاکەیدا نەمابوو، باوکی وتی سەعاتێ لەمەوبەر هەڵساو خۆی گۆڕیو داوای پارەی کردو وتی دەڕۆم بۆ ئێران..

دوای ماوەیەك چاوەڕوانیو گومانی خۆمان، باوکی ئاسۆ لەلای من دانی بەتاوانەکەیدا ناو وتی:

-خۆم کوشتمو کردم بەژێر گڵەوە.. ئەم نهێنییە نەدرکێنی، ئەگینا تۆش وا لێ دەکەم.. ژنەکە رزگارمان بوو لێی..

لەترسی ئەو نەمدەوێرا بەسەرهاتی ژیانو مەرگی کوڕەکەم باس بکەم، بەڵام ئێستا، دوای چوار ساڵ غەمو گریان ئەوە ئاشکرا دەکەمو داوا لەدادگا دەکەم سزای تاوانبار بدات..

هەر رۆژی دادگایی کردن، غەفووری ئاوەڵزاوای تاوانبار وتی:

-لە کۆتایی ١٩٩٤دا جارێکیان لەگەڵ ژنەکەی کەدەکاتە خوشکی ژنەکەی من شەڕی بوو بوو، پێم وت هۆی ناخۆشی ئێوە دیارە نەمانو بێ سەروشوێنیی ئاسۆیە، ئەویش دانی پێداناو وتی خۆم کوشتوومەو شوێنەونم کردووە !

باوکە تاوانکارەکەش وتی:

-کوڕەکەی من مێشکی تەواو نەبوو، زۆر جار دەمبردە بەغداو پارەی زۆرم تیا خەرج دەکرد، دەرزی (مودی کیت) باشترین چارەسەر بوو بۆی، بەڵام لەشەڕی کوەیتدا ئەو دەرزیەش نەماو حاڵی بەجارێ پەرێشان بوو، ئاسۆ بەرامبەر بەخۆمانو خەڵکی گەڕەكو رێبواران رەفتاری خراپی دەنواند.. هەموو جارێ هەڕەشەی کوشتنی لێ دەکردین، تەنانەت رۆژێکیان قاچی منداڵێکی شکاندو ئابڕووی بردین، ترسام یەکێکیش بکوژێت. ئەوە بوو شەوی ١٩٩١/٦/١٠لە سەعات دوانزەو بیست دەقیقەدا لەناوم برد.. من هەرگیز تاوانم نەکردووە، بەڵام باری شێواوی ئاسۆ ئەو تاوانەی پێ کردم..

هەرچەندە لەباسی چارەسەری کوڕەدا باوکی وای وت، بەڵام پزیشکی دەروونناس روونیکردەوە کەلەو کاتەشدا ئەودەرزیە لەبازاڕدا هەبووە.

## لەكونجی زیندانەوە..

باوكی ئاسۆ.. یان بكوژی كوڕی خۆی بڕیاری زیندانی كردنی بۆ ماوەی (١٥)ساڵ بەسەردا درا، دەشێ لەگەڵ تەواو بوونی حوكمەكەیدا كۆتایی بەژیانیشی بێت، مەرگەساتی ئەم پیاوە لەوەدایە بە زۆر دیمەن، بەزۆر قسە، بەزۆر دەنگ، بەزۆر تارمایی، بەزۆر پرسیار،بەزۆر لەگەڵ خۆدا دوان، یان بیركردنەوەی تەنیایی..بەزۆر سەردانی خزمان.. یەك شت رووبەری مێشك و بیركردنەوەی داگیر دەكەن..

ئەویش:

بەتەنیا ئاسۆو..

مەرگی ئاسۆو..

ئەو شەوە نەگریسەی كەئاسۆ دەر خواردی سەگە هارەكان درا...

ئـەو ژوورەی تـەرخان کرابـوو بـۆ زینـدانی کردنـی ژنـان تـەنیا دوو تاوانکاری تیا بوو.. یەکیان ژنێکی تەمەن مام ناوەندیو ئەوی دیکەیان جوانێکی ٢٧ سالْ، بەلاّم بەدبەختو شیرزەو چارەڕەش..

گەرمای دوا رۆژەکانی مانگی ئاب هەردوو ژنەی سەغلەت کردبوو، (نازە) دەروونیشی ئاگر بوو وجۆشی دەدا..

سـبەی (١٩٩٨/٨/٣١)ەو نـازە دەبرێتـە دادگـاو دەخرێتـە قەفـەزی تاوانبارییەوە...

شـەو درەنـگ بـوو... ژنـەی زینـدانی دلْنـەوایی نـازەی دەکـردو.. بـەلاّم سوودی نەبوو..

ژنە پێی وت:

-کچەکەم، گوێی مەدەرێو کاری خوایە، ئەوە لەناوچەوانت نووسراوە، بەس نییە نەبوویتە هۆی کوشتنی، یان بریندارکردنی...ئەوسا وەکو منی کلْـۆلْ حـوکم دەدرایـتو ئـەم ژوورە تـەنگو تـارە دەبـووە مـالّی چـەندین سالْت...بەس نییە ئەوە نەقەوماو کەسوکاری ئەو وخۆتو هەموو خەلْکی هەزارو یەك قسەت پیّ بلْێن..!

نـازە ویـستی گلۆلْـەی خەمـەکانی بـۆ هـاوڕێی زینـدانی بکاتـەوەو حـەزی دەکرد تۆماری دەروونی بخاتە روو ودەرگای رازو نهێنییەکانی والأبکات...

هەلْـساو پارچـەیەك سـەهۆلّی خـستە ناوسـوراحیەکە... راکـشانی ژنـە ئیستێکی پێکردو خەریك بوو لەمەبەستەکەی پاشگەز بکاتەوە، ژنە هەستی پێکرد..

لەسەرخۆ وتی:

-نـازە گیـان، نـانووم پـشتم دێـشیّو تـەنیا رادەکـشێم... دەوەرە ئاوەکـە بهێنـەو بـۆمی بـاس کـە... وەرە بـزانم چـی لـەو تـەختی ناوچـەوانە رەشـەت

نووسراوه... وەرەو بۆمی بگێڕەوه، بابزانم کلۆڵ نەبیت ئەو تەمەنەی تۆ هی ئەوەیە سێ شوو ببینێ..!

-سێ بەڵێ سێ شوو، بەڵام لەسایەی هیچیاندا نەحەسامەوه..!

ژنە پەرداخەکەی لێ وەرگرت و بەدڵدانەوەوە پێی وت:

-بەقوربانت بم، بەختت وایکرد، گوێی مەدەرێ، خوا یەکەو قاپی هەزار... دەی کچەکەم خۆت قسەم بۆ بکە... دەی کچە جوانەکەم... دەی...

## سۆران سەرچاوەی گرفتەکانی ژیانم بوو..!

نازە لەتەنیشتییەوە ئۆقرەی گرت و کەمێ دەستی بەسەرو قژە خاوەکەیدا هێنا... لەگەڵ دەربڕینی یەکەم رستەدا فرمێسک رژایە چاوەکانی و بەسەر گۆنایدا جۆگەیان بەست..

-ناوم نازەیەو هەرگیز کەسێ نازی نەکێشاوم.. نەباوك، نەمێرد، نەهیچ کەسێك..

ئەوەی وت و دایە قوڵپی گریان...

ژنە راست بووەوەو دەستی گرت، بەسەرزەنشتەوە پێی وت:

بەو خوایەی نسیبی هەردووکمانی هێناوەتە ئێرە، گەروا بکەیت لێت عاجز دەبم... چی قەوماوه، هەتیوێك تەڵاقی داویت و ویستوتە رقی خۆتی پێ بڕێژیت... چی قەوماوه، خۆ تنۆکێ خوێن لەلووتی نەهاتووە..کچم بۆ وادەکەیت، خوا بەو سەرەوە ئاگادارە دڵم پێم دەڵێ تووشی هیچ نابیت و دەگەڕێیتەوە نێو کەسوکارت...

-باجی گیان، ناهەقم نییەو لێم مەگرە...زۆر منداڵ بووم، هێشتا راست و چەپی خۆمم نەدەزانی، ئەوەی بەبیرمدا نەدەهات شووکردن بوو، دەمویست بخوێنم، بەبینینی مامۆستا دڵ و دەروونم دەگەشایەوه، بەڵام بەختەکەم نەیکرد و زوو دایکم مرد... حەزم دەکرد بەنازی دایکی خۆم پەروەردەبم و

وەك كچانی هاوڕێم لەسێبەری دایكمدا گەورەببم، ئەو چووە جێی خۆی‌و باوكم هەر زوو ژنی هێنایەوەو باوەژن هاتە نێومالْمان...

–باشە چۆن بوو لەگەڵ تۆدا، باوەجووكەی باوەژن بەزەیی لەدلْدا بووە...

لەسەرخۆ وەلامی دایەوە:

–ئەوەندە لەگەلْیا نەژیام.. باوكم لەگەڵ خۆی بردی‌و چوونە ئێران‌و نەگەڕانەوە، ئیتر بەینێ تەنیا و بەینێ لەسەر مالْە پوورو كەسوكار بووم.. بەلام بەر لەرۆیشتنی باوكم بڕیاری دا بمدا بەشوو... وتی باتەنیا نەبیت...

وەك دلْی باتەوە، ژنە پێی وت:

–ئێ باشی كرد، ئەوە كەی بوو؟

–سالْی (٨٦) بوو، تەمەنم تەنیا پانزە سالْ بوو...

–بەكێت كرد؟ باشە دلْت پێوە بوو...ئەی دەتناسی؟

–نەوەلْلا نەدلْم پێوەی بوو نەلەوەوبەر چارەیم دیبوو، بڕوا بكە كەباوكم وتی دەتدەمە ئەو كوڕە وەك لەسەربانێكەوە فڕێم بدەنە خوارەوە وەهابوو... جابالێتی نەشارمەوە... بادرۆت لەگەڵ نەكەم، ئێمە مالْەكەمان لەكەنار شاربوو، ئەو سالْە بەهارێكی خۆش بوو، كوڕانی گەڕەك بۆ سەعی كردن دەهاتنە دەشتەكەی بەرامبەر بەمالْی خۆمان، یەك لەوان سۆران بوو، سۆران دراوسێمان بوو، بەلام هەرگیز قسەم لەگەڵ نەكردبوو... هاوڕێ كچەكانم هەموو جار دەیانووت چەند كوڕێكی جوانە... هەروەها دەیانووت زیرەكیشە، ئەها هەموو رۆژ سەعی دەكات...

–دیارە شەیتان تۆش سەرنجت داوەتێ‌و دلْت پیایدا چووە...

–نەبەو خوا گەورەیە، منی دایك مردووی كۆستكەوتوو ئەوانەم نەدەزانی... بەلام رۆژێكیان خۆی گرتمی‌و قسەی لەگەڵ كردم... جارێكی تریش لەپاسەكەدا هاتە لامەوەو دوای ئەوەی بەگەرمی چاك‌و چۆنی لەگەڵ كردم نامەیەكی پێچراوەی دامێ... لەشەرمدا نەمدەزانی چی بلْێم‌و...

نامەکەم شاردەوە، دواتر خوێندمەوە. چەند جارێك خوێندمەوە، سۆران نامەی خۆشەویستیو دڵداری بۆ نووسیبووم... ئیدی منیش رازی بووم... نەمزانی، نەمزانی سۆران دەبێتە سەرچاوەی هەموو گرفتێكو ژیانم لێ تێکدەدات!

## شووی یەکەمم چوار ساڵ تەمەنی بوو..!

نازە روانییە سەعاتەکەی دەستی... دەیویست سەربوردەی ژیانی بەدرێژی بگێڕێتەوە، بەتایبەت لەوەوبەر کەسێکی وای شك نەبردبوو بەوردی گوێ بۆ رازەکانی شل بکات...

-باجی گیان، وەك وتم تەمەنم ١٥ ساڵ بوو درام بەشوو، مێردەکەم کەسێك بوو کەتا ئەو رۆژەی لێی جیابوومەوە روویەکی خۆشی پێ نەدام، ژیانی ژنو مێردیمان تەنیا چوار ساڵی بڕکرد، کوڕێکم لێی بوو بوو، ئەو کوڕە بۆ من هەموو شتێك و هەموو کەسێکم بوو، دەمویست گەورەی کەمو وەك خۆم دەمەوێ پێی بگەیەنم... بەڵام ژیانی ماڵە مێرد تەنیا چوار ساڵی خایاندو لە ٨٩ دا تەڵاق درام، ئەو بێ ویژدانە هەرگیز گوێی لێ نەگرتمو تەڵاقی دامو سوێی گەورەی چزاند بەدڵو دەروونمدا..

-بۆ چی تەڵاقی دایت؟

-بیستبووی کەدڵم بەسۆرانەوە بووە... ئیتر دڵی لێم پیس بوو. قەت نەمدی قسەیەکی خۆشم لەگەڵ بکات... هەموو جارێ دەیووت تۆ بێکەس بوویت... تۆ حەزت لەخەڵکی کردووەو بەژنی من نابیت...

ئەوە بوو قسەی خۆیشی بردەسەر...!

-ئەی کوڕەکە، کوڕەکە چی بەسەرهات؟

-هەموو خۆشییەکم هەر ئەو منداڵە بوو، نەمدایەو لای خۆم هێشتمەوە. ئیتر بەنەبوونیو هەزار دەردەسەریی دەمگوزەراند... جا وەرە

لـــــەشارێکی واداو کچێك بەگەنجی و بەمنداڵێکەوە لێی بقەومێ...نسیب ڕێکی خستو دوای دووساڵ کوڕێکی تر هاتە داخوازیمو شووم پێ کرد، لەویش کچێکم بوو، دووبارە سۆرانی دوابڕاو هاتەوە ژیانمانەوەو لێم نەگەڕا، تەنانەت خۆی بەمێردەکەمی وتبوو کەدڵمان بەیەکەوە بووە، پێشی وتبوو کەهەرگیزاو هەرگیز دەستم لێ هەڵناگرێو بۆ من دەژی!

—ئەی دواتر؟

—دواتر ئاژاوە کەوتە نێوانمانەوە، باوکی کچەکەم پیاوێکی پولەکیو پارەپەرست بوو، سۆران ئەوەشی دەزانی، چوو بووە لایو وتبووی تەلاقی بدەو من دەیهێنم... هەروەها وتبووی عەیبە ژنێکت هەبێت پەیوەندی دڵداری لەگەڵ کەسێکی تردا هەبووبێت... ئیتر بە(٥) هەزار دینار ڕازی کردبوو و بەتەلاقدانی دام... تەلاقی دامو کچەکەی بردە لای خۆی..

—باشە سۆران نەهاتە داخوازیت؟

—بەڵێ هات... من ئەو کاتە دڵم بڵێسەی ئاگر بوو بۆ کچە سێ ساڵەکەم... دڵشکاوو دووچار بەخت سووتاو...هەرچەندە دەمزانی هۆکاری مەینەتی من سۆران بوو، دەمزانی هەر ئەو ئاگری لەخەرمانی ماڵم بەرداوە... بەڵام کەسێکی بێکەسو بێ دڵسۆز چی بکات... ناچاربووم شووی پێ بکەم... بەڵێ ساڵی (٩٥) هێنامیو گواستمیەوە...!

ئەو شەوە شەوێکی بێ کۆتایی بوو، درێژ بوو وەك بەسەرهاتی ژیانی نازە...درێژ بوو وەك خەمەکانی نازە...

ئەو شەوە هەردوو میوانی زیندان خەو لەچاویان نەکەوت، تابەرەبەیان نازە سەربوردەی ژیانی تاڵی خۆی گێرایەوەو ژنەش دڵنەوایی دەکرد... ئەو شەوە نازە پاشماوەی ژیانی ڕەشی خۆی بۆ ژنە گێرایەوە... بەیانی، کاتێ دەوام دەستی پێ کرد، پۆلیس بانگی نازەی کردو پێی وت:

—خۆت ئامادەکە... تۆزێکی تر دەتبەینە دادگا...

## بەزەیی دادگا...

نازە کە هێنرایەوە هۆڵی دادگا هەموو گیانی وەك شۆرەبی بەر (با)یەکی توند دەلەرزی... نەیدەزانی تەماشای کێ بکات و لەکێ بڕوانێ..دوای دەست پێکردنی دادگایی کردن و ڕێگەدان بەپارێزەر، زۆر لەسەرخۆ پارێزەری داکۆکیەکەر لە(نازە) بەدادگای بەرێزی وت:

–لەبەر ئەوەی ئەم ئافرەتە بەستەزمانە لەژیانیدا نەبووەتە خاوەنی مێردێکی ئەوتۆ لەسایەی سێبەریدا بحەسێتەوە، هەروەها بەهۆی ئەو بارە نالەبارەوە کەنازە دوای تەلاق دان دووچاری بووەو دوای ئەوەی بەجارێ هەژاری و بێکەسی پێکەوە شالاویان بۆ هێناوە...تووشی بارێکی دەروونیی گرژو ئالۆزو وروژاو بووە، تووشی سەخت ترین ژیان بووە...

هەر بۆیە داوا لەبەرێزتان دەکەم بەرامبەر ئەو هەوڵی تاوانکردنە بیبەخشن، تکا لەبەرێزتان دەکەم بەچاوی بەزەییەوە بڕواننە ئەم مرۆڤەو کێشەکەی، هەرچۆن هەمیشە کۆمەڵ و تاکەکانی کۆمەڵ،بەژن و پیاوەوە مەبەستی دادگا و دادوەرییە...

## داوای سزادانی نازە دەکەم...

سۆران بەگرژی دەیڕوانییە نازە... بەڵام ئەو هەر سەرنجی پارێزەرەکەی دەدا کەوەك برایەکی دڵسۆزی قسەی بۆ کرد... کەدادگا ڕێگای دا بەسۆرانی شکاتکەر بدوێت و هەر کەهاتە پێشەوە، دەنگی سۆران وەك زەنگێك لەگوێی نازەدا زرنگایەوە...سۆرانی تەمەن ۳۰ ساڵی کاسبکار وتی:

–تەنیا ساڵێك و چەند مانگێك ژنم بوو، کوڕێکمان بوو، لەکۆتایی (۹٦)دا گرفت کەوتە نێوانمانەوە، ئەوە بوو ئیتر تەلاقم داو لەیەکتر جیابووینە... دیارە دەزانن بەرلەوەی من بیهێنم لەدوو شووی دیکەدا ناکام بووەو کەس لەگەڵیا گوزەرانی نەکردووە... ماوەیەك دوای جیابوونەوەمان هاتە

دوکانەکەم... بەراستی سەیرم لێهات، بۆ چی هاتووەو چی لەمن دەوێ؟.. وتی بۆ نەخۆشی دەچمە بەغداو پێویستم بەیارمەتی تۆیە، منیش هەر لەوێدا دوو هەزار دینارم دایە. چی بکەم، من بەزەییم پیایدا هاتەوە، چوزانم ئەو دەیەوێ بمکوژێ!!

ئەوە بوو چوو بوو پارەکەی دابوو بەدەمانچەیەکی کەنەدی بچووکی جۆری ٧ملم، بەخۆیو دەمانچەکەیەوە چوو بووە لای فەرهادی کۆنە دراوسێیان، تکای لێکردبوو کەمنی بۆ بکوژێ، من نەفەرهادم دیوەو نەدەیناسم، بەڵام ماڵی ئاوا بێ ئەو تاوانەی نەکردو خەبەری دابوو... ئیتر ئەوە بوونازە گیراو منیش ئەمڕۆ داواکارم بەسزای توندی خۆی بگات...

*دوای قسەکانی سۆران، دادگا وەك شایەت پرسیاری لەفەرهاد کردو ئەویش راستو دروستی مەسەلەکەی بۆ گێڕانەوەو وتی:

-بەڵێ من چوومە لای بەرێوەبەری پۆلیسو هەواڵمدایەو دەمانچەکەشم دایە دەستی... بەڵام نازە داوای کوشتنی سۆرانی نەکرد، بەڵکو وتی قاچیم بۆ بشکێنەو حەزدەکەم بەزەلیلی ببینم...

*دادگاش سوپاسی فەرهادی کرد...

## نەمزانی هەوری خۆشەویستیمان بارانی رقی لێ دەبارێ...

بەشەرمەوە نازە قسەی بۆ دادگا کرد... جار جارەش تەماشای پارێزەرەکەی دەکرد، وەك ئەوەی پێی بڵێ(ئەی وانییە...تو خوا دەتۆ قسەبکە...)

نازە وتی:

- سۆران سەرچاوەی مەینەتی ژیانی من بوو، سۆران هۆکاری ئەم چارەنووسە رەشەی من بوو. نەیهێشت لەسایەی دوو مێرددا بحەسێمەوەو دووجار ماڵو خێزانی لێ تێك دام...

ئەو بەبێ ڕەزامەندی کەسوکاری خۆی منی هێنا، تەنانەت نەیهێنامە دادگاو لەدەرەوە لای مەلایەك مارەی بڕیم... ئەوە بوو تەڵاقیشی دامو کوڕەکەشی لێ سەندم...

لەئەنجامی ئەو هەموو کوێرەوەرییەدا، شەیتان هاتە مێشکمەوەو ویستم تۆڵەی خۆمی لێبکەمەوەو برینداری بکەم، ئەوە بوو تەلەفزیۆنەکەم فرۆشتو دەمانچەکەم کڕی...

بەڵام بڕوام پێ بکەن ئێستا بەختەوەرم کەئەو کارە سەری نەگرتو ناخۆشی ئەوم ناوێ...با هەر خوا هەقی منی لێ بکاتەوە...من تاوانبارنیم...بەڵام سەرم لێشێواوە...کەسێکیش سەری لێ بشێوێ نازانێ چی بکات...نازانێ....نا..

## نازە ناچێتەوە زیندان...

دوای هەموو ئەو قسانە، بێدەنگی باڵی بەسەر هۆڵە گەورەکەدا کێشا، نازە دەیڕوانییە پارێزەرەکەو جارجارە سەیرێکی دادوەرەکانیشی دەکرد...

بینی ئەوەی ناوەڕاستیان جارێك بەهێواشی قسەی لەگەڵ ئەوی لای ڕاستو جارێك لەگەڵ ئەوی لای چەپدا کرد...

هەموو گیانی بووە هەستو هەستی بووە گوێ گرتن...

مێشکی بەجارێ وروژابوو... ئۆقرەی لێ بڕابوو... زەردەخەنەی پارێزەری بەرامبەر ئاهێکی بەگیانی دا هێنایەوە...

دەنگی سەرۆکی دادگا کۆتایی بەو بێ دەنگییە هێناو.. ئەو وتی:

–بڕیارماندا بەزیندانی کردنی نازە بۆ ماوەی یەك ساڵ. بەڵام بەلەبەرچاوگرتنی تەمەنی منداڵیو چۆنێتی کێشەکەی و لەبەرئەوەی لەوەوبەر هیچ جۆرە شکاتێکی لێنەکراوەو تاوانی لەئەستۆدانییە. بەو بڕوایەوە کەجارێکی تر ئەم ژنە بیر لەهەوڵدانی هیچ تاوانێك ناکاتەوە، هەروەها لەبەر ئەوەی دایکەو ژیان تائێستا یارمەتی نەداودو ڕێکەوتی

ئاسـودەیی بـۆ نەرەخـساوە، ئـەم بڕیـارە جێبـەجێ نـاکرێو ناخرێتـە زیندانەوە...

بەمەرجێ پەیمان بدات جارێکی تر هیچ ئاژاوەیەك بۆ خۆیو کەسانی تر نەنێتەوە...

## گەڕانەوەی زەردەخەنە..

دەروونـی خامۆشـی نـازە خرۆشـاو زەردەخەنـە چـووە سـەرلێوە وشـکەکانی...هێـشتا دادوەران نەچـووبوونە دەرەوە خـۆی گەیانـدە پارێزەرەکەو بەگەرمی سوپاسی کرد... وتی:

–تـۆ لـەبراو بـاوکم فـەرزتری خـوا دەسـت بەباڵتـەوە بگـرێو ناخۆشـی نەبینی...نازانم چۆن سوپاست بکەم...

ئەویش بەپێکەنینەوە پێی وت:

–دادەگیـان، گوێمـەدەرێ، کۆمـەڵی ئێمـە هـەموو شـتێکی تیـا روودەدات، هیوادارم لەمەودوا بەختەوەربیت...

هۆڵەکە چۆڵ بوو، ئەوەی لـەو ساتەدا بـەبیری نـازەدا هات بڕیارێـك بـوو، بڕیـاری کڕینـی هەنـدێ میـوە تابـچێتەوە سـەردانی هاورێکـەی زینـدانیو بەسەرهاتی دادگایی کردنەکەی خۆی بۆ بگێڕێتەوە...

لەگەرمەی زەماوەندی بەیەکگەیشتنیاندا، کەدەنگی دەهۆڵ و زوڕنا تێکەڵ بەدەنگی کچان و کوڕانی نێو هەڵپەڕکێ ببوو، ئازادی زاوا مەلی خەیاڵی بۆ چوار ساڵ لەمەوبەر هەڵفڕیبوو، ئەو ڕۆژەی هاتەوە یاد، کەلەیەکەم ژوانی بەیەکگەیشتندا بەڵێنی بەشاگوڵی خۆشەویستی دا، کەبەهەر نرخێك بێت، دەیکات بەهاوسەری ژیانی خۆی، ئەگەرنا ئەو خۆشەویستییە لەگەڵ خۆیدا دەباتە ژێر گڵەوە، ئەو کەوتبووە دەریای بیرکردنەوە، ئەو کەچوار ساڵە بۆتە هاوڕێ و هاودەمی ئەو عەشقە، بەڵام دوابیرکردنەوەی، کەدواوێستگەی خەمەکانی ئەو چوار ساڵەی بوو، فرمێسکی گەرمی بەختەوەری دەڕژاندە سەر ڕوومەتەکانی، کاتێك ئاوڕی دایەوە لە(شاگوڵ)ی خۆشەویستی کە تارای بوکێنی پۆشیوە و لەتەکیدا دانیشتووە، وایدەزانی ئیتر تەواو هەموو ئاوات و هیواکانی هاتۆتەدی.

## وێستگەکانی خۆشەویستی و بەختەوەری

ئەم پێگەیشتنە دەرگایەکی خۆشی و بەختەوەریی بەڕووی هەردووکیاندا کردەوە، بەجۆرێك ئاوێتەی خۆشەویستی یەکتربون، کەهەرگیز بیریان لەڕۆژانی ڕابردووش نەدەکردەوە، پێیانوابوو بەمجۆرە خۆشەویستییە، درێژە بەو ژیانە بەختەوەرییە دەدەن و تالەژیانیشدا بن دڵشاد دەبن و بەدڵنیاییەوە دەیانڕوانیە ئایندەو بەجۆرێك وەك ژن و مێردێکی گونجاو هەڵسوکەوتیان دەکرد، کەببوە جێگای سەرنجی هەموو ژن و مێردێکی گوندەکەیان، تائەو ڕادەیەی ئیرەییان بەم دوو هاوسەرە دەبرد و حەزیان دەکرد لاسایی ئەوان بکەنەوە. بەمجۆرە شەش مانگی سەرەتای بەهاوسەریبوونیان لەژێر چەتری بەختەوەریدا بەسەربرد، بەڵام ڕووداوێکی لەناکاو خۆی بۆئەم ژن و مێردە لەبۆسە نابوو، کەبەکۆتایی هاتنی ژیانیان و هەڵوەڕینی هیوا و ئاواتەکانیان تەواوبوو.

## ئاهەنگێک و مەرگی شاگوڵ

لەڕۆژێکی ناوەڕاستی وەرزی بەهاردابوو، ئازادو شاگوڵ بۆ زەماوەندی خزمێکی نزیکیان بانگهێشت کرابوون، دوای تەواوبوونی ئاهەنگەکە هەردووکیان بەدڵخۆشییەوە گەڕانەوەماڵەوە، بێئاگابوون لەوەی ئەهریمەنی شەڕو ئاشووب رایەڵی تێکهەڵچوونی نێوان خێزانەکەیانی کێشاوە، لەگەڵ گەیشتنیان بۆ ماڵەوە، ئازاد لەگەڵ باوکیدا بەگژیەکتردا چوونەوە، بەجۆرێك کەئارامی و دان بەخۆداگرتن کەوتە بەرتەوژمی رق و کینەو سەرەنجام ئازاد دەستی بۆ چەك بردو هەموو تووڕەیی و رێزو وەفاداریی خۆی بەرامبەر بەباوکی بەدەستڕێژێك هەڵڕشت، بەڵام باوکی لەم دەستڕێژە رزگاری بوو، لەجیاتی ئەو، چوار گوللەی وێڵ بەرجەستەی شاگوڵەکەی کەوت و بەدەمدا کەوتە سەرزەوییەکەو زامداری کرد، ئازاد لەترسی مەرگی خۆی و تۆڵەسەندنەوەی کەسوکاری خێزانەکەی راییکردو گوندەکەی بەجێهێشت.

## هەواڵی مەرگی شاگوڵ و گەڕانەوەی ئازاد

ئازاد ناچاربوو پشت لەگوندەکەی خۆیان بکات و لەگوندێکی سەرسنووری تورکیا بگیرسێتەوە، ئەم رووداوە بەجارێك ئۆقرەو ئارامی لەبەربڕیبوو، پەنجەی پەشیمانی خۆی دەگەست و داوای لێبووردنی لەشاگوڵی بەدبەختی هاوسەری دەکرد، رۆژانە لەو سەرە رێگایانەوە رێگای بەڕێبواران دەگرت، بۆئەوەی هەواڵێکی ئەو بزانێت، تادواجار پاش (١٥) رۆژ بەسەر رووداوەکەدا هەواڵی مەرگی شاگوڵی خێزانی پێگەیشت، لەگەڵ گەیشتنی هەواڵی مەرگی هاوسەرەکەی هەموو شتێك لەژیانیدا بوو بەپارچەیەك ئاگرو سەراپای جەستەی تێدا دەسووتا، سووتانێك کەدەبێت بەباڵای خۆیدا ببڕێت، لەبەر خۆیەوە بەو هەورازو نشێوەدا وەك شێت و سەرگەردانێك هاواری دەکردو دەیووت (گوڵەگیان دڵنیابە دەگەمەڵات و منیش وەك تۆ سەفەری ئەو رێگایە دەگرمەبەر).. هەرچۆنێك بوو خۆی

گەیانــدە گۆڕســتانی گوندەکــەیان و دوای ئــەوەی باوەشــی بەگۆڕەکــەی هاوسـەری جوانەمەرگیدا کـرد، فرمێسکەکانی بریتـی بـوون لەپەشـیمانی و داوای لێبوردن، بەڵام تازە دوای چی، کێ گوێ لەئازادێك دەگرێت، کەڕق و تــوڕەیی و بێبــەزەیی جڵــەوی هــۆش و بــیری لێــسەندو لانەیـــەکی پڕلەبەختـەوەریی دایـە بـەر گـڕی گوللـەو هـەموو واتـا جوانـەکانی ژیـانی بەدەسـتی خـۆی هەڵوەرانـدو خـۆی خـستە بەرنـەفرەتی داب ونــەریتی کوردەواری و بەلاوێکی سـەرکێش و هەڵگەڕاوە لەقودسـیەتی خێـزان، نـاوی بـووە وێـردی سـەرزمانی خـەڵکی شـارو گونـدەکانی ئـەم دەڤـەرە، ئـەو بیری کردەوە، کەتاکە ڕێگا بۆ دەربازبوون لـەژیانی داهاتووی هەڵبـژاردنی مەرگـە، پێیوابـوو مـەرگ تـەنیا چارەسـەرێکە دەتوانێـت بەیـەکجاری لـەم ژیانـەدا رزگـاری بکـات، بەرلـەوەی خـۆی بکوژێـت نامەیـەکی لـەدوای خۆیـدا بـۆ کەسوکاری بەجێهێشت و نووسیبوی (ئەوا منیش خۆم کوشت و جارێکی تر چاوم بەکەستان ناکەوێتەوە، داوای لێبوردن لەهەمووتان دەکەم، بەتایبەتی بـاوکم)، دوای نووسـینی ئـەم چـەند دێـڕە لەتـەك گۆڕەکـەی هـاوڕێی خۆشەویست و هاوسەریدا چەند گوللەیەکی بەجەستەی خۆیەوە نـاو خـۆی کوشـت، خـەڵکی گوندەکـەش بـەدەنگی فیـشەکەکان بـەئاگاهاتن، کاتێـك گەیـشتن جگەلەلاشـەیەکی ساردوسـڕو نامەیـەکی خوێنـاوی هیـچی تریـان نەبینی، هەرئەو رۆژە لاشەکەی ئازادیان لەتەنیشت گۆڕەکەی شاگوڵ بەخاك سپارد. ئێستا حەوت ساڵ بەسەر ئەو رووداوەدا تێدەپەڕێت، خەڵکی ئەو ناوچەیە لەهەرکارو راسپاردەیەکی رۆژنەیاندا ئەم وشەیەیان کردۆتە وێردی سەرزمان و دەڵێن ئاگاداربە جڵەوی بیرو هۆشت لەدەست نەدەیت.

دەشێ نزیکی تەمەنیان هێندە هۆگری یەکتری کردبن، یاخود خوێندن و خوێندنەوە کە بێجگە لە پەیوەندی خۆشك و برایەتی، رەگی قوڵی ئەو هاوڕێیەتیەی بەساتەکانی ژیانی(سامان و چرۆ)دا داکوتابێت.

سامان لەبیری روناکەوە دەیڕوانیە مەسەلەکان و چرۆش هەمیشە ئەو برا ژیرەی بە مامۆستای خۆی دەزانی..

پاش نیوەڕۆی رۆژێکی دوا دوای پاییزی گەڵا رێزان بوو،(با)یەکی سارد لەڕووی جووتە خوشك و برای دەداو وردە وردە لەگۆڕستانی گوندەکەیان نزیك دەبونەوە..چرۆ بەپرسیارێك براکەی راگرت..

-باشە گوناه نییە تاوانێکی ئاوا گەورە تەنیا بەچوار ساڵ زیندانی کردن کۆتایی پێبێت؟

سامان دەیڕوانیە گۆڕستانەکەی(کارێزە)و بەدڵیش لای قسەکانی خوشکەکەی بوو..

-دەڵێن دوێنێ جەمالی میرزاو پشتیوان مەحکەمە کراون، بەرامبەر کوشتنی(سەرگوڵ)و(قارەمان) هەریەکە چوار ساڵ دەچنە زیندانەوە..

-باشە سامان ئا ئەوە ڕەوایە؟! ئەوە کاری دادگایە..باشە لەم وڵاتەدا ئەم جۆرە کێشانە بەمەسەلەی ناموس و شەرەف و سڕینەوەی پەڵەی عارو ئالەو بابەتانە حساب دەکرێن.!

سامان ئیستێکی بۆکرد..چرۆش نزیکی راوەستا..بینی براکەی نوقمی بیرکردنەوە بووە..لێی گەڕا..پاش تاوێك بەپرسیارێك رایچڵەکاند..

- ئەوە لەکوێی؟ بیر لەچی ئەکەیتەوە؟!

– ئا لێرەدا بوو، ڕێك لەم شوێنەدابوو. ئێمە دە دوانزە کەسێك بووین لە خەڵکانی گوند..ئا بەو تەپۆڵکەیەدا هاتینە سەر لاشەکان..کە دەستمان دانێ هێشتا هەر گەرم بوون، هێشتا هەر خوێنیان لێدەهات..چرۆ گیان، تەواو ڕۆژەکەشم لەبیرە، پار ڕۆژی ٨/٥بوو. ڕۆژێکی یەکجار گەرم، دەوروبەری سەعات ٩ی سەر لەبەیانی هەر دوای تەقەکان بەماوەیەکی کورت گەیشتینە ئێرە، بینیمان سەرگوڵو قارەمان ڕۆحیان تیا نەماوە..لاشەکانیان نزیك یەکبوون، هەر دوو مەتریان نێوانبوو..

## لەمزگەوتەوە تاوانەکە ڕاگەیەنرا.!

ڕۆژی ٥/١٢/٢٠٠٠ چرۆ دەیویست چۆنیەتی تاوانەکەو هێنانەوەی لاشەی کوژراوەکان بزانێ، دەیویست براکەی هەموو شتێکی بۆ بگێڕێتەوە..ئەویش بەنیگەرانیەوە قسەی بۆ خوشکەکەی دەکرد..

–هێشتا لەماڵەوە بووم. گوێم لەدەنگی تەقەی کلاشینکۆف بوو، دەنگەکەی کەمێك دووربوو، دیاربوو لەدەرەوەی گوندەوەبوو. پاش ماوەی نیو سەعاتێك، لەماڵ هاتمەدەر، گوێم لەبڵندگۆی مزگەوت بوو کەوتەکارو بانگەوازی دووپات دەکردەوەو دەیووت(موسوڵمانان، ڕەحمەتی خواتان لێبێ دوو کوژراو لەخوار گوند کەوتونو بچنە سەریان، ڕەحمەتتان لێبێ وان لەسەر ڕێی گۆڕستان، بیانگەنێ و خوای گەورە پاداشتی چاکەتان دەداتەوە)..

ئەوەی بەو بانگەوازەی زانی کەوتینە ڕێ، بەدەم ڕۆیشتنەوە لەیەکتریمان دەپرسی ئاخۆ کێبن..لەسەر چی کوژرابن...کە گەیشتینە سەریان بینیمان

قارەمانی حاجی محەمەدو سەرگوڵی میرزا بوون. ئیتر هێنامانەوەو دەمەو نیوەڕۆ برانە نەخۆشخانەی سلێمانیو هەر ئەو ڕۆژە، بەرلەوەی بانگی شێوان بدات کفنو دفن کرانو نزیك یەکتر لەگۆڕستانەکدا نێژران.

چرۆ فرمێسك لەچاوی دەهاتو لەبراکەی پرسی:

– سامان گیان، باشە تەمەنیان چەند بوو؟

– تەمەنی قارەمان بیستو سێ ساڵو هی سەرگوڵ بیستو هەشت ساڵ.

## ئەو ڕۆژەی دڵیان بەیەکدا!

ڕۆژێکی بەهاری ئەو ساڵە لەزەرعاتەکەی خۆیان نزیك (خاڵخالان) سەرگوڵ خەریکی ئاودان بوو.. لەناکاوێکدا قارەمان پەیدابوو، زەویەکەی ماڵی حاجی محەمەدی باوکی قارەمان بەتەنیشت ئەوەی ئەمانەوە بوو.. گەلێك جار لەسەر زەرعات چاویان بەیەکتر کەوتبوو، بەڵام یەکەمجاربوو بەتەنیا دوور لەچاوی کەسوکار پێکەوە بدوێن..

– ماندوونەبیت جوانترین کەنیشکی ئاوایی..

– ماندوو نەبیت کاك قارەمان، چۆنیت باشیت..

– کاك، کاکی چی دڵەکەم، من شەیدای جوانی تۆمو بەم نزیکانە دێمە خوازبێنیت..

وشە لەگەرووی سەرگوڵدا خنکان، هیچی بۆ نەوترا، پڕی کرد بەهەندێ کەرەسەی خۆیداو گورج ئەو ناوەی بەجێهێشت.!

ئەو شەوە خەو لەچاوی نەکەوت، هەزارو یەك پرسیار بەخەیاڵیدا هات..

- تۆبڵێی بەڕاستی بێت؟

- باشە من پێنج ساڵ لەو گەورەترم.!

- خۆ جەماڵی برام بەوە بزانێت شلکوتی عومرم دەکات!

- خوایەگیان چیبکەم؟!

چەند جارێکیتر (قارەمان) ڕێی پێدەگرت، لەناو گوندو لەسەر زەرعات خۆی نیشان دەدا.. کارێکی کرد سەرگوڵی پاکتر لەپەڕەی گوڵ، سەرگوڵی خۆشەویستی نێو کەسوکارو دەرودراوسێ دڵی باتێ و خۆشیبوێت..

بەڵام، بەر لەوادەی خوازبێنی، ڕۆژێک چووەوەماڵیان و بەژوانی سەرگوڵەکەی شاد بوو.. بەڵام چۆن ژوانێک!

## دایکە.. خەتای ئەو بوو !

ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زەردو لاوازتر، بەڕەنگی پەڕیوەوە دەکەوتە بەرچاوی کەسوکارەکەی، سەرەتا دەترساو شەرمی دەکرد مەسەلەکە بەدایکی بڵێ، بەڵام لەترسی نهێنییەکەو لەترسی ئەوەی ناوسکی دیواری شەرمی ڕوخاندو پەتی ترسی قرتاندو بەدایکە دڵسۆزەکەی وت:

- دایکە گیان خەتای ئەو بوو، خوا بەو سەرەوە ئاگادارە ئەو هەڵیخەڵەتاندمو ئیشی خۆی کرد؟!

دایکی شپرزەی لێی پرسی:

- باشە سەرت لەقوڕنێیت چۆن هێناتە ماڵ؟، باشە باوانت شێوێ چۆن خۆت تەسلیم کرد!

– دایـە خـەتای مـن نـەبوو، هـەر دەیـووت دەتهێـنم، دەیـووت شـاییەك دەكـەین ئـەم كارێزەیـە بەخۆیـەوە نـەیبینیبێ.. چـوزانم، تووشـی غەفڵـەتی كردمو كاری خۆی كرد..

– باشە ئاگرت تێبەربێ چی لەوەی ناو سكت بكەم..

– نازانم، دایە گیان نازانم..

– بەو خوایە باوكتو جەماڵی برات بەمە بزانن دەتكوژن، نایەڵن رۆژێك لەژیاندا بمێنیت.. چی بكەم، سەربەگۆبەند نازانم چی بكەم.. نازانم..

بەیارمەتیو تەگبیری دایكی، كۆرپەكەی سەرگوڵ لەباربرا، بەڵام كێشەكە هەرمایـەوە، دایكـی بەناچـاری مەسـەلەكەی لای بـاوكی دركانـد.. ئـەویش جەماڵی لێ ئاگاداركرد.. جـەمال بـووە ئـاگر.. دەیانویـست هێوری بكەنـەوەو سوودی نەبوو، ئەو هەر كڵپەی دەسەند!

پەیوەنـدی كـرا بەكەسـوكاری قارەمانـەوە، بەتایبـەت بـەمامیو پـشتیوانی برایەوە، بەڵام بێ سوود بوو، قارەمان نەچووە ژێری سـەرگوڵ بخـوازێو ئـاو بكرێ بەئاگردا..

رۆژی ١٩٩٩/٨/٥، خزمـانی هـەردوولا كۆدەبنـەوە، دەیانـەوێ چارەسـەری ئەو گرفتە بكەنو بەوەش دایكو باوكی كلۆڵی سـەرگوڵو قارەمـان رزگاریـان بێ..

پـەڵی كـچەو قارەمانەكـەی دەگـرنو دەچـنە دەرەوەی گونـد.. لـەخوار گونـدەوە لـەنزیك گۆڕسـتانەكە لەمەسـەلەكە دەدوێـن، سـەرگوڵ بـەڕەنگی زەردەوە دەڕوانێتە قارەمان، ئەویش دوای پرسیارێكی پـشتیوانی بـرای زۆر بەبێباكی دەدوێو قارەمان پێیان دەڵێت:

– درۆدەکات، من هیچ پەیوەندیم نییە لەگەڵیدا، راست ناکاتو من نەچوومەتە جێ ژوانیو سکیم پڕنەکردووە، لەبەرئەوە نەدەچمە داوایو نەدەیهێنم..

– لەو ساتەدا سەرگوڵ دەیخواست پڕ بەدەنگی بەسەریا هاوار بکات "دەك رووت رەش بێ هەی درۆزنی بەدڕەفتار".. بەڵام ئەوی واق وڕماو هیچی بۆ نەدەوترا..

جەمالی میرزا کە تا ئەو کاتە بێدەنگ بوو لەناکاودا تفەنگەکەی لەشانی داگرتو میلی هێنایەوەو یەكو دووانو سیان.. فیشەکی نا بەسەرو سنگو باڵی چەپی خوشکەکەیەوە، مێشکی هاڕیو خوێن جۆگەلەی بەستو دەستبەجێ گیانی سپارد..

هەموو بێدەنگو حەپەساو، هەموو بێ رەنگو بێ جووڵە، تەنیا پشتیوان نەبێ، لوولەی تفەنگەکەی دەکاتە قارەمانو چەند فیشەکێ دەنێ بەناو سکییەوەو هەناوی هەنجن هەنجن دەکات.. ئەویش لەنزیك لاشەی سەرگوڵ دەکەوێو پاش جووڵەیەکی کەم بە بێگیانی سەری لار دەکاتەوە!

سامانو چرۆ بەدەم قسەگێڕانەوەوە دەگەنە ئاستی گۆڕەکان. چرۆ گۆنا تەڕەکانی دەسڕێو چاو دەبڕێتە قەبرەکەی (سەرگوڵ)و بەبراکەی دەڵێت:

– ئەم بەستەزمانە دووجار کوژرا، دووجار روحیانەتی بێگەردی بەبەهەشت شادبووە.. هەردووجارەکە پیاو کوشتی، جاری یەکەم قارەمانو جاری دووەمیش جەمالی برای..

سامان کەدەیڕوانییە خۆری ئاوابوو، لەسەرخۆ وتی:

– نەك هەر پیاوان. بەجارێ هەموو كۆمەڵ، جەهالەتی كۆمەڵ بكوژو تاوانبارە...

بەرلەوەی وەرچەرخێن و بەرەو گوند بگەڕێنەوە چرۆ وتی:

– ئەوان بەو جۆرە چارەسەری گرفتەكەیان كردو بەوشێوەیە ئاویان كرد بەئاگردا، ئەوە بڕیاری پیاوانی كارێزە بوو.. دە ئێمەش بڕیارمانداوە هەموو رۆژانی هەینی و هەموو جەژنێ بێین و چەپكەگوڵی خۆمان بخەینە سەرگۆڕی ئەم بەدبەختە..

– ئێوە.. ئێوە كێن؟

– كچان و ژنانی هاوسۆز لەگەڵ ژیان و مەرگی سەرگوڵی خێر لەخۆنەدیو، بەڵێ.. ئێمەی ژنانی بەشمەینەت..

-دەینووسم..چی لە دڵمدایە دەینووسم، هەموو جار دایکم دەیووت خودا چی لەو ناوچەوانە نووسیبێت دێتە دی..

هەروا بوو.. لە ناوچەوانم نووسرا بوو چارەڕەشی و بەدبەختی.. خۆشباوەڕی.. هەروایش بوو، ئاخر منێك كە تا ئامادەیشم تەواو كرد بەباشی راستوچەپی خۆمم نەدەزانی چۆن چارەنووسم دایە دەست زۆڵێكی بەدرەفتار؟.. چۆن باوەڕم بەكەسێك كرد كە بەدرۆ فەرهەنگی خۆشەویستیی بۆ هەڵدەڕشتم!

پاكیز بەدەم سڕینی فرمێسكەكانی سەر گۆنایەوە چاوی بە دێڕەكانی سەر پەڕە كاغەزەكەی بەردەمیدا گێڕایەوەو تینی دایە خۆی، هەروەك ئەوەی بۆ خەڵكێكی زۆر بدوێت، دەیویست دەروونی واڵا بكاتو بوێرانە بەگژ هەموو گەردووندا بچێتەوە..

-دەبوو بمزانیایە ئەم دنیایە گورگی زۆری تێدایە، بمزانیایە قسەی دایكم نەخشی بەردەو زەمانە فێری كردوە كە مرۆڤستان پڕ نییە لە فریشتە، بەڵكو كەسانی وایشی تێدایە وەك ئاژەڵی برسی قەستیانە پەڕو باڵی نێچیرەكانیان بكەنو بەجارێ گۆشتو ئێسقانیان بهاڕن.. دەبوو هەرچۆن لە حزوری براكاندا ئەوق دادەمام ئاواش لەو (خۆشەویستە) بترسامایەو بەجارێ چاوو دڵی خۆمم نەدایەتە دەستی، نەمهێشتایە دەستی چەپەڵی بگاتە دەستمو لە دیدارەكانی دیكەشدا هەموو جەستەم بكاتە كێڵگەی كێلانی حەزە بێئابڕووەكانی..

چاوەكانی پڕاوپڕ بوون لەرق.. پەڕەیەكی سپی خستە سەرەوەو بەر لەوەی دەستكاتەوە بەنووسین، چاوی خەیاڵی چووەوە بۆ ئەو رۆژەی خوێن بەجەستەی پاكیزەییدا هاتەخوارێ.. بەری چاوانی سوور هەڵگەڕا.. پاشان تاریك داهات..

–دەینووسم..چی لە دڵمدایە دەینووسم، هەموو جار دایکم دەیووت خودا چی لەو ناوچەوانە نووسیبێت دێتە دی..

هەروا بوو.. لە ناوچەوانم نووسرا بوو چارەڕەشی و بەدبەختی.. خۆشباوەڕی.. هەروایش بوو، ئاخر منێك كە تا ئامادەیشم تەواو كرد بەباشی راستوچەپی خۆمم نەدەزانی چۆن چارەنووسم دایە دەست زۆڵێكی بەدرەفتار؟.. چۆن باوەڕم بەكەسێك كرد كە بەدرۆ فەرهەنگی خۆشەویستیی بۆ هەڵدەڕشتم!

پاكیز بەدەم سڕینی فرمێسكەكانی سەر گۆنایەوە چاوی بە دێڕەكانی سەر پەڕە كاغەزەكەی بەردەمیدا گێڕایەوەو تینی دایە خۆی، هەروەك ئەوەی بۆ خەڵكێكی زۆر بدوێت، دەیویست دەروونی واڵا بكاتو بوێرانە بەگژ هەموو گەردووندا بچێتەوە..

–دەبوو بمزانیایە ئەم دنیایە گورگی زۆری تێدایە، بمزانیایە قسەی دایكم نەخشی بەردەو زەمانە فێری كردوە كە مرۆڤستان پڕ نییە لە فریشتە، بەڵكو كەسانی وایشی تێدایە وەك ئاژەڵی برسی قەستیانە پەڕو باڵی نێچیرەكانیان بكەنو بەجارێ گۆشتو ئێسقانیان بهاڕن.. دەبوو هەرچۆن لە حزوری براكاندا ئەوق دادەمام ئاواش لەو (خۆشەویستە) بترسامایەو بەجارێ چاوو دڵی خۆمم نەدایەتە دەستی، نەمهێشتایە دەستی چەپەڵی بگاتە دەستمو لە دیدارەكانی دیكەشدا هەموو جەستەم بكاتە كێڵگەی كێڵانی حەزە بێئابڕووەكانی..

چاوەكانی پڕاوپڕ بوون لەرق.. پەڕەیەكی سپی خستە سەرەوەو بەر لەوەی دەستكاتەوە بەنووسین، چاوی خەیاڵی چووەوە بۆ ئەو رۆژەی خوێن بەجەستەی پاكیزەییدا هاتەخوارێ.. بەری چاوانی سوور هەڵگەڕا.. پاشان تاریك داهات..

تروسکەیەك نەما تێی بڕوانێ.. فیلمە ترسناکەکەی هەمیشە دەیدیییەوە، لەگـەڵ خۆیـدا بردییـەوە بـۆ ئـەو ڕۆژە ڕەشـەی دوای کـاری نـەکردەی هاوڕێکەی، پڕ بەگەرووی دەیزریکاندو کەسێ نەبوو گوێیەك لەناڵەو هاواری بگرێت.. وەك زۆرجاری دیکە گەڕایەوە بۆ حەوشە بچووکەکەی منداڵی، بۆ لای دەنگە پڕ لەسۆزەکەی دایکی..

–لەسەرەتایی بووم، دەستم بدایە سەتڵێ ئاو، یان عەلادینێ، دایکم پڕ بەسینەی بانگی دەکردم "داینێ کچم.. داینێ پاکیز.. تۆ کچیتو دەست مەدەرە شتی قورس.. خراپە دایکم وامەکە..".. نەمدەزانی بۆ خراپە.. گەورەتر بوومو لە ناوەندیدا دەمویست بەر لە گەڕانەوەی برایان یارمەتی دایکم بدەمو لە ئێواراندا نوینەکان بۆ سەربان کێش کەم.. هەر کە چاوی بەو دیمەنە بکەوتایە دەیووت "کچی دایکت وامەکە.. تۆ منداڵو لاوازیت، لە کوێ دەتوانی دۆشەكو سەرین سەرخەیت.. داینێ کچم، خۆم دەیانبەم".. ڕووە شەرمنەکەم هەرگیز نەیدەهێشت کلیلی ئەم باسە بدەمە دەستی هاوڕێیەکی قوتابخانەم.. یان کچە پووره دەستە خوشکەکەم.. هەربۆیە ڕۆژێك بەدایکم خۆیم وت "دایە گەورەبوومو منداڵ نیم.. بۆ ناهێڵیت هاوکاریت بکەم".. دەمودەس هاتە وەڵامو وتی "نا کچی خۆم گەورە نیت.. ئەی نازانی کچانی عاقڵ دەبێ ئاگاداری خۆیان بن.. ئەی نازانی ئەوان وەك کوڕان بۆیان نییە دەستبدەنە شتی قورسو یاری بکەنو باز بدەن".. دواتر لەو دەنگە هێمنەوە زانیم کە ئێمەی ئافرەت تا تەواو گەورە دەبینو تا ئەو ساتەی شوو دەکەین دەبێ ئاگاداری کچێنی خۆمان بین..

بە قومە ئاوێك گەرووی وشکی تەڕکرد، لاپەڕەیەکی سپی دیکەی خستە بەردەستیو ویستی باسی ڕۆژانی دوای لێقەومان تۆمار بکات..

-ئەو نامەردە دەیویست ئیشی خۆی دووبارە بکاتەوە.. بەناوی چارەسەری پەردەی حەیای حورمەتمەوە شتێ پارەی نایە چنگم و ناونیشانی ژنە چارەسەرێکی دامێ.. پاش ئەوەی لەگەڵ پورزا هاوڕێکەی منداڵی و گەورەیم بە ترس و لەرزەوە گەیشتمە لای ژنەی فریادرەس، هەموو گیانم نیشتبووە سەر ئاو و زمانم چووبووە کلیلە.. دوای سەرزەنشتی ئەو و هەندێ بەزەیشی.. ئامۆژگاری کرام و بەڵێنی دامێ چارەسەرم بۆ بکات..

دەنگی پێی کەسێك دایچڵەکاند.. کاغەزەکانی هەندێك کۆکردەوە و شاردەوە... کەسەکە پیاوێکی فایل بەدەست بوو، هات و لە بەرپرسی ژوورەکەی پرسی، ئەمیش پێی وت" هەموویان چوونەتە پرسەو سەعاتێکی تر دێنەوە.."..ئەو رۆیشت و ئەمیش مێشکە جەنجاڵە وروژاوەکەی بردییەوە بۆ لای رۆژانێ کەزەنگی تەلەفۆن هەراسانی دەکرد.. بۆ لای پەیوەندییەکیان کە ئەو ناجوامێرە بەدەنگی پڕ لە هەڕەشەوە پێی وت" گەر نەیەیتە لام ئەوا بە کاکت دەڵێم چیم کردوەو چۆنیش بە پارەی من براویت بۆ چارەسەر".. دواتر زەنگی تەلەفۆنەکان لە مێشکیدا دەزرنگانەوە، ئەمیش جارێ بەقسەی نەرم پێی دەووت "خوا بناسە، ئاخر من شەرەفی خۆمم دایە دەستت.. کەمێ پیاو بە.. ئەی ناترسی ئەو خوا گەورەیە گەڕوگوڵ و رووت و رەجاڵت کا.."، جارێکی تریش پێی دەووت "بێغیرەت.. چی دەکەی بیکە لێت ناترسم.. شکاتت لێ دەکەم.. بەگرتنت دەدەم.. بەوخوایە گەر کوشتووشیانم بەبراکانمی دەڵێم.. ئەوسا دەزانم چیت لێ بەسەر دێنم..".. کەوتەوە نووسین..

-ئەمجارەشیان وەك هەموو جارەکانی دی، دادم بردەوە لای کەژاڵی پورزام.. من خوشکم نەبوو بەڵام ئەو لە خوشك دڵسۆز تربوو بۆم.. تەگبیرکەرم بوو.. کەژاڵ چرای رێگای دایە دەستم، کەژاڵ وتی" پاکیز

گیـان.. بـۆ سـاڵێك دەچــێ دامــەزراویو هەمیـشە هــەر مــەدحو ســەنای لێپرسراوی فەرمانگاکەتان دەکەیت.. بچۆرە لایو لەنووکەوە بۆی بگێڕەوە.. مەگــەر هــەر ئــەو لــە ئۆیــەی ئــەو گورگــە بێــت".. قــسەکەیم وەرگــرت.. دوامنەخــست.. رۆژی دوایــی بەروویــەکی پــڕ لەشــەرمەوە لــە دەرگــام داو فەرمووم لێ کرا.. گوێی لێ گرتمو لێی دەڕوانیم.. منیش زۆربەی کات چاوم دەبڕییەوە زەوییەکە.. نەمدەزانی کە بێدەنگ بووم سەرزەنشت دەکرێم.. یان چی.. شەرم هەموو گیانمی داگرتبوو..گوتی " بابیرێکی لێ بکەمەوە.. ئینجا قسە دەکەینــەوە.."، بەترســەوە وتم" رەنگــە ئیتر رێــزم نــەگریت.. یـان بــە چاوێك سەیرم بکەیت.. توخوا پێمی بڵــێ وا دڵم تــەقی.. بەو خوایە کەژاڵی پوورزام کە ئەوەندە باسی تۆم بۆ کردوە فێری کــردم بێم بۆلات.. توخـوا چی دەکرێت؟".. لەسەرخۆ کەوتە وەڵام، وەڵام هەنگوین بوو لەزاری دەباری" تۆ وەك خوشــکی خــۆم وایــت.. خــەمت نــەبێو لــەم وڵاتــەدا زۆرجــار شــتی وا روویــداوە.. بــەڵام باسەکە کتــوپڕی بــوو بــۆم.. دە لــێم گــەڕێ بــا بیرێکــی لێ بکەمەوەو بیدەرە دەست کاکی خــۆت.."، گەر فەرمانگە نەبووایــە لــە ئامێزم دەگــرتو تێرتێــر چاوەکانیم مــاچ دەکــرد.. رۆیــشتمو بــەخۆمم دەووت "لــەم مرۆڤستانەدا مرۆڤی ئاوایش هەیە.. ناهەقیان نییە کارمەندە کۆنەکان هێندە خۆشیان دەوێت.."..

چــووەوە ژوورەکــەو دوای کردنــەوەی چــەکمەجە، ویــستی کاغــەزەکانی دەربهێنــێو بنووســێت، بــەڵام تریقــەو گفتوگــۆی هاوڕێکــانی پەشــیمانی کردەوەو توند کلیلی دایەوە.. ئەوان هاتنەوەو ئەمیش دەستی کردەوە ملی بیرکردنەوەو خەیاڵەکانی..

بیری چووەوە بۆ ئەو رۆژەی تر کە لێپسراوە . براکەی تەلەفۆنەکەی لە دەســت وەرگــرتو بــە ئاخــافتنی تێکــەڵ لــە عــەقڵو تــووڕە بــوون ئامۆژگــاری

گورگەکـەی کـردو دواجـار پێـی وت " گـەر لـە قـسەم دەربـچیت خراپـت لێ بەسـەردێ.. مـن لـەجێی بـاوکو بـرای ئـەم کـچەمو بێیتـە رێـی، یـان تەلـەفۆن بکەیتەوە ئەوا بەرەو رووی یاسات دەکەینەوە.."..

پاکیز، بەهێمنییەکی ئاوێتە لە بڕواو خۆشحاڵییەوە هاتەوە ئێستای، بۆ ماوەیـەکی باشـە نەچـارەی تـاڵی ئـەوی دیوەتـەوەو نەگوێـشی لـە دەنگـی وەڕسکەری بووەتەوە..

هەڵـساو پـەردەی سـەر پەنجەرەکـەی لاداو چاوەگەشـەکانی بڕییـە ئاسمان..

٢٠١١/٧/٢٤

خوویەکی تازەت نییە، بەڵکو دەیان ساڵە بەدەم گەورەو بچووکەوە، بەدەم ناسیاو و نەناسیاوەوە. گوڵی زەردەخەنە دابەشدەکەیتو عەتری خۆشەویستیی دەبەشیتەوە.. تەنانەت ئەو زەمانەش کە لەسەر پەرۆشیت بۆ زمانی دایکتو بۆ مێژووەکەی باوکتو بۆ خوێنی بەناهەق رژاوی هاورێکانتو لەبەر داکۆکیت بۆ مانەوەی خۆتو نیشتمانەکەت، لە کار دوورخرایتەوەو نانبڕاوکرایتو بەسکێ تێرو بە دە برسی بوویت، ئەوساش رووە جوانەکەت نەشێواو پێدەچوو هەر لەساواییەوە، مانگی ئاسمانەکەی (سابڵاخ) لە تریفەی خۆی بەش دابیتو لەگەڵ راژەنینی لانکەکەتدا دەنگی (مامڵێ) بووبێتە قەتارو لایلایەت..

ئێستاش ناوبەناو، لەگەڵ خانمی سەلاردا، لەساختمانی یەکجار بەرزەوە، کاتێ باڵەکۆن بەسەر نیوە شەوی تارانی هێمنتر لە ساتەکانی دی دەڕوانێ، دەرگا لەرووی رازونیازتاندا والا دەبێ...

-خانم گیان..بۆ خۆت هاوڕێی رێگام بوویت.. کەهاتینە ئێرە، باری گرانی ژیان جەستەمی وەك درەختی بەردەم رەشەبا لێکردبوو، هەر ئەوە بوو نەدەمردم.. نان لەقورگی شێردا بوو.. ئەی تۆ، تۆی نازداری ماڵە باوان.. لەبیرتە لە ئازاری پێیەکانت خەو نەدەچووە چاوانت..

-ئەدی.. بەیانیان لە قوتابخانە بە پێوەو پاش نیوەڕوانیش تا درەنگان لە کلاسو وتنەوەی زمانی شیرین بۆ زارۆکی کوردزمانان..

-ئەی بەخێوکردنو گەورەکردنی سیان.. بەخودای ئەمانە هەر بەدەم خۆشنو هێنانەوە بەرچاویان ئەستەمە.. لێگەڕێ خانم لێگەڕێ، تا درێژەی بدەینێ وانیکی تەواو نابێ..

دەیان شەو، خەو، قسەو رازەکانتانی دادەپۆشی.. رۆژانی داهاتووش گەڵێ جار کلیلی باسو خواسی ترتان دەدایە دەستی یەکتر..

سالآنێکە تەمەن زۆربەی کاتەکانی لێ سەندوون و کردوونیە میوانی ماڵەوە.. مەگەر بۆ کارێ یەکجار پێویست لە ئەسانسۆرەوە سەر بکەن بە دەردا.. یان بۆ بەشداریی خۆشی و ناخۆشیی ئازیران..

لەماڵێ، لەسەر بەڕەی خۆماڵی و بە بەرگی کوردییەوە، جوانترین ساتەکانتان لەگەڵ دیتنی کەناڵە ئاسمانییە کوردییەکاندا دەبەنە سەر.. بەتایبەت ئەتۆی سیاسیی دێرین و قەڵەم بەبڕشت و بیرتیژ..

ئەو کاتانەی (خالقی) دەردەکەوێ و دەچریکێنێ، بەدەستی خۆت نییەو هەردووچاوت پڕاوپڕ دەبن لە فرمێسك.. یان کاتێ گوێت لە شیعرێکی (هێمن) دەبێ، وەختە لەگەڵیا بتوێیتەوە.. هەموو خەیاڵات دەچێتەوە بۆ ئەو رۆژگارانەی خەونی کۆمارەکەی کوردیان تیادا جوانەمەرگ کرد..

هەر کە(دۆست)ە دڵ لەلاکەیشت لە تەلەفۆنەوە پێت دەگات.. یادەوەرییەکی ئەم سالآنەی دواییت دەبێتە دیمەنی بەرچاوت و لەگەڵ ئەودا دەدوێیت و خەریکە ئاگات لێی نەمێنێ و بچیتەوە لای گفتوگۆی چەندین شەوو رۆژەتان..

لەسلێمانی بوو، کەمێ پەردەدەت لەسەر عەشقی جگەر گۆشەیەکت لادا.. ئەویش هەموو گیانی ببوونە گوێ..

-وەك سێ باڵندە بوون، هەر خۆم دەزانم چۆن هێلانەم بۆ درووستکردن و پاراستمن.. خۆیشیان ئاگادارن، هەرچەندە شۆخی لەگەڵ دایکیاندا دەکەن پێی دەڵێن" لەوە زیاتر چت دەوێ.. بۆ خەنی نابی، چەندە ماندووبوون وا بەتریقەی منداڵی ئێمە حەواونەتەوە.. ئیدی لەوە زیاتر چیتان لێمان دەوێ.. منداڵ دیاری خودایەو چاوانتان رۆشن"..

-خوا نەیانبڕێت.. دە بۆمی باسکە.. دیارە (هونەر) گیانیش لەسەر شایلۆغان و زەماوەندە.. دێم، دڵنیابە دێمە ئاهەنگی..

–ئاهەنگی چی.. من بۆ خۆیشم ناچم..!

–بڕوا ناکەم.. تۆ ڕۆحی خۆیشت داوە بەوان، مانای چی؟

–براکەم بەگوێمی نەکرد.. عەشقی عەجەم داویە لەکەللەی.. هەرچی دەڵێم ئاسنی سارد دەکوتم، هەرچەند دەکەم پێم قایل نابێ.. دەڵێ خودا یەکەو نابێتە دوو، منیش یان ئەو دولبەرەم دەخوازم، یان تاکو دنیا دنیایە وەکو خۆم بەتاکو تەنیا دەمێنم..

لەهەموو کەس باشتریش دەزانی هونەرەکەی تۆ، بۆخۆی دەریایەکە لە هونەر، ئاڵتوونە ئاڵتوون.. دەتزانی خۆشەویستی مرۆڤێک مێشکی داگیرکردوەو وەکو سیامەند پەیمانی بە خەجەکەی داوە بۆ یەکتر بن، یان بۆ گڵ، بەلام باوەڕی تۆ چون کێوێك بوو، چون بێستون بوو، زەحمەت بوو بەهیچ خوسرەوێك کون بکرێت.. مەگەر خودا بیڕەخساندایە..

دەموچاوە نورانی و بەخەندەکەت کەمێ شپرزە بوو.. لەولاشەوە قسەی خانمو هونەرەکەت و خوشك و برای، گوێی خانەخوێی خۆشەویستتانی پڕ کرد بوو..

ئەوان زۆریان دەوت و تۆیش کەمت دەبیست.. کە گرژ دەبوویت دەتووت "ماقووڵە من لەسەر خاك و زمانەکەم دەربەدەربووم و ئێستا ببمە خزمی نەیاران.. چیم پێ دەڵێن، خەڵکی چیم پێم دەڵێن؟"..

ساڵ تێپەڕی و ئەو دیوارە لەنێوان میهری تۆو جەرگەکەتدا دروستبووبوو.. نهێنی ئەم باسە لەگەڵ سروەی بەیاندا بەنێو کەسە نزیکەکاندا بڵاوبووەوە.. دۆستەکەی (سلێمانی)شت، کە هەمیشە سوێندت بە (پیرەمێردو گۆران)ەکەی دەخوارد، لەولاوە بوەستێ..

چەند ساڵێ لەمەوبەر، دۆست هاتەوە لاتان.. هەر لە ڕێوە قەسەمی بە (پێشەوا)ی مانگی کوردان خوارد، گەر ئەمجارە دڵشکاوی بکەیت ئەوا ئیدی

تاسەر لە زەردەخەنەکانت دەتۆریّ‌و نایبینیەوە.. قسەتان دامەزراند.. تکا لەو و لە خانمەکەی خۆت‌و لە چاوەگەشەکانی هونەرو بێ دەنگی‌و بێ رەنگی لە تۆش.. لەبیرتە دواجار ئاوا دوان..

– باشە پێمی بڵێ، ئا ئەوە کتێبەکەی (قاسملو) نییە هەمیشە لە ژوور سەرتە، ئەی خانمە دڵخوازەکەی ئەویش بییانی نەبوو، کەچی بووە چرای رێگای‌و ئێستاش بۆ یادەکانی ئەو دەژی..
دەپێمی بڵێ، تۆ پێنج فەرزە دەپارێیتەوە جگەر گۆشەکانت بپارێزرێن، بەڵام خۆت ئەمیان دڵشکاو دەکەیت..

لەقسەی چەند شەوو رۆژەتاندا، تروسکەیەك لە چاوانتەوە دەرکەوت.. تروسکە بووە ئاسۆیەکی گەش.. دواجار حەقایەتێکت بۆ میوانەکەت گێرایەوە..

–دەگێرنەوە، پیاوێکی بە دین‌و ئیمان لەسەر سەفەری حەج دەبێ، داوا لە دراوسێکەی دەکات ئاگاداری تاقە کوڕە هەرزەکارەکەی بێ.. نەکا تا دێتەوە فێرە رەوشتی ناشرین بێ، ئەو سەفەر دەکاو حەجی جارانیش گەلێ درێژەی کێشاوە.. کە دەگەرێتەوەو دیاریی دەستی پێشکەش بە دراوسێ دەکات، دەڵێ "مەمنونی تۆم، دڵنیام کوڕە گەورەکەم بەقسەو فەرمایشتی کردوویت"، ئەویش دەڵێ "حاجی گیان.. نەوەڵڵا وا دەرنەچوو، ئەو بەم ئەخیری عومرەوە فێرە شەراب خواردنەوەی کردم"!

لەبیرتە ئەویش وتی " فێری هەرچییەکت بکەم لەپێناوی بەرزڕاگرتنی ئەم ماڵەو درێژەدانە بە هەموو شتە جوانەکان، کە زۆربەیان هەرخۆت خاوەنیانیت"..

بەهارێکی جوانی چەند ساڵێ لەمەوبەر، لەگەڵ شین بوونی سروشتداو دەرکەوتنی گوڵو گوڵاڵەکان، بەدیتنی زەماوەندی هەردوو دڵدار، زەردەخەنەی جاری جاران بووەوە میوانی سەر لێوەکانت..

زەردەخەنە بووە پێکەنینو بووە قاقا. لەناخەوە دەتویست ئاوێزانی ئەو بەهارە بیت کە تیایدا ئازیزانت سەرمەستو شادبوون.. وات هەست دەکرد گوڵەکانی ئەو ناوە هەموویان لە ئێخەی تۆ دەدرێن..

٢٠١١/٨/١٥

"هیوا" پیاوێکی ژیرو بەسەلیقەیەو زۆرتر لە ژمارەی ساڵانی تەمەنی، قاڵبووی خۆشی و ناخۆشییەکانی ژیانە..

هاوینی عومری خۆی تێپەڕاندووەو هەر وەکو جاران پیاوی ڕۆژانی تەنگانەو چرای روناککردنەوەی تاریکیی ڕێگای کەسوکارو هاوڕێیانیەتی، وەك دەڵێن شیری دایکی حەڵاڵیەتی..

لە شانە ئاگرینەکانی سەردەمی ئەنگوستەچاویدا بوێرو گیانبەخش بوو، کە بووە میوانی زیندانەکانیش، جەستە لاوازو بێهێزەکەی دەیانجار بە بنمیچە رەشەکانی ژوورە تەنگو تارەکانەوە هەڵدەواسرا..

لێرەولەوێ، خوێن لە جەستەی پڕ لەزامی دەچۆڕا، بەڵام هەمیشە سێوەکەی دڵی بۆنی ژینی لێ دەهاتو ڕۆحی ئاگرگرتووی لەگەڵ یەك بەیەکی ئاسۆکانی بەیاندا دەبووە گوڵەبەڕۆژەی بەرهەتاو و دارسنەوبەری بەر باران.

هیوا، کە هەر بەتەنیا لەگەڵ خۆیدا دەژیاو مەرگ سەرەتاتکێی لەگەڵدا دەکرد، ناخی گڕی تێبەردەبوو و ئاگر جەرگو هەناوی دەسووتاند، چونکە دەیزانی دایکە میهرەبانەکەی بەرگەی ئازاری دووریی ئەو ناگرێ‌و باش دەزانێ جەللادەکان ناهێڵن بۆ تەنیا ساتێ کوڕەکەی ئۆقرە بگرێت..

لەشەوە درێژەکانی زینداندا، لە خەون‌و زیندەخەونەکانیدا، دایکە رەنگ نورانییەکەی بە پرچ‌و سەرپۆشی سپییەوە دەهاتەوە بەرچاوی، هەردوو، چاویان دەبڕییە یەکترو بەدەنگە بەسۆزەکەیەوە لایلایەی جارانی بۆ دەکرد.. هیوا بەدیدەی پڕ لە ئەسرین‌و گوێی پڕ لە ئاوازی خوداییەوە رادەپەڕی‌و دوای سڕینی چاوەکانی، لەبەرخۆوە ئەو چەند وشەیەی دەگووتەوە کە لە دووریی دایکی هۆنیبوویەوە، هیوا دەیووت:

-بەرگەی ئازاری تۆ بگرم دایە.. یان بەرگەی ئازاری ئەمان....

ئـەو کاتــەی لــە ئینفرادییـــەوە بخرایەتـــەوە یـــەکێك لـــە هۆڵـــەکانی ئەمنەسوورەکە، هـەر کـە هەناسـەی نزیـك هەناسـەی زیندانییـەکی جـێ بڕوا ببوایەتەوە، ئەوا هەندێ لە تارمایی سـەر دیـدەکانی دەڕەوییـەوە و کـەمێ لـە خورپەی دڵی ئارامی دەگرت و بۆ ساتێ بڵێسەی دەروونی خامۆش دەبوو..

زیندانیی بەرامبـەری، چەپ بووایە یـان دیمـوکرات، نەتـەوەیی یـان پێـنج فـەرزە روو لەیـەزدان، دەبـووە هـاوڕێی گیـانی بـەگیانی ئـەو و بەسـەرهاتی فرمێسکەکانی خۆی کە بۆ پیاوە گوندنشینەکە رشتبوونی دەگێڕایەوە..

لەشەوە بێ کۆتاییەکاندا، هیوا، بەدەنگە نەرمو هێدییەکەی دەیووت:

–دەزانم هەریەکـــەمان دەردەســـەریی زۆرمـــان دیـــوە، دڵنیـــام دیمەنـــە ترسناکەکان بڕسکی لەهەر هەموومان بڕیوە، بەڵام من هەرگیزاو هەرگیز ئەو رووداوە لەیاد ناکەمو ئەو تاڵاوە لەبیرناکەم..

لەسەرخۆتر، هیـوا کڵافەی دیمـەنی لەیادنەچووی سـەرەتای هەشتاکانی شیدەکردەوەو دەیووت:

–دەمـەو نیوەڕۆییـەك لـە زانکـۆی سلێمانی هاتمـەدەرو بـەرەو وێستگەی پاســـەکان دەچـــووم، لەئاســـتی گـــەڕەکی ئیـــسکانی خـــواروو. گـــەمارۆی سەگەکانی "قوات خاصە" خورپەی خستە دڵمەوە، منو چەند کەسێك. وەك داری وشـــك هـــەڵاتوو، واق وڕمـــاو تەماشـــامان دەکـــرد. ئەســـتێرە لەسەرشـانەکەیان، بـە جامانـەی پێـچراوی سـەروملی، پیـاوە لادێیەکـەی دەهێناو دەبردو بەعەرەبی ئەیشێراند بەسەریدا "گەواد. ئەم ریشە پیسەت هەیەو بەجامانەش سەرووچاوت دەشاریتەوە، دەزانم. باش دەزانم. نانێکت لەگەڵ چەتەکاندا خواردووە.. ئەوەتا رەنگت هـەر لـەوان دەچێ.." ئەو وای وت و بێچووە سەگێکیش بە هەموو هێزی خۆیەوە سرەواندییە پەنا گوێی..

پیاوەش دوای کەوتنەخوارەوەی ئەشیعەو دەرمانـەکانی دەستی. تونـد تونـد دەسـتی گـرت بـە پەناگوێیـەوەو بـە دەنگێکـی ئەوپـەڕی بەڕانـەتەوە.

تێکەڵ لە گریان و هەنسکی پاڕانەوەی منداڵانەوە پێی وتن" خوا بناسن، ئاخر هەر ئێستا لە خەستەخانە دەرچووم، ئازاری گوێم ئارامی لەبەربڕیوم و ئێوەش لێم ئەدەن، بۆ وا ئەکەن، ئێوە لە خوا ناترسن، بۆ وا ئەکەن، بیکەن بەخاتری پێغەمبەر کەساس و خاوەن منداڵم..".

هیوا درێژەی پێ دەداو بە هاوڕێیانی زیندانی دەووت:

-سواری پاسی پۆڵۆنی بووم و پشت لەشوفێر، رێکەوت وایکرد خانمێکی خزمم بەرامبەرم بوو، بە بینینی ئەو هێندەی تر ئاگری هەناوم بڵێسەی سەندو فرمێسکەکانم بەخوڕ هاتنەخوارەوە، خزمەکەم بە حەپەساوییەوە وتی" ئەوە چی قەوماوە، هیوا گیان پێم بڵێ چی بووە، بۆ وا ئەکەی؟"، لەترسی نەفەرەکان نەوەك ناحەزێکیان تیابێ، هێندەم پێکرا بە ئاماژە بێدەنگی بکەم، دوای پرسیارێکی تری وتم" هیچ نییە باجی ژیان، گوێیەکانم دێشێن و لە خەستەخانە بووم، هیچ نییەو چاك دەبم..".

ئێستاشی لەگەڵدا بێ، لەناو جەرگەی ئازادیدا، لەقوڵایی هۆشیاری و لێکدانەوەدا، لە ترۆپکی دڵنیایی و ئارامیدا، لەگەڵ هەنگاوەکانی بە پایزی تەمەندا، هەموو جارێ ئەو بەسەرهاتە زیاتر لە بەسەرهاتەکانی تر دێنەوە بیری هیوا، هەمیشە ئەو دیمەنە زیاتر لە دیمەنەکانی تر دەیهەژێنێ و فرمێسك لەچاوەکانی دێنێ..

لەگەڵ هەر تووڕەبوون و غەدرێکدا، لەبیستنی هەر تاوانێکدا، لەدەنگی هەر سکاڵاو هاوارێکدا، هیوا، پیاوەکەی نزیك گەڕەکی ئیسکانی دێتەوە بەرچاو، کە لەگەڵ رژانی هەر دڵۆپە فرمێسکێکیدا ئەستێرە دەگریاو لەگەڵ هەر هاوارێکیدا باڵندەکان لەشەقەی باڵیان دەداو ئاسمانی ئەو ناوەیان جێدەهێشت..

نازانم، کە بەتەنیا لەسەر جێگاکەی بەجەستەی شەکەتەوە درێژی دەکەن، ئاخۆ دەچێتەوە بۆ کام رۆژگاری ژیانی پڕ لە رووداو و تاڵی وشیرینی.. یان لەگەڵ کام یەك لە یارو یاوەرانی دەست لەملی ژوانێك دەکەنەوەو رازونیازیان بەیەکتر دەگەیێنن؟

بەڵام لەوە دڵنیام مێشکە ماندووەکەی بۆ ساتێك ئۆقرە ناگریّو فیلمی یادو یادەوەرییەکانی بە بەرچاوانیدا دێن و دەڕۆن..

مامۆستا دلێر، لەهەرەتی گەنجێتیو چالاکییە بێکۆتاییەکانیدا، سەردەمانێ لە کەرکوك دڵی گەرمی وەك ئاگری بابەگوڕگوڕ نێڵەنێڵی بوو، بۆ لاوانی ئەو سەردەمە مامۆستاو هۆگر بوو، پارچەیەك بوو لەپەرۆشی..

لەودەمەوە ئاوێزانی شیعرو ئاواز بوو بوو، کە دەچووەوە (کۆیە)ی زێدی باوباپیران، بەجارێ لەنێو ئاوازەکانی تایەر تۆفیق و سیوەدا دەتوایەوەو خۆیشی رەنگی سروود و گۆرانیی گرتبوو..

هەر زوو بووە دەنگی زوڵاڵو کاراکتەری سەرەکیی نێو کۆڕی تێکۆشانو بە سروودەکانی سوێی دڵە پڕ لەزامەکانی ساڕێژ دەکرد..

لەشۆڕشدا، دەنگی ئەو لە چیا سەرکەشەکاندا دەنگی دەدایەوەو شیعری ئەو بووبووە ئارامبەخشی رۆحی میللەتپەروەران..

کاتێ حەفتاوشەش، جەستەی موبارەکی برا شەهیدەکەی گەیشتەوە ژێر سێبەری هەیبەت سوڵتان. لەبری هەڵڕشتنی فرمێسکی گەرمی، بەئاوازێکی یەکجار بەسۆز پێشوازیی لە (نازدارەکەی کۆیە) کردو ئیدی دەنگی هەڵقوڵینی ئەو کانییە جوانو بێگەردە بەردەوام بیرومێشکی لاوانی ئاودەداو بووە مایەی زیندەگانیی..

ماموّستا هەرخوّی دلێر بوو، لە كوّڕی ماتەمی ئازیزاندا براو لە هەواڵی بێسەروشوێناندا پرسیارو لە شەوە نوتەكەكاندا چرا بوو، چرایەكی گەش..

ساڵانێكە ئەو شیعرە بەسوّزە، ئەو چیرۆكە درێژە، ئەو ودەنگە ئەفسووناوییە لەژێر تاشەبەردی ناساغیدا دەناڵێنێ و ئەو دووچاوە پڕ لەبریسكەیەی جاران خاموّشن..

هەر كەئاشناو روّشنایانی دەچنە لای، بەدڵی پڕ لەسوێ و چاوی تەڕەوە تەماشای دەكەن و دەبینن ئەو(نەوروّز)ە شەڕ لەگەڵ مەرگدا دەكات.. هەر كاتێ یەكێك لەخوّشەویستانی بناسێتەوە ئەوا لای جگەرسوّزەكانی دەبێتە شادی و هەرا، دەزانن كە (باواجی) هێشتا هەر دەستلەملی ژیانەو مەرگ لە ئوّیەی نایەت.

وەك زوّرجاری دی، بەدیتنی شادبوونەوە، من و (هاوڕێ)ی گیانی بەگیانیی ئەو، لەگەڵ (عەول)ی (چەهچەهەی بولبول)دا چووینە خزمەتی، مەبەست جەژنە پیروّزەو هەواڵ پرسینی دڵە گەورەكەی و مێشكە ماندووەكەی و دەست و پەنجەی زێڕینی بوو..

ئەو، بەر لە راپەڕین فرمێسكی بوّ (هاوڕێ) دەڕشت كە لەزیندانادا ئازار دەدرا، دوای راپەڕینیش زوو زوو سوّراغی هاوڕێ هونەرمەندەكەی دەكرد.. وا هەرسێمان پێكەوە لەماموّستا دەڕوانین..

زوّرمان كردو زوّرمان كوّشا هیچ كامانی نەناسیەوە.. لەپڕێكدا بەعەولی هاوڕێم وت، ئادەی با نەوروّزەكەی خوّی بوّ بڵێینەوە..

(ساڵێكی تریش وا داهاتەوە.. روّژی نەوروّزی كورد هەڵاتەوە)..

بینیمان چاوە ماندووەكانی گەشتربوونەوەو پڕبوون لە بریسك و هوڕ، گوّنای گەشایەوەو زەردەخەنە چووەوە سەرلێوانی..

دەنگ لەسینەوە دەرهات و کەوتە وتنەوەی سروودەکەی، ئێمەش، لەگەڵ خۆشحاڵیمان بەو دیمەنە، هاوکات دڵگەرمیمان بۆی، بە دەم رشتنی ئەسرینەوە بەردەوام بووین..

عەول تێیچریکاندو پڕ بەژوورەکە دەنگی لێ هەڵبڕی:

چەهچەهەی بولبول عەزیزم، ئاهوزاری پێوەیە
هەلهەلەی عەرعەر لە عیشقا، دەردی کاری پێوەیە
نێرگزی شەهلا ئەلەرزێ، عیشوە کاری پێوەیە
دولبەرا ئەمرۆ نەسیم، بۆنی بەهاری پێوەیە
گوڵ شکۆفەی کردوە، خونچەی بەهاری پێوەیە ..

مامۆستا هەموو هەستەکانی لە چاو و گوێیەکانیدا راگرتبوو، چاوی نەدەتروکاندو بڕیبوونیە عەول، لەبەرخۆیەوە وتی (لەو دەنگە)، چاوەکانی گەشتر دەبوونەوە.. داوای لێکرد بەردەوام بێ، ئەویش بەدەم قوڵپی گریانەوە هەردوو دەستەکانی مامۆستای نا بەچاوانییەوەو لەسەر سۆزی خۆی بەردەوام بوو..

یادەوەرییەکانی مامۆستا بوونە قسەی سەرزاری و توند دەستی عەولی گرت و وتی:

-لەبیرمە دوای راپەرین بۆ سەفەری هەندەران ئامێری عودەکەتت فرۆشت.. ئای کەخەمم خوارد..

عەول وتی:

-راست دەفەرموویت، پارەم نەبوو بۆ سەفەر، گەلێ شتی خۆمم فرۆشت، خەمت نەبێ، ئێستا دوو عودی زۆرباشم هەیە..

ئێمە بۆ حاڵی مامۆستا، کە کەوتبووەوە قسە، لەسەرێکەوە خۆشحاڵ و لەسەرێکی دیکەوە نیگەران بووین.. خودایە، ئەم پیاوە کێوێک بوو لە ورەبەرزی و دەریایەک بوو لە هونەرو داهێنان..

هاوڕێ دڵ لەلاکەی، بەر لەوەی ماڵئاوایی بکەین، بە مامۆستای وت:

–خەریکە خەونی دێرینت دێتە دی و کورد دەبێتە خاوەنی دەوڵەتی خۆی..

ئەو وای وت و مامۆستا دەستی لەملی کردو دوای ماچێکی گەرمی، وتی:

–دەبێ وابێ.. دەبێ کورد بەو ئامانجە بگات..

ئێمە ویستمان دوای ماڵئاوایی مامۆستا جێبهێڵین، هەرچەندە ویستیان بەرەو ژوورەوە بیبەنەوە، بەڵام توندتوند دەستی عەولی گرتبوو بەری نەدەدا، تا دەرەوەی دەرگای ژوورەکە بەرۆیشتنە پڕ لە زەحمەتەکەیەوە لەگەڵماندا هات..

لە ژوورترازاین و لە ماڵ ئاوابووین.. هاوڕێ و مامۆستاو عەول لەناو ئوتومبیلەکەشدا هەر هەنسکی گریانیان دەبیستراو منیش بۆ دڵدانەوەی هەرسێکمان، روومکردە عەول و وتم (لەو دەنگە)...

ئیدی هەرسێ پێکەوە، بەشێ لە ئاوازەکەی مامۆستامان وتەوە..

بۆیەک شەو لای دایە ئەم دێیە رێی وێڵم
بەیانی، خۆرهەڵات، سوار ئەبم جێی دێڵم

پایزە باران لەو ئێوارەیەدا، جوانترین دیاری بوو بۆ سروشت. براکەی من و عەول وتی:

-با جامەکە بکەینەوە، گوناه نییە پیاو لای مامۆستا دلێر بووبێتو بۆنی بارانی پایز نەکات...

٢٠١١/١١/٢٨

سەرنج:

-مامۆستا دلێر: ئەدیبو هونەرمەندی گەورە خالید دلێر

-عەول: هونەرمەند عەدنان کەریم (هەرچۆن هاوسەرو منداڵەکانی و هەندێك لەهاوڕێیانی بانگی دەکەن)

-هاوڕێ: کاك تەحسین قادر

# شەش چیرۆکی وەرگێڕراو

لەو دەمەوەی مرۆڤ خۆی ناسیوە، تاوان بچووک بێت یان گەورە، روویداوە، لەهەر کۆمەڵگایەدا داب و نەریتی کۆمەڵایەتی فاکتەرن بۆ روودانی تاوانەکان، ئەوەتا دەبینین و دەبیستین لەو پەڕی گۆی زەوییەوە تا ئەمپەڕی، لەولاتە پێشکەوتووەکانەوە تا دەگات بەولاتە هەژارو گەرم و دواکەوتووەکانی خۆرهەلات، بەشێوەیەکی بەردەوام مرۆڤ تاوان بەرامبەر بەرەگەزەکەی خۆی دەکات و دەست دەنێتە بینی ئایندەی کەسانێک کە مافی ژیانیان هەیە.

بەچاکمزانی شەش بەسەرهاتی تاوان کەلەولاتی (میسر)دا روویانداوە بکەمە چیرۆک و لەم چاپەی (مەرگی وەنەوشە)دا جێگایان بکەمەوە، سەرچاوەی رووداوەکانیش رۆژنامەی (عالم الحوادث)ن.

ی.ن.بەرزنجی

ئەوساتە سوتێنەرانەی(دایکی عەلی )لەبەردەم بەندیخانەی (ئەبو غرێب)دا دەیبردنە سەر، دەبوونە ڕۆژگاری پڕ لەئازارو هەزارو یەك شت بەمێشکە شپرزەکەیدا دەهاتن !

هەموو جارێ بەهەناسەی ساردەوە، دامێنی پاسەوان وئەوانەی دەگرت کە لەو زیندانە زەبەلاحەدا دەهاتنەدەر، بەڵکو ئەمە خوایە هەواڵێکی مێردەکەی بزانێت کە دوومانگە بێسەروو شوێنە، خێرەو مەندێك هەواڵێکی پێبدات.. لەیەکێك لەهۆڵەکانی (ئەبوغرێب)دا باوکی عەلی تالآودەچێ بەدەروونی وروژراویدا.. دایکی عەلی، بێجگە لە غایلەی مێردە کلۆڵەکەی، هەمووجارێ بیرکردنەوەی شپرزەی دەیبردەوە بۆ ١٠ساڵ لەوەوبەر، ئەودەمانەی لەگەڵ کەسوکارەکەیدا وەك درەختی بێ ئاو لەبەردەم هەمان ئەو بەندیخانەیەدا دەچەقین وچاوەڕێ بوون بەعسیەکان ڕێگایان بدەن بچنە ژوورەوە وچاوێکیان بە (مەهدی)ی برای عەلی بکەوێ.. ئەو براخۆشەویستەی کە چەندمانگێك هەر لەئەبوغرێب بەتۆمەتی سۆزداری بۆ حزبی شیوعیی لەسێدارە دراو مەرگی ئەو بووە بڵێسەی ئاگرو لەدڵی کەسو کارەکەیدا هەمیشە نێڵە نێڵیەتی..!

## بۆچی گیرا..؟

(ئەبو عەلی)، کە لە ماڵە دڵتەنگەکەیدا خودا (مریەم)و (عەلی)ی پێدابوون، هەرکە بەجەستەی ماندووەوە دەگەڕایەوە، دەستو پەرداخی کچە گەورەکەی و ماچەکانی (عەلی) ساڵەوەختی و سینی دەستی میهرەبانەکەی ژنی دەیحەساندەوە بەگوفتاری شیرین باسوخواسی دادەمەزراند..

ئەو رۆژە، لەڕێی فرۆکەخانەی بەغدای نێودەوڵەتی، ئاماژە بۆ ڕاگرتنی تاکسییەکەی کرا، ڕێك لەبەردەم سەربازە ئەمریکاییەکاندا ڕاوەستا، هەر کە سەگە پۆلیسیەکان دەور وخولی تاکسیەکەی داو کەوتنە وەڕین، سندوق و بۆنیتی پێ هەڵدرایەوە، دوای ئەوەی هەردوو دەستی پێ بەرزکرایەوە دڵنیا بوون کە بۆنی بارووت لە ئوتۆمبێلەکە دێت..

ئەمانە، ئەو بەسەرهاتە بوون کە دوای حەفتا ڕۆژ لە دووریی باوکی عەلی، لەڕێی پارێزەرێکەوە کە بەشتێ پارەو هەزارویەك پاڕانەوەو لالانەوەی دایکی عەلی، لە ئەبوغرێب لە بەدبەختی زیندانی بیستران و پاشان گەیشتن بە ژنەکەی...

باوکی عەلی گوتویەتی ( من هەر بە yes،no ) وەلامم دەدانەوەو هەر بەزمانی خۆم داکۆکیم دەکرد و سوودی نەبوو.. خۆم و ئوتۆمبێلەکەم براین و دواتر وەرگێڕەکەیان دەیووت تۆ لەگەڵ تیرۆریستەکانی، منیش دەمووت خودا بناسن، تیرۆریستی چی، بەم ئوتۆمبێلە ماڵ و منداڵ بەخێو دەکەم.. ئیمامی عەلی ئاگادارە لە ئێوە زیاتر رقم لە تیرۆریستانە.. ئەوان دەڵێن ئەی بۆچی بۆنی بارووت لە ئۆتۆمبێلەکەت هاتووە، منیش دەڵێم ئاخر ڕۆژێ لەوەو بەر لە (دۆرە) نزیك تەقینەوەیك بووم هەر خوا خۆی فریای خۆم و ئۆتۆمبێلەکەم کەوت.. بەلام هەرچییەك دەڵێم هەر بێسوودە و وا رۆحم دەردەچێ..!).

پارێزەرەکەی زۆر هەوڵدەدا قایلیان بکات کە باوکی عەلی بێ تاوانە و بێ سوود دەبێ... ئیدی ئەویش تاقەتی نامێنێ و دەست لەو کێشەیە هەڵدەگرێت.. دەبێ بەسێ مانگی رەبەق و گەرمای هاوینو زیندانی پڕ لە

گۆبەنگ بە جارێ باوکی عەلی بێزار دەکات، بێزارییەك کە مەرگی خۆی بە ئاوات دەخوازێ..

## تەگبیری دراوسێکەی..!

کات بە قورسی گوزەر دەکات و رۆژ لە هەفتەو مانگەکان لە عومری باوکی عەلی و ژنەکەی دەکەنەوەو زیندان هەر لەجێی خۆی و قاقی پێکەنینی ئەفسەر و سەربازەکانی ڕوو لە زیاد بوون دەبن... لە ساڵ نزیك دەبنەوە و هەرچییەك لە ماڵەکەیدا پارە بکات بۆ بژێوی خۆی و کوڕ و کچەکەی بۆ هامشۆی زیندان دەفرۆشرێن و تەنانەت خزم و دراوسێیەك نا مێنێ قەرز و یارمەتی نەداتە دایکی عەلی...

هەفتەی دوو سێ جار، ژنەو دوو منداڵەکەی لەسەر پارچە حەسیرێك لەبەر زینداندا ئەوق دەمێنن.. بەڵکو ئەمە خوایە و خێرەومەندێك رەحمی بجوڵێ و بتوانێ ئەمان بباتە دیداری ئەو بێگوناهەی ژوورەوە...

رۆژێك یەك لە وەرگێڕە عێراقیەکان لە ئاستیاندا دەوەستێت، رادەمێنێ و پاشان سۆراخ دەکات... کە بەحاڵیان دەزانێت، ناوی تەواوی پیاوەکەیان وەردەگرێ و دەڵێ بڕۆنو دوو ڕۆژی تر وەرنەوە ئێرە، بۆ دووسبەی، پاش سێ سەعات چاوەڕوانی، کابرا پەیدا دەبێ و یەکسەر دەڵێ مێردەکەت خراپ توش بووە.. خوا خۆشی دەوێن کە ئەوراقی لای ئەفسەرێکی دۆستی منە، هەرچەند زۆرم داکۆکی لێکرد، بەڵام بە دەفتەرێك دۆلار بەریدەدەن..!

ژنە زیاتر لە فریادرەسی بەرگی سەربازی لەبەر نزیك دەبێتەوەو دەڵێ (برای بەڕێزم.. دەفتەرێك چەندە..؟)

ئەویش دەڵێ ( دیارە دەهەزار دۆلارە).. ئیدی دایکی عەلی بەقورگی پڕ لە گریانەوە دەڵێ قوڕی دنیا بەسەرم خۆ عەشرەتەکەم هەمووی ئەو پارەیەی پێ پەیدا ناکرێت، کابراش دەڵێت کەیفی خۆتانە، دەنا پێنج ڕۆژی تر دەگوێزرێتە بۆ بەسرەو دیتنەوەی ستەم دەبێت..!

دایکی عەلی تونید ژمارە تەلەفۆنی کابرا لە چنگیدا گیردەکات و بە فرمێسکەوە ئەو ناوە بەجێدەهێڵێ.. دێتەوە لای دراوسێ هەژارەکانی و دەردی دڵی هەڵدەرێژێ.. زەینەبی دەستە خوشکی لە پەناوە پێیدەڵێت عەزیزەکەم، من تەگبیرێکت بۆ دەکەم هەرچەندە حەزناکەم ئەوەش بڵێم، بەڵام چی دەکەیت.. ڕۆحەکەم، میوانە کوێتییەکانی ماڵی (ئەبو ئەحمەد) سبەی زوو دەڕۆنەوە، دەزانی منداڵیان دەست نەکەوت بۆچی عەلی نافرۆشی پێیان، بەخوا دایکم مێردەکەت خوا یار بێ چواری ترت بۆ دروست دەکات..

یەکەم جار قسەکە وەك چەخماخە لێیدا... بەرچاوی تاریك بوو، بەڵام شەو هەر بیری لێدەکردەوەو دواجار خۆی گەیاندە ماڵی زەینەب و وتی ( بڕۆ پێیان بڵێ عەلی یان دەدەمێ بەڵام لە دەهەزار یەك دۆلار کەمتر بێت نایدەم..!)

بەیانی زوو عەلی پێچایەوە.. عەلی برا.. دایکی عەلی خۆی گەیاندە نزیکترین تەلەفون.. بۆ ڕۆژی دوایی لەبەردەم زینداندا پێشوازیی لە مێردی ڕەنگ پەڕیوی کرد.. چوونەوە ماڵ، خزم و گەڕەك داباریین.. هەلهەلەی ژنە عەرەب هێندەی تر باوك و دایکەی کاس دەکرد.. باوکە دوای ساتێ بە مریەمی کچی وت کوا عەلی؟ وتی ( نازانم.. لە دایکم بپرسە..)

خورپه کەوتە دڵی.. بەژنەکەی وت ( کوا کولەکەی رۆحەکەم)؟ بە گریان وەڵامی دایەوە، ئینجا لەڕاستی مەسەلەکەی ئاگادار کرد.. وتی ( ڕۆیشتن.. بردیان بۆ خەلیج..!) باوکی عەلی وەك شێت و هار ڕاپەڕی.. وەك بروسکە دەرپەڕی‌و وەك شێت چووە ماڵی ئەبو ئەحمەد پڕ بەوناوە هاواری کرد (ئێوەو خودا.. من خۆم دەکوژم و عەلی بهێننەوە بۆ دایکی.. خێرتان دەگات عەلی بهێننەوە..).

سالآنێکی زۆربوو لەکۆڵانێکی چەپەکی ئەو شارەدا دەژیان، دەرگا بەدەرگاوە بوون، وەك دەڵێن لە دوو کونە گورگدا ژیانی پڕ لە کوێرەوەرییان دەبردە سەر، دراوسێی دێرینن و منداڵیان بوونەتە هاوڕێ و خوشك وبراو دایکیان بوونە دەستە خوشك و دڵ دەنێن بە دڵی یەکترەوە، گەورەی ماڵیش بوونەتە پشتوپەنای یەکتر..

رووداوێك جەرگ و دڵی سەرجەم تاکەکانی ئەو دوو خێزانە هەژارەی هێنایە ژان، بەتایبەت دایك و باوکیان، لەشەوی یەکی ئایارەوە تائێستا، وەك شێت سوراغ دەکەن و دەگەڕێن وسەر لە بنکەکانی پۆلیس دەدەن و بەڕەنگی زەردەوە وەلآمی ناسیاوو نەناسیاوی شارەکەیان دەدەنەوە، ئەوانەی سۆراغی هەردوو کچە بێ سەروو شوێنەکەیان لێ دەکەن!

## لەماڵی سۆزان

دایکی وتی:

کلۆڵەکەی من تەمەنی(١٥)بەهارە، بێجگە لە دەوامی مەکتەبەکەی یارمەتیدەرم بووە بۆ کاری رۆژانەی ئەم وێرانەیە، نزیکترین هاوڕێی ئەو(شیرین) بوو، لەگەڵ کچەکەی من لەسێی ناوەندی بوو، پێکەوە دەچوونە دەوام و هەر پێکەوەش دەهاتنەوە.. بۆ هەر کارێکی بازاڕ و چوونە دەرەوەش هەرپێکەوە بوون.. ڕەبی کوێراییم دایە، ئەو عەسرە خێرلەخۆنەدیوەکانی ئێمە هەر بەجلی مەکتەبەوە چوونە بازاڕ.. ئیتر ئەوەبوو دیارنەمان و نەماندینەوە.. لەدەوری گەڕێم، نازانم چی بەسەرهات.! ئەو کچە ڕێکوپێکەی من و شیرین بۆ نەگەڕانەوە.. دوو مانگ و نیوە ئۆقرەم لە بەربڕاوە، من و باوکە کلۆڵەکەی خەو ناچێتە چاومان و هەر بەهیوای هەواڵێکی ئەوانین.. لاڵ بم، کوا.. هەواڵ نییەو..خەبەرێ خۆی ناکات بەم کاولبووەدا.

## لەماڵی شیرین

باوکی بەچاوی تەڕەوە وتی:

. من و باوکی سۆزان، هەرپێکەوە بەیانیان زوو دەچینە سەرکار، ئێوارە بە جەستەی ماندوو وبڕێ پارەی ناو گیرفان ویەك دوو عەلاگە سەوزەومیوەوە دەگەڕێینەوە..

وەك ژنەکەم بۆی باسکردم، عەسرێکی درەنگ، شیرن و سۆزان دەچنە بازاڕ.. ئیتر نەهاتوونەوە، ئەو رۆژە کە گەڕاینەوە ماڵ، ڕەنگی پەڕیوی هەردوو دایکی لەبەر دەرگا وەستاو خورپەی خستە دڵمانەوە.. هەر کە وتیان (قەت ئەوەندەیان پێنەچووە، وا شەوە و دیارنین ) پێکەوە من و باوکی سۆزان ڕامانکرد بۆ بازاڕ.. ئەو شەوە تا درەنگ گەڕاین و سۆراغیان نەبوو، نیوەشەو چووینە بنکەی پۆلیس.. بۆ بەیانی بەهەمان شێوە.. بەڵام دیارنین و نین. نازانم چی بکەم، مەرگی خۆم بەئاوات دەخوازم، ئاخر کچەکەی من منداڵە.. ئاخر کچەکەی من لەگوڵ پاکترە.. ئاخر کچەکەم..

## زوو دەگەڕێینەوە!..

کەسۆزان دێتە ئەمدیو و هەرکە بەشیرین دەڵێ(چییە..ئامادەنەبووی) دەمودەس خوشکە بچکۆلەکەی شیرین دەڵێ (بۆکوێ دەچی، دادە بەوخوایە باوکم دەتکوژێ.. چۆن بەوت نەوتووە و دەچیتە بازاڕ؟!) ئەویش دەڵێ(تۆچەنەبازی مەکە.. ئەوە دایکمە و بەوم وتووە. فەرقیان چییە)..لەنێو دەرگاوە ئاوڕ لەدایکی دەداتەوە و دەڵێ (زوو دەگەڕێینەوە).. لەدەرگا ئاوادەبن، دەستی لە نێودەستی هاوڕێکەی و ڕووەو بازاڕ..

ئەوان ون دەبن وباوکیان و پۆلیس عەوداڵی دۆزینەوەوەیان دەبن..

هەر لەهەفتەی یەکەمی دوای دیارنەمانیان، هەواڵێك خۆی دەکات بە ماڵە تاریکەکانیاندا، پێیان دەڵێن (هەرئەو ئێوارەیە کچەکانتان چوونەتە دوکانی

عادل).. بۆیان دەردەکەویٚ عادل کوڕێکی بیست ساڵە، بەهۆی پیشەکەیەوە کچان روو لە دوکانەکەی دەکەن.. ئەو جل وبەرگی کچانە دەفرۆشیٚ، لە گوزەرەکەیدا بەوە ناسراوە بەفێڵ و تەڵەکەبازی دەژی و (ڕاوە کچ) دەکات.. ئەو یەك دوو ساڵ بووە، بەشاگردیی ئەو دوکانە پڕلە ئاڵ و والآیە گوزەراندویەتی.. باوکەکان دەچنە شوێنی (عادل)، بەلآم نییە، دەڵێن هەر لەسەرەتای مانگەوە، ئەو کوڕەی دراوسێکانی بەچاوی رقەوە تەماشایان کردووە، دیار نەماوە.!.

کەواتە کچەکانی ئەمان لەگەڵ ئەودا ڕۆیشتوون..! بەلآم بۆ کویٚ.. دیارنییە.!.

لەوەو بەر ئەو دوو خێزانە هەژارە لە (پۆرسەعید)دا ناسراو نەبوون، بەلآم ئێستا گەورە و بچووکی شارەکە دەیانناسیٚ..

باوکی سۆزان جگەرە هەناوی ڕەش کردۆتەوە، هەر کە دەگەڕێتەوە ماڵ ژنەکەی بەفرمێسکەوە پێشوازیی لیٚ دەکات و پرسیاری بیٚوەلآم لە سیمایاندا دەنەخشیٚ..

باوکی شیرین، پێنج فەرزە لەخودا دەپاڕێتەوەو سکالآی خۆی دەگەیێنێتە پەروەردگار.. دوای هەموو نوێژێك سەرهەڵدەبڕیٚ و دەڵیٚ:

بۆکویٚ چوویت هەناوبەندی جگەرم...لەچی ترسایت.. لەوەی بێیتەوە ولێتبدەم.. لە سەرچوونە دەرەوە لێتدەم.. نا کچی خۆم.. پەنجەم هەڵوەریٚ گەر لێتدەم.. دە وەرەوە.. بۆ کوێیان بردن.. ئاخر وا دڵم پچڕا کچەکەم.. نا کچە عاقڵەکەم.. لێتان نادەین.. هەرگیز لێتان نادەین

قەدەریان وابوو شەیتان لە خشتەیان بەرێت و لەسەر خوانی ئەو یەکبگرنەوە.. شێوەیان لە یەکترجودا و بەختیان وەك یەك، شیرازە تێکچوونی خێزان و هەژاری و نەخوێندەواری رووەو یەك چارەنووسی بردن، چارەنووسی فرۆشتنی جەستەی خۆیان!

**نەسرینی ١٩ساڵ..**

ئەو کچەی نەگەیبووە بیست بەهار، هەمیشە خەمبار و چاوبەگریان، بەمەراقەوە بیری لەو رۆژگارە دەکردەوە کە لەگەڵ خوشکە بچووکەکەیدا لە ئامێزی پڕ لە سۆزی دایك و باوکی خۆیاندا دەژیان، ئەوان دەیانخوێند، باوك و دایکیان کاریان دەکرد و بۆ بەختەوەریی جووتە نازدارەکەیان دەڕەنجان، بەڵام دەستی قەدەری نەعلەتی گەیشتە ئەو خێزانەو رۆژێك کە جووتە خوشك لە خوێندن بوون، ئاگر بەربووە ماڵیان و جەستەی موبارەکی دوو میهرەبانەکەی ماڵیش بوونە قەرەبرووت..! لە بێکەسی و ناچاریدا چوونە ماڵی تەنیا پوورەکەیان. ئەو ماڵەش کە دووچاری هەژاری و نەگبەتی بوو بوو، بەتەنیا پیاوی ماڵیان سەرچاوەی بژێوی حەوت سەر خێزان بوو، هەربۆیە مێردی پوورەکەیان دوای چەند رۆژێ کەوتە دەربڕینی رق و ناڕازی بوونی لە ژیانی ئەو جووتە هەتیوە لە ماڵەکەیاندا..! نەسرین نەیتوانیی ئاواتی خوێندنی بهێنێتەدی و بگات بە بڕوانامەیەك کە خەونی سووتاوی دایك و باوکەکەشی بوون، ناچار لەخوێندن دابڕاو کەوتە گەڕان بەشوێن کارێکدا بۆ پەیداکردنی نانی خۆی و خوشکەکەی، بەڵکو ئەمە خوایە مێردی پووریشی روویەکی خۆشیان پێبدات و بتوانێ ببێتە هۆکاری خوێندنی تاقە خوشکەکەی...

له دوکانی فرۆشتنی جلوبەرگدا کاری دەستکەوت، لە هەفتەیەك زیاتر هەڵی نەکرد، کابرای خاوەن دوکان وەك گورگی برسی دەوروخولی دەداو دەیویست نامەردانە ئەو گوڵە بژاکێنێ، وازی لەوێ هێناو کاری لەساڵۆنێکی ئارایشتگا چنگ کەوت، لەوێ (مەی)بووە هاوڕێ و هاوغەمی، ئەویش پەردەی لەرووی ژیانی بۆ لاداو کوێرەوەریی خۆی بۆ دەگێرایەوە...

## غەریبی نێو ماڵەکەی خۆی

(مەی) تەنیا ساڵێك لە نەسرین گەورەتربوو، هەر کە دەرفەت بووایە سکالاّ یان بۆنی هەناسەی سووتاوی لێدەهات و بەزمان و چاو یەکتریان دەدوان، مەی بە هاوڕێکەی وتبوو: من نازداری ماڵ بووم، لەبەدبەختی مندا باوکی بەڕێزم تووشی شێرپەنجەبوو و ئاسمانی ماڵمان رووخاو بەمەرگی ئەو باشترین بنیادەمی ئەم سەرزەمینە لە ماڵمان برایەدەر، ماڵ تاریکبوو، ماڵ باوەپیارەی تێهات، ماڵبووە کاولبوو، دایکیشی دوای یەك دووساڵ، بەتەنێ عیبادەتی مێردە چارەتاڵەکەی دەکردو سۆزی دەدایە کوڕە ساواکەی..! ئیدی ژیانم بووە دۆزەخ، پیاوە قسەی پێ دەگوتم و ئەو بێدەنگبوو، پیاوە زوخاوی دەدامێ و ئەو بێدەنگبوو، پیاوە وەك شێت پەلاماری دەدام و لێیدەدام و ئەو هەر بێدەنگبوو.!

لەوێ ئاوابوو و لە چواردیواری ماڵەمامدا گیرسایەوە، جیاوازییەکی ئەوتۆ نەبوو لە نێوان باوەپیارەو ئامۆژندا، بۆ خۆی ژن و ئازاری ژنی دەدا، لەوێش زۆری بینی، ئیدی باڵشکاو گەڕایەوە ماڵە دایك، بەلاّم بڕیاریدا دەستی لە کاریێ گیربێ و ببێتە (مەی) ی خاوەن کیسەو گیرفانی خۆی، بەڵکو ئەمە خوایە ئەو جووتەی رەحمێ لە دڵیاندا نەبوو کەمێ بەزەیی و سۆزی بدەنێ..

مەی ئاوا چووبووە ئارایشتگاکە، ئاواش بووە هاوڕێی نەسرینی بەخت سووتاو..

شەیتانیٚ لێیان نەگەڕا و هاتە ژیانیانەوە، ئەوشەیتانە کە ژنێکی لە خۆیان گەورەتربوو هاتە بنکڵێشەیان و ڕازیی کردن واز لەو داهاتە کەمە بهێنن و بیانباتە (مەلها)یەکی شەوانەو لەویٚ بە (شادیە) یان بسپێرێت..!

## شادیە.. چیرۆکێکی ون بوو...!

بەسەرساممییەوە چوونە سەر خوانی شەیتان، لەویٚ (شادیە)ش بووە دەستەخوشکیان، چیرۆکی ئەو دەیووت:

- کچی ماڵێکی ئارام، باوکی بە بازرگانی دەژیا لەئەسکەندەرییەو ئەمیش چرای ماڵ و ڕووناکیی دەروونی دایك بوو، هەموو ئاواتی دایکەکەی ئەوەبوو (شادیە) لەماڵە مێردێکی بەڕێزدا شاد بێت و ئایندە بۆی پێبکەنێت.. هەر واشبوو، چووە کەژاوەوە، بووە بووکی گۆنا ئاڵ، مێردەکەی خاوەنی خانوو و ئۆتۆمبیلی قەشەنگ بوو، بەڵام سیٚ سەعاتیٚ دوور لە شارەکەیان دەژیان.. شادیە تەنیا مەراقیٚ هەیبوو تەواونەکردنی خوێندنەکەی بوو بەهۆی شووەوە...

سەرەتا ژیانێکی هێمن و دوای چەند مانگی تاڵاوی دەستی ماڵە خەزوور و مێردەکەشی.. ڕێزی ئەو کچە جوانە نەگیراو ئەویش ناچار بەماڵە باوکی گوت (خودا بناسن، دامتانە ماڵیٚ پڕ جوێن دەکرێم و وەك کارەکەر تەماشا دەکرێم..)..

باوکی دژی وەستاو گوتی (نامەویٚ کچی گەورەم بەتەڵاقدراوی بێتەوە سەرم.. خۆشیت بیٚ و ترشیت بیٚ دەبیٚ هەر لەماڵە مێرددا بیت..!).

بەقسەی باوکی خۆی کرد، گەڕایەوە لای مێردەو بەشی لێدان و ئازار چەشتن بوو، سکی لێی پڕبوو، بەدووگیانیش هەرلێیدەدرا و کۆرپەی لە باربرا.. جارێکی تر چووەوە لای باوان و گوێی لێ نەگیرا، پێی گوترا (درۆ دەکەی، جانانە خۆت لە بارت بردووە.. تۆ تاوانت کردوە..)..

داوای لێکرا ماڵ بەجێبهێلێت و رووکاتەوە مێردی بەڕێزی.. وەك سەرگەردانێ روویکردە ویستگەی شەمەندەفەر، بەلام بۆ شارەکەی خۆی نا، بەڵکو بۆ پایتەخت، شەو بوو گەیشت، گلۆپە ئاڵ والاکان کوێراییان بە چاوەکانی دەهانی.. ماڵە خزمێکی دۆزییەوە، دووسێ رۆژێ داڵدەدرا، ئیدی پێی گوترا چی دی ناتوانن خانمێك بەو حاڵ و وەزعەوە بگرنە خۆ...

قەدەر بردبوویە ئەو مەلهای شەوانەیەی دوو کلۆڵەکەی تربوونە میوانی...

تا دوای نیوە شەو، هەرسێ دەبوونە هاوڕێی چارەتاڵە مەست و بێ هۆشەکان، شەوی سووریان زۆر و غەمی دڵیان زۆرترو بەردەوام.. کارەکەیان گەشەی کردو هەر بەهۆی (شەیتان)ەوە بوونە خاوەنی (شوققە)ی خۆیان، ئیدی میوانە دەست بەپارەو دیارییەکان، بەرۆژ و شەو بەری جوانی و ئافرەتیی ئەوانیان دەچنییەوە، ناوبانگیان پەیدا کردو پۆلیس پێی زانین و کەوتنە چاودێریی خۆیان و شەیتان و میوانەکانیان..

کاتێ دەستگیرکران و برانە لێکۆڵینەوە، قسەیان هەبوو:

نەسرین گوتی:

. بەتەنیا ئاگر بەرنەبووە دایك و بابم و ماڵمان، بەڵکو بەریشبووە ژیان و یەك بەیەکی رازەکانم... بۆیە وامکرد..!

مەی گوتی:

. دایکە هەشبەسەرەکەی خۆم سەبەبکارم بوو... لەودنیاش لێی خۆشنابم و هەرخودا خۆی هەقمی لێ دەستێنێ..

شادیە گوتی:

- لە گولْ پاکتربووم، مێردەکەم خێر لەخۆی نەبینێ ناردمیە سەر ئەم ڕێگایەو...

کە هەرسێکشیان زیاتر دوان... ئاهونزوڵەکانیان دەگەیاندە پەروەردگار و دەیانووت (ئەویش ژن نەبوو، شەیتان بوو شەیتان.. ڕەبی هەروا سووک و ریسوابێت...)

ڕۆژنامەنووسەکە، بەخۆی و ریکۆرد و کامێراو پەرە کاغەزەکانی دەستییەوە لەژووری بەرپرسی بنکەی پۆلیسەکە چاوەڕێی دوو دەستی سوورهەڵگەڕاو بەتاوان بوو... ژنێك چنگی ڕەشی نابووە گەردنی منداڵێك و جەرگی دایك و باوکی سووتاندبوو.!

"فاتن"بەڕەنگی شێرزەو جووتێ چاوی پڕ لەفرمێسکەوە بەژوورکەوت، نیشانەکانی غەم و پەشیمانی سیمایان داپۆشی بوو...

بەترس و لەرزەوە لەبەردەمی مێزی ئەفسەرەکەدا وەستا...

بەر لەقسەی ئەفسەر، ڕۆژنامەنووسەکە داوای لێکرد دابنیشێ، فاتن کەمێ نزیکبۆوە، بەڵام رووی وەرگێڕاو بە ئەفسەرەکەی گوت:

- دەتوانم کەمێ تەماشای دەرەوە بکەم؟

- بۆ نا، تەماشاکە...

لەشی دەلەرزیو چووە بەردەم پەنجەرەکە، بەوردی چاوەکانی بڕییە دەرەوەی بنکەکە... وەك ئەوەی بۆ دواجار ژیان و شارەکەی ببینێتەوە!

پاش تاوێ لایەوە دانیشت.. دەیویست تەماشای بکات، بەڵام ئەو چاوی دەبڕییە زەوی...

هەر کە ڕۆژنامەنووسەکە خۆی پێ ناساند، ژنە چاوەڕێی پرسیاری نەکرد و گوتی:

- من زۆرباش چارەنووسی خۆم دەزانم... دەبێ جگە لەپەتی سێدارە چ شتێك چاوەڕێی من بکات...

دوای چەند رستەیەکی ئەوو کەمێ دڵدانەوە، فاتن کەوتە هەڵڕشتنی ژیانی و ئەو تاوانەی بەر لە هەموو کەس خۆی تۆقاندبوو...

فاتن گێڕایەوەو گوتی:

– بەسەرهاتی من دوورودرێژە و کۆتایی بۆ نییە، لاوێکی گوندەکەمان کە بەفەلاحەتەوە خەریکە هاتە داوام، دایانمێ، ئیدی نیشانەکرام و گەلێ بەختەوەربووم، چونکە دەمزانی دەبمە ژنی ئەو کەسەی خۆشیدەوێم، دەمزانی وەك چاوەکانی دەمپارێزێ...

من چاوەڕوانبووم تەدارەکی گواستنەوە ئامادەکەین و خەونەکانم بێنەدی، بەڵام ڕۆژێکیان پێی گوتم:

– دەمەوێ لە شوێنێکی گشتیدا چاومان بەیەکتر بکەوێت... کارێکی گرنگم پێتە...

کە یەکترمان دیی، ڕووی گرژومۆنی خورپەی خستە دڵمەوە، گوتی:

– فاتن، من و تۆ بۆ یەکتر دەستنادەین و هەرگیز مارەت ناکەم و نابیتە ژنی من، فەرموو ئەمە ئەڵقەکەت و بێنە ئەوەی خۆم...

قسەکانی وەك بروسکە وابوون، لەجێی خۆم ئەوق دامام... بەچاو لێمدەپرسی(بۆ...بۆچی وادەکەی؟) هەروەك ئەوەی لە پرسیارەکەم گەیشتبێ، لەسەرخۆ پێی گوتم:

– هەڵسوکەوتی تۆم بەدڵ نییەو تۆ ئافرەتێکی بێناموسی!!

هەروەك ئەوەی ئاگرێك لەپووشوپەلاش بەربێ، ئەو هەواڵە بەربووە یەك بەیەکی خەڵکی گوندە بچووکەکەمان، منیش دڵ پڕ لەترس و شەرمەزاری، کونجی ژوورەوەم گرت...

کەیەکێك بیویستایە لێم نزیککەوێتەوە و بمخوازێ هەر کە ئەو دەنگوباسەی دەبیست لێم دەتەکایەوە، ئیدی ژیانم دۆزەخ بوو..

## دەسگیرانی دووەم.!

بە پەرداخەکەی بەردەمی، کەمێ قورگی تەڕکردو بەسەر دەستی دیزداشەکەی بەری چاوە تەڕەکانی سڕی و کەوتەوە ئاخاوتن...

- ڕێکەوت کوڕێکی گوندێکی نزیك بە خۆمان منی بینی و شەیدام بوو، هاتە لامان و داوای کردم... دەترسام بەو قسەوباسە بزانیٚ و لێم ئاوابێ... ڕازی بووم، نیشانەکرام، براژنەکەی وەك شمڵی شەڕ لێم پەیدابوو، پەرستیاری مەڵبەندە تەندروستییەکەی گوندەکەیان بوو، خەڵکی لای ئێمەش دەچوونە لای.. دەمی هەراشی لیٚ کردمەوە و دەیووت:

- نایەڵم، بەو خودایە نایەڵم بۆ یەك شەو ببێتە ژنی ئەو شووبرا بەدبەختەم... بۆ سەری ئاسمان بەپووش گیراوە، بۆ ژن قاتی بووە... بهێڵم ئەو بێ ئاگایە، کۆنە بەردەستی خەڵکی بکاتە خانمی ماڵ!

کوڕە شەیدام بووبوو، تاماوەیەکی زۆر بەرگەی گرت و دەیووت باوەڕم پێتەو بەگوێی هیچ کەسی ئەم دنیایە ناکەم...

بەڵام بۆ بەدبەختی ناوچەوانە ڕەشەکەی من، کوڕە لەگێژنە برا، کوڕە لەخشتەبراو بڕوایان پیٚ هانی کە من کچێکی سووکم و بەکەڵکی ئەو نایەم..

ڕۆژێك... ئاخ لەو ڕۆژە شوومە، هات و گوتی: فاتن، هەرچەندە بەقەد ڕۆحم خۆشمدەوێی، بەڵام ناهێڵن، نەك هەر بەشەر، بەڵکو درەختەکانی گوندەکەشمان باسی تۆ دەکەن... ناتوانم... فاتن ناتوانم...بمبوورە...

ئەویش ڕۆیی‌ولێم دوورکەوتەوە.. دەمویست بیبینم، نەیدەهێشت، دەمویست بیدوێنم، تەلەفونی بەڕوومدا دادەخستەوە...

ڕۆژنامەنووسەکە لێی پرسی:

- دیارە تۆش حەزی تۆڵە سەندنەوە لەناختدا چەکەرەی کردبوو ؟

- هەڵبەت هەروا بوو، لە هەموو کەس زیاتر رقم لەبراژنەکەی بوو، ئەو دەم هەراشە، چوومە سەری و بووە شەڕو پەلاماردان، لەبنکەی پۆلیس ئاشتکراینەوە..

بەڵام تۆڵە لام بووە گەورەترین ویست، ویستم ئەمجارە جەرگی بسوتێنم، وەك جەرگی سوتاندم و نەیهێشت بەموورادی دڵم بگەم...

## منداڵێکی سێ ساڵ..!

لەگەڵ خۆمدا تەگبیرم کرد بۆ هەمیشە کوڕە سێ ساڵەکە لەو پەرستیارە دووربخەمەوە و بەوەش ئاگر لەماڵ و ژیانی بەربدەم، هەروایشم کرد... گوندەکەیان سەعاتێ لێمانەوە دوور بوو، سەرلەبەیانی، ئەوکاتە دایکی لەدەوام بوو، چوومە ماڵیان و بەپاکەتێ پسکیت بێ دەنگم کردو بردمە ژوورێکی خۆیان و هەردوو دەستم نایە گەردنی و نەمهێشت هەناسە بدات و خنکاندم... دوای ئەوە منداڵەکەم کردە باوەشم و بردمە سەربانی ماڵەکەیان و لەوێوە هەڵمدایە خوارەوە، بۆ حەوشەی ماڵەکەی هاوسێیان.

- بۆ واتکرد؟

- بۆئەوەی تاوانەکەی من بشاردرێتەوە، بۆ شوێنەونی وامکرد... وامزانی بەوە کۆتایی بەتاوانەکەی من دێت.. گەڕامەوە گوندی خۆمان، دڵم ئاوی خواردەوە، تۆڵەی خۆمم سەند...

## فاتن چۆن ئاشکرابوو؟

دوو رۆژ دوای تاوانەکە، پۆلیس دێنە ماڵیان و فاتن دەستگیر دەکەن، چونکە:

١- کە منداڵە مردووەکە براوەتە نەخۆشخانە، زانراوە بەر لەکەوتنەخوارەوەی خنکێنراوە.

٢- منداڵێکی ئەو ناوە، فاتنی دیوە کە بەشپرزەیی لەماڵەکە هاتووەتەدەرو دوورکەوتوەتەوە.

ئەمانە جگە لەگومانی دایکی منداڵە خنکاوەکەو کەسوکاری بەرامبەر بەفاتن..

پولیس هەر کە فاتن دەبەن و لەگەڵیدا دەدوێن، بەترسولەرزەکەیدا دەستبەجێ دەزانن کە بێجگە لەو کەسێکی تر تاوانکاری ئەو تاوانە نییە کە لەئاستیدا ئاوی خوڕ رادەوەستێت و گیاندار و بێ گیان بەرامبەری دێنە زمان.

ئەمیرەی شۆخ و جوان، کە کچی خێزانێکی دەوڵەمەند بوو، لە لەندەن لەنازو نیعمەتدا دەژیا، هاوینان بەسەردان دەهاتنەوە بۆ میسرو بۆ بەسەربردنی چەند مانگێکی پڕ لەشادی لەڤێلا رازاوەکەیاندا..ئینتەرنێت کردییە ناسیاوی کوڕەلاوێکی ولاتەکەی خۆی..یەکەمین پێکگەیشتن، بە(Chat) بەیەکتریان وت:

– من محەمەدم، تەمەنم(٢٦) ساڵەو لە قاهیرە دەژیم، ئەندازیاری تەلارسازیم، حەز دەکەم هاوڕێت بم..

– منیش ئەمیرەم، هەر خەڵکی ولات و شارەکەی ئێوەم، بەلام لە لەندەن دەژیم، تەمەنم(٢٠) ساڵەو، زۆر حەز دەکەم ببمە هاوڕێی کچان و کوڕانی ولاتەکەم..خۆشحاڵم بەناسینت..

جاری دیکە چوونەوە سەر هێڵ، بوونە هاوڕێ، رێکەوتبوون لە چ سەعاتێکی رۆژدا، یان شەودا پەیوەندی بکەن..(چات) جوانترین ئامرازبوو بۆ گۆڕینەوەی رازەکانیان..

## ناسینی زیاتر..!

محەمەد باسی ژیانی خۆی بۆ ئەمیرە دەکرد، ئەو بەم جۆرە خۆی پێناساند..

– من کۆلیجی ئەندازیاریی تەلارسازیم تەواو کردوە، ئێستا لە کۆمپانیایەکی خاڵم کار دەکەم، خێزانەکەمان سوپاس بۆ خوا دەوڵەمەندەو خاوەنی خانویەکی باشم لە گەڕەکێکی یەکجار خۆشی قاهیرە..

کچەکەش باسی خۆی بۆ دەکرد..

دەیووت:

– ڤێلاکەی ئێمەش لە(قەناتر)ە، بەهیوام هاوینێ لەوێ پێشوازیت لێ بکەم..

نیوەی شەوێ، لەکامێرای سەر کۆمپیوتەرەوە، روانینە یەکتر، محەمەد چی بینی، ئەمیرەیەکی ئەوروپی..هەر لەکچی ناو فیلم دەچوو..سەرسامیی خۆی نیشاندا بە جوانیەکەی..

– وتی:

– بەر لەدیتنت شەیدات بووم، خۆزگە شاعیر بوومایە، ئەوسا دەمزانی چ هۆنراوەیەکی وشەم وەك ملوانکە بۆ گەردنت دەهۆنییەوە..

– ئەویش وتی:

– بەخوا شەرمت لێ دەکەم، بەڵام چەند رۆژێکە منیش بەشێوازی تۆ گرفتاری ئەندێشەو سەرسوڕمان بووم، باشە ئەسمەر گیان..

– بوونە خۆشەویستی یەکتر، شەوو رۆژیان دەبژارد تا وادەی دەستخستنە نێو دەستی یەکترەوە بێت..

ئەمیرەی نازدار، خۆیدایە دەستی ئەو خۆشەویستەو قسە هەنگوینیەکانی محەمەد رازییان کرد..بەتایبەتیش کە پەروەردەی ئەو بەجۆرێ بوو ژیانی ئەوروپا نەیدابووە بەر شەپۆلی غەریزەی کوڕە سوورو سپییەکانی ئەوێ..

هەربۆیە لەخودای داوابوو زوو بگات بە محەمەدو لە نزیکەوە کلیلی دڵی خۆی بداتێ و ئەوسا بیری زیاتر لەیەکتر بکەنەوە..

محەمەد، بەر لەسەفەری ئەمیرە بەچەند رۆژێك پێی وت:

– ئەمیرە، من هەر کەهاتمەوە دێمە داوات..زەماوەندێ رێك دەخەین، کەس نەیکردبێ..دەبیتە جوانترین بووکی شارەکەم..

## چی رویدا؟!

نیوەڕۆبوو گەیشتە فرۆکەخانە، بەخۆی و چەپکە گوڵی دەستیەوە، محەمەد چرکە بەچرکە ساتی چاوەڕوانی دەبژارد.. فڕۆکە گەیشت و هەموو هەستی بەپێوە بوو..ئەمیرە لەپلیکانەی فڕۆکەوە چاوی بۆ محەمەدەکەی خۆی دەگێڕا..لەدوورەوە بالأی بەرزی رایچڵەکاند..بەخوشکە بچووکەکەی وت (ئەوەتا، ئەو گوڵ بەدەستە خۆیەتی..تەماشا چەند بالأ بەرزو جوانە)..

کە بەدیدەنییان شادبوو، ئەمیرە بەباوکی و دایکی و تاقە خوشکەکەی ناساند، ئەمیش زۆر بەرێزو ئەتەکێتەوە پێشوازی لێکردن..هەموو دڵخۆش بوون بەو هاورێ خانەدانەی کچە ئازیزەکەیان..

دوای دوو رۆژ چووە سەردانیان، دووبارە چەپکە گوڵ و پاکەتە شیرینی نایابی بەدەستەوەبوو بۆیان..ئاخافتن دامەزرا، باس لەپرۆژە زۆرەکانی خۆی کرد..ئامارەیەکیشی بۆ ئەوە کرد کە لەسەر رێی ژنهێنانەو..دایکی ئەمیرە بەتیلەیەکی چاوو زەردەخەنەی سەر لێوەوە تەماشای مێردەکەی کرد..ئەمیرەش بەشەرمەوە سەری داخست..

چەند جارێك دەعوەتی کرد بۆ دەرەوەو لە ریستۆرانتەکاندا سوچێکیان هەڵبژارد..دەست لەناو دەستدا بوون، بەزار دەدوان و بەچاو تەواویان دەکرد، رێکەوتن لەسەر داخوازی و مارەبڕین، هەموو جارێك ئەمیرە دەیووت:

– محەمەد گیان..نابێ بەم جۆرە پارە خەرج بکەیت..دەستی پێوە بگرە، کەبووین بەماڵ پارەی زۆری من و تۆمان پێویست دەبێ..

ئەویش دەیووت:

– گوێ مەدەرێ. هەرچیم هەیە قوربانی چاوە جوانەکانی ئەمیرەخانی دەکەم..

ئێوارەیەك، دوای گەڕانەوە لە ئاهەنگی جەژنی لەدایك بوونی هاوڕێیەكی ئەمیرەدا، ئەمیرە داوای لێكرد:

– بۆ نایەیتە ماڵمان پشوویەك بدەیت و تەماشای ئەلبوومەكانم بكەیت..

ئەویش لەخوای دەویست..سەركەوتن..دانیشتن..دوای شەربەت، قوتوویەك هات كە ئەلبوومە بچووكەكانی تێدابوو، قوتوو كرایەوەو دەركەوت بەهەڵە هێنراوە، چونكە پڕیبوو لە ئاڵتوون و موتوو مووری دایكی ئەمیرە..

هەر كە محەمەد قوتووەی بینی چاوی ئاوی كردو رەنگی گۆڕدرا، دڵی كەوتە پەلەپەل..تەنانەت عارەق بە دەموچاویدا هاتە خوارەوە..بێ ئەوەی ئەمیرە هەستی پێ بكات..ئەمیرە داوای لێبوردنی كردو چوو بیگۆڕێ بەقوتووی ئەلبوومەكان..لەگەڵ چوونە دەرەوەیدا، ئەندازیار بەرنامەی دانا، نیو پەرداخ شەربەتەكەی بەردەمی كرد بە پانتۆڵەكەیدا..خۆی شێرزەكرد، ئەمیرەو وێنەكان گەڕانەوە، بینی پەشۆكاوە، وتی(گوێ مەدەرێ خۆم رشتم..خەتای خۆم بوو)..ئەمیرە وتی( با پەڕۆیەكی تەڕ بێنم و بۆتی خاوێن بكەمەوە)..

محەمەد وتی( نا خۆشەویستەكەم، پێوەی دیار دەبێ و لێرەشەوە مەوعیدی گرنگم هەیە. گەر ئەرك نەبێ هانێ سویچەكەم پانتۆڵێكی نوێ لە ئۆتۆمبیلەكەمدایەو دابەزەو بۆم بێنە..!)..

ئەو ئاوابوو..ئەمیش رایكرد بۆ ژوورەكەی دی و لەگەڕانێكی خێرادا قوتووی ئاڵتوونەكەی دۆزییەوە، زۆربەی زۆری كردە ناو جانتاكەی دەستیەوە..ئیدی بەر لەگەڕانەوەی ئەمیرە چووە نێو دەرگای سەرەكی ماڵەكەیان، ئەمیرە هات و ئەمیش پێی وت:

ئەمیرە گیان بمبەخشە بیرمكەوتەوە پانتۆڵەكەم داگرتووە، ئەرك بوو بۆ تۆ هەردوو چاوم..قەیناكە لەبەر مەوعیدەكەم من دەڕۆم..

بەوپەڕی ڕێزەوە شوێنی محەمەد کەوت تا لای ئوتومبیلەکەو بە(بای بای)ی هەردووکیان، کۆتاییان بەو سەردانە هات..

## محەمەد کێبوو؟!

ئەمیرە دوای سەعاتێ ویستی هەواڵی خۆشەویستەکەی بزانێ، تەلەفۆن داخرابوو، جارێکی ترو دووان و سیان. شەو درەنگی کردو هەر بێ وەڵام بوو، خورپەیەك هات بەدڵی بێگەردیدا، بەپەلە رایکرد بۆ ژووری نوستنی دایكو باوکی، بینی ئاڵتونەکان براون..زەمانی شکاو لەپەلوپۆ کەوت..بەپەشێو حاڵی بیری لەشاسوارەکەی دەکردەوە، ئەمەبوو ئەو کوڕەی دڵم دایە، بیرکردنەوەم دایە، ئەمەبوو پیاوی وڵاتی من!!

ئەو شەوە دەگریاو خەو نەچووە چاوی..سبەی دوای وەڵام نەدانەوەی محەمەد، راستی مەسەلەکەی لەباوکی گەیاند..ئەویش چووە سەنتەری پۆلیس و رووداوەکەی گێڕایەوە، پێی وتن:

– ئەو کوڕە ناسراوەمان نەبوونی ئێمەی لەماڵەوە بەهەل زانیوەو بایی دەیان هەزار دۆلار ئاڵتوونی دزیوین..

پۆلیس کەوتنە سۆراغ، بۆیان دەرکەوت دزەکە ناوی(خالید)ە دەرچووی پەیمانگای تەکنیکییەو لەوەوبەر ئیشی کارەبای کردووە لای خزمێکی، بەڵام لەبەر دزی کردن دەرکراوە، ئیدی چووەتە(شرم ئەلشێخ) لە کۆمپانیایەکی گەشت و گوزاریدا کاری کردووە، لەوێ وێڕای خڕکردنەوەی برە پارەیەك فێری هەڵسوکەوتی زیاتر بووە بەهۆی تێکەڵ بوونی لەگەڵ گەشتیارەکاندا شوقەیەکی بەکرێ گرتووە لەگەڵ ئوتومبیلێکی مۆدێل بەرزدا..بەڵام هەر کەچوونەتە شوقەکەی بۆ دەستگیرکردنی، دراوسێکەی بەپۆلیسی وتوە مانگێك زیاترە دیار نەماوەو نەگەڕاوەتەوە!

شاسواری خەونەکانی ئەمیرە دز دەرچوو، بەو کارەشی زامێکی خستە دڵ و دەروونی ئەو کچەوە کە هەرگیز ساڕێژبوونی بۆ نەبێ!

هێنده شپرزەو پەشێوحاڵ بوو, نەیدەزانی ئەو شەوە چۆن ڕۆژ بکاتەوە, ستەمە بە دیار جەستەی شینهەڵگەڕاوی نزیکترین کەسەوە ساتی کوشندە ببەیتە سەر!

ئەو شەوە (لەیلا) هەرچەندە تەماشای سنگی خوێناویی دایکە بەدبەختەکەی دەکرد، بەکوڵ دەگریاو خۆیشی نەیدەزانی ئەو ڕۆحەی چۆن دەرنەدەچوو!

## لە پرسەی دایکی کوژراودا!

تەنیا دوو ڕۆژ بوو ژمارەیەك لەخزمانو دراوسێکان, دوای بەخاکسپاردنی ئەو ژنەی زۆربەی ژیانی بەمەینەتو کوێرەوەریی بەسەربرد, لەپرسەکەیدا دانیشتبوون, لەیلا فرمیسکی بەخوڕ لەچاوانی دەهاتو نەیدەزانی چاوە پڕ لە ترسەکانی ببڕێتە کام کەس لە بەشدارانی پرسەکەی دایکی..

پورەمونیرەی دراوسێی دڵسۆز, کە زۆرجار دەبووە هاوەڵی غەمەکانی دایکی لەیلاو جارجارەش کەداوای قەرزی لێ بکردبا, بەپێکەنینەوە وەڵامی داوای دەدایەوە, بەسەرسامییەوە کەوتە ئاخافتن "ڕۆڵە سەبەبکاری دایکت بەکۆی زوخاڵ بێ.. خودا خۆی گەورەیەو پەردە لەڕووی ئەو تاوانە هەڵدەماڵێ".

ڕۆژی سێیەم تاكو تەرایەك لەماڵە تۆقیوەکەدا مابوون, هاتنی پۆلیس خورپەی خستە دڵی هەموویانەوە. بەتایبەتی لەیلای دایك مردوو..

ئەفسەرەکە زۆر بەهێمنی سەرەخۆشی لە لەیلا کرد, پاشان وتی "خوشکم, دەبێ بۆ کارێکی پێویست بێیتە بنکەی ئیمەو لەوێ لە تاوانی مەرگی دایکت دەدوێین"..

## چۆن لاشەی دایکی خۆی جێهێشت.؟

هەر کە پرسیار بوونە کلیلی باسەکە..لەیلا چەندی کرد نەیتوانی خۆی بۆ رابگیرێت و ئەژنۆی کەوتە لەرزین و رەنگی زەرد هەڵگەڕا، ئەفسەری لێکۆڵینەوە دەرفەتی لێهێناو ئاشکرا پێیووت "ئێمە سێ رۆژە لای خۆمانەوە لێکۆڵینەوەمان دەستپێکردووەو گەیشتووینەتە ئەنجامی خۆمان.. تکایە بێ پێچ و پەنا بۆمان باس بکە, چۆن دایکت کوشت؟"

لەیلا بەدەم سڕینی روومەتەکانیەوە, بەدەنگی نزم و وشەی پچڕ پچڕ کەوتە گێڕانەوەی تاوانەکە.. تاوانی کوشتنی دایکی.. ئەو وتی" من خوێندکاری پەیمانگای کۆمپیتەرم, هەر بەتەنیا دایکمم شك دەبرد, پێکەوە لە ماڵە بچووکەکەی خۆماندا دەژیاین, سەرچاوەی داهاتمان تەنیا مووچەی خانەنشینی باوکم بوو.. من لەوەوبەر گرفتێکی ئەوتۆم لەگەڵ دایکمدا نەبوو, بەڵام لەم دواییەدا نێوانمان بەو جۆرە نەما.."

ئەفسەرەکە پەرداخێ ئاوی خستە بەردەمی و پێی وت "دراوسێکانتان دەڵێن لەم چەند مانگەی دواییدا دەنگی ئاژاوەو شەڕتان گەیشتۆتە ئەوان.. لەسەر چی شەڕتان دەبوو؟"

قومە ئاوێ گەرووی وشکی پێ تەڕکردو بەشەرمەوە سەری داخست، پاشان لەیلا وتی "من تاقانەی دایك و باوکی خۆم بووم, لە گوڵ کاڵترم پێ نەدەوترا, بڕواناکەم کەسێ وەك من نازی درابێتێ، ئەو کاتەی باوکم مابوو ژیانمان باشتربوو, چونکە لەپاڵ فرمانەکەیدا هەندێ کاری سەر پێیشی دەکرد, هەموو جارێ باوکم دەیووت (چاوە مەستەکانت بەهەموو دنیا ناگۆڕمەوە..)، دایکیشم بەرامبەرم هەمیشە هەنگوین لەزاری دەباری.. گەورەم, ئەو هەموو نازدارییە کردمیان بەمرۆڤێکی توڕەو بێ حەوسەڵە.."

## هاوڕێی خراپ..!

وەك ئەوەی بیەوێت بەجارێ سەربوردەی ژیانی خۆی بگێڕێتەوەو ئۆباڵی زۆر شتیش بخاتە ئەستۆی هاوڕێکەی, لەیلا وتی "لەپەیمانگای کۆمپیتەر (سەمیرە)بووە ئاشنام, هەر زوو بووینە هاوڕێو خۆشەویستی یەکتر, تەنانەت هەمیشە لە پەیمانگاو دەرەوەی پەیمانگا پێکەوە بووین، بێ یەکتر هەڵمان نەدەکرد.. ئەوەی لە سەمیرەدا سەرنجی ڕاکێشام, جوانییەکەی و جلوبەرگ و خشڵ و خۆڕازاندنەوەی و ماکیاژە هەمیشەییەکەی بوو.. هەر چییەکی بەکاردەهێنا گران بەهابوون, هەر چەندە کچی خێزانێکی مام ناوەندیش بوو! ڕۆژێك خۆم بۆنەگیراو لێم پرسی (ئەو هەموو زێڕو جلوبەرگە لە کوێ دێنیت؟)، بەوەڵامەکەی تووشی رامانێکی زۆر بووم, ئیدی قوڕگم گیراو قسەم بۆ نەکرا.."

ئەفسەرەکە بەدەم نەفەسێکی جگەرەکەیەوە پرسی "ئێ.. وتی چی، وەڵامی سەمیرە چی بوو؟"

"قوربان وتی (پەیداکردنی ئەمانە زۆر سووك و ئاسانە.. تەنیا دوو سەعاتی دەوێ, دوو سەعات لەگەڵ پیاوێکی دەوڵەمەندی شێت شەیدای جوانی!ئیتر لە ئوتومبیلەکەیدا بێت یاخود لە نێو خانووە رازاوەکەیدا، دوای ئەو دوو سەعاتە بەبڕەپارەیەکی زۆرەوە دەبرێیتەوە بەرماڵی خۆت)"..

ئەفسەرەکە پرسی " ئەی تۆ، ئەی تۆ وەڵامت چی بوو؟"

"بڵێم چی، ئەوەبوو بەو دەردەی بردمو ئاگری لەخەرمانی ژیانم بەردا، زوو زوو پێی دەوتم ( تۆ کچێکی جوان و خانومانی، ئەگەر شۆخ و شەنگییەکەت بخەیتە گەڕ دەتوانی پارەیەکی زۆرت دەستکەوێت.. زۆر بەئاسانی دەتوانیت..)، خوا ئاگادارە هەموو جارێ لەجێی خۆمدا سڕ دەبووم، پەروەردەی من و ئامۆژگارییەکانی دایکم لەکوێ و ئەم قسانە

لەکوێ!! ئیتر دەمویست پەیوەندیی لەگەڵ بپچڕم، بەڵام جار جار شەیتان لێم نەدەگەڕاو قسەکانی دەهێنایەوە بیرمو پارەی زۆرو زێڕی گرانبەها دەهاتنە بەرچاوم.. بەخۆمم دەووت دایکە نەگبەتەکەم قەرزاری خزمو دراوسێیەو بەیەك دووجار قەرزی ئەویش دەدەمەوە"..

پاشان لەیلا سەری داخستو بەملی کەچەوە بەئەفسەرەکەی وت "سەمیرە لەخشتەی بردم، فێری پیشە قێزەونەکەی خۆی کردم، پەیوەندیم لەگەڵ ئەو دایکە بەسۆزەمدا ئاڵۆز بوو، چاکەی ئەوو قوربانی ئەوم لەبیر نەمابوو، زوو زوو شەڕم لەگەڵ دەکرد.. لەگەڵ سەمیرەدا دەردەچوومو بەخەڵکی دەناساندم.. لەشی خۆم بەرامبەر پارچەی زێڕ، یان بڕە پارەیەك دەفرۆشت.. خوا لەناوم بەرێت.. خۆم بەخۆمم کرد.. خوا بمکوژێ، هەر چییەك روویدا خۆم بەخۆمو دایکە چارە رەشەکەمم کرد..!، دایکم بەهەڵسوکەوتی زانیم، لەجلوبەرگی گرانو زێڕی دەستو مەچەكو گەردنی دەپرسیم، چاودێریی تەلەفونو دەرچوونەکانی دەکردم، کە زانی هەڵسوکەوتم گۆڕاوە قسەی پێ دەووتمو لێی دەدامو چوونە دەرەوەی لێ قەدەغە دەکردم. منیش چەندە بۆم دەلواو چەندە دەمتوانی وەڵامی ئارەزووە سەرشێتەکانی خۆمم دەدایەوەو دەردەچوومو تەنانەت شەوی واهەبوو هەر نەشدەگەڕامەوە بۆ ماڵێ!"

## تاوان.. تاوانی بێ وێنە!

بەپێی دانپیانانی لەیلا، دوای ئەوەی هەڵکردنی دایکی لەگەڵیدا دەبێتە مەحاڵ، شەوانەو رۆژانە دایکی سنگی لێ دەکوتیو دەپاڕایەوەو دەلالایەوە خوا ئەو کچە بەدڕەفتارەی لێبسێنێ، شەوێك دوای رەشکردنی چاوە گەشەکانیو دوای خۆڕازاندنەوەی، لەیلا جلوبەرگو کەلوپەلی پێویستی

خـۆی خـستەناو جانتایەکـەوەو بـەنیازبوو دوای خـەوتنی دایکـی ماڵەکـە جێبهێڵێت و جارێکی دی سەری پیانەکاتەوە..

ئـەو کاتــەی دەگاتــە دەرگــای دەرەوە، دەبینــێ بـەکلیل داخــراوە، زۆر دەگەڕێ بۆ کلیلەکەو نایدۆزێتەوە، وەك شێت و وێت دەچێتە سەر جێگاکـەی دایکی و پڕ بەو ژووره دەزریکێنێ (کوانێ کلیلەکانم بەرێ)!

دایکـی لەخـەو رادەپـەڕێ و بـەدیتنی کـچە شـوومەکەی چـاوی دەپەڕێتـە پـشتی سـەری.. دەبێتـە شەڕو زریك و هوریـان.. پـەلاماری کـچەکەی دەدات و قەستی دەبێت قژ بەسـەرییەوە نـەهێڵێت.. ئـەویش بەهـەمان شێوە پـەلاماری ئـەو دایکـە دەدات کـەخودا بەهەشـتی لەبـەر پێـی ئـەوو دایکـانی دیکـەدا دروستکردووە، تا تەواو شەکت و ماندوو دەبن بەیەکتردا دەکێشن، کچە وەك شـێت پــەلاماری کێردێــك دەدات و دەیکــات بەســنگی دایکیــدا، بەهــەمان پــەلامارەوە دیکاتــەوە بەچــەند جێگایــەکی تــری ئــەو فریـشتە ســنگ و بــاڵ خوێناوییەدا.. دوای ساتێ لەبێدەنگی دایکەکەی، کچە ئاگرکەوتووەکەی کە دەزانێت دوا هەناسەی لە سینەیدا خنکاندووە، بەترس و لەرزەوە کـەمێ ئـەو نــاوە پــاك دەکاتــەوەو جلوبــەرگی خوێنــاوی خــۆی و هــەردوو دەســتە تاوانکارەکەی دەشوات و ئەو شەوە بۆ دایکی و تاوانی گەورەی دەگری..

هەرچـۆنێك بـێ بـۆ بـەیانی، لـەوادەی خۆیـدا مـاڵ جێـدێڵێ و دەچـێتە پـەیمانگا، نیـوەڕۆ دەگەڕێتـەوەو وەك ئەکتـەرێکی سـەرنەکەوتوو دەیکاتـە زریکەو هـات و هـاوارو واینشاندەدات دز هاتۆتە ماڵ و دایکیان کوشتووە..

پاش کفن و دفنی دایکی. بەبـەرگی رەشـەوە لەپرسـەکەیدا دادەنیشێت، هـەر زوو دراوسـێ و خزمـی نزیـك گومـانی دەخەنـە سـەر، بەتایبـەت ئەوانـەی بـە رەفتاریـان زانیـوەو لـەدایکی شتیان بیـستووە.. بـەو دوو سـێ رۆژە پـەتی درۆی دەقرتــێ و دەســتەکەی ئاشــکرا دەبــێ، ئــەوەبوو هــەر زوو لەبنکــەی

پۆلیسی شاری (١٥ی مایۆ) لەمیسر ئەو تاوانبارە دانی بەتاوانە نەگریسەکەیدا نا..

بەر لەوەی رەوانەی لای دادەوەرو ژووری زیندان بکرێت، ئەفسەرە گەنجەکە پێی وت "باشە خەجاڵەتی دنیاو قیامەت بیت، چۆن مرۆڤ دەستی دەچێتە دایکی خۆی، خۆ ئاژەڵو باڵندەش شتی وا ناکەن! باشە ئەو شەوە چۆن چۆنی توانیت بەدیار دایکی لەش پڕ لەزامتەوە رۆژ بکەیتەوە، چۆنت توانی، چۆن؟".

* ئەو چیرۆکە هەواڵنەت، کە بڵاوتدەکردنەوە لە ئەمیکاو کەنەدا بابەتی سەرەکیی هەموو رۆژنامەکانن و سەردێڕی لاپەڕەکان دائیر دەکەن، بۆیە هەر جارێ کە لێرە دەیانخوێنمەوە ئەگەرچی بەزمانی ئینگلیزییە، بەلام وا دەزانم بەقەڵەمی (یاسین قادر بەرزنجی) نووسرون، بەتایبەتی لە (National past) رۆژنامەنووسێك هەیە بەشێوازی تۆو بەهەمان تام و چێژی قەڵەمی تۆ دەنووسێ.

**فریاد رەواندزی**

**لەنامەیەکیدا لە (کەنەدا)وە رۆژی ٢٠٠٠/٢/١٥**

* بەڕای من، خوێندنەوەی ئەم کتێبە لەزۆربەی کتێبەکانی تر جیاوازە، چونکە چیرۆکە هەواڵەکان خۆیان یەخەت دەگرن و رادەکێشنە ناو تۆڕی تاوان و زوڵمەکان.

**ئیدریس شەیداهو**

**ئالای ئازادی، ٢٠٠٠/٤/١٠**

* چیرۆکەکان جیاوزان لەهەرچ چیرۆکێکی تر، چونکە تەنها خەیاڵی نووسەر نین، بەڵکو چەند رووداوێکی واقیعین، هەر چیرۆکێك خوێنەر ئەباتە جیهانێکی جیا لەوی تر، بەلام یەکسانن لەواقیعییەتیا!..

**پارێزەر ئامینە مەحود**

**کوردستانی نوێ، ٢٠٠٠/١/١٤**

* یاسین قادر بەرزنجی بەم كارە رۆژنامەنووسییە بەنرخەی لەدەرگای ئەزموونێكی نوێی بەرۆژنامەگەریی كوردی داوەو تا رادەیەكی باشیش سەركەوتووبووە تێیدا.. بە (مەرگی وەنەوشە) خزمەتێكی باشی بەوروژاندنی رای گشتیو بەكتێبخانەی كوردی كردووە.

ئەكرەم عەلی
رۆژنامەی (پەیام)ی لەندەنی
ژمارە ٢٥-٢٦ی ساڵی ٢٠٠٠

* كاك یاسین قادر بەرزنجی توانی لەرێگەی بڵاوكردنەوەی ئەم چیرۆكە هەواڵانەوە كەتاوانەكانی كۆمەڵگایان لەئامێز گرتبوو، هەنگاوێكی گەورە بهاوێژێ لەشكاندنی دیواری نێوان خوێنەرو رۆژنامە.. (مەرگی وەنەوشە) ئەزموونێكی پێشەنگە لەرۆژنامەگەریی كوردیدا.

ئەردەڵان بورهان
هەرێمی كوردستان، ٢٠٠٠/٩/٧

* خوێندنــەوەی چــیرۆکە هەواڵــەکان، خوێنــەر بــەکێش دەکــات کەلەدەروونەوە لەگەڵ کارەسات و بەسەرهاتە تراژیدییایەکادا بژی و بچێتە بنج و بناوانیان و بێ پچڕان بەنەفسێکی درێژ شوێن پێی وسەر بکەوێ و بگاتە ئەنجامی رووداوە دڵتەزێنەکان کەلەزۆربەیاندا (ئافرەت) قوربانییە.

کەمال غەمبار

ئەدەب و هونەری کوردستانی نوێ

٢٠٠١/٢/٢٢

* پڕ بەدڵ پیرۆزبایییم ئاراستەی هەوڵ و ماندووبوونی نووسەر دەکەم و لەهەمان کاتدا پێویستە سوپاسێکی بێپایانی ئاراستە بکرێت، کەوەك پیاوێکی خەمخۆری هەست بەرزو خاوەن هەڵوێست زۆر جوامێرانە لەبری دەنگی ژنان دەنگی بڵندی راماندەچڵەکێنێ و زۆر بوێرانە داوای ژیانێکی ئاسوودە بۆ ژنان دەکات.

گەزیزە عومەر

کوردستان نوێ، ٢٨/٤/٢٠٠١

* ئەم کتێبە بەهای خۆی هەیە بۆ شارەزایانی دەروونناس و توێژەرەکان تا ئاستی عەقڵی سەردەم و میراتگری و دەمارگیریی باوو نەریت زیاتر لایان ئاشکرا بێت.

**محەمەد جەزا بەرزنجی**

**رۆژنامەی (بێوار)ی هۆڵەندی**

**ژمارە ٥٣، ٢٠٠٠**

* ئەم کتێبەو پاڵەوانی ئەم رووداوانە، ئەوەتان لەناوماندا دەژین و هەموو رۆژێ، لەهەموو شوێنێ، دەیانبینین و دەمانبینین، چ مردوو بن و چ زیندوو، چ لەبەندیخانە بن و چ لەزیندانی ماڵەکان، چ کوژراو و چ بکوژەکان، غەریب نین بە ئێمە..

تێکەڵییەکە لەچیرۆک و هەواڵ و فەنتازیاو غەم، لەباوکسالاری و درندەیی و ناڕێکی.. هیوادارم ئەم کتێبە بتوانێ کارێکی گەورە ئەنجام بدات، بەتایبەتی لەگۆڕینی زۆر لەیاساکانی ناو دادگاو تێڕوانینی مرۆڤی ئێمەو بەتایبەت سیاسییەکانمان بەرامبەر بە ئافرەت و مافی ناڕەوای کوشتن.. ئەم چیرۆکە هەواڵانە موچڕکێکی گەورەیەو پێویستە تێڕوانینمان بۆ دونیا بگۆڕێت و جوانترو پاکترو ئینسانی تر سەیری یەکترو شتەکان و پەیوەندییەکان بکەین.

**ئارام کاکەی فەلاح**

**گۆڤاری رەهەند**

**ژ/ ١٥،١٤، ساڵی ٢٠٠٣**

* یەکێك لەهۆکارەکانی پەیوەست بوونی خوێنەرچیرۆکەکانی لەم شێوەیەی کاك یاسین قادر بەرزنجی و هاو قەڵەمەکم ئەوەیە، ئەگەر بەرێژەی دەستەبژێریش بێت، هێشتا خوێنەو رۆشنبیران و خەمخۆرانێکی هاومافی و یەکسانی ژیانی هەردووگەزەکە بەدوای زانیاری و بابەت و رێژەو کاریگەریی ئەم جۆرە چیرۆکانە دەگەڕێن، ئەوەش هاودەمە لەگەڵ دامەزراندنی یەك لەدوایەکی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و پەیدابوونی هۆکارەکانی بەرچاوڕوونی ژنو هاندانیان بۆ پیادەکردنی مافەکانی خۆیان وەکو تاکێکی خاوەن ماف و ئەرك و بەرپرسیارێتی لەکۆمەڵگەی کوردەواریدا.

محەمەد پاکژ

رۆژنامەی ئاز

٠١٠/٧/١٠

* سیحری ئەم چیرۆکانە لە خەیاڵدا نییە، بەڵکو لەواقیعێکدا کە خەریکە لەترسناکی چیرۆکەکان‌و ڕووداوەکان لە خەیاڵ تێپەڕی بکات، بەزمانێك نووسراوە کە هەمومان بەئاسانی تێی بگەین، لەزۆربەی چیرۆکەکاندا هەست دەکەین نووسەر و ڕوژاوەو خەمی زۆری پێ خواردووە، بۆیە لە هەڵچوون‌و داچوون بەدەرنین، لە هەمووشی جوانتر ئەوەیە کە وامان لێ دەکەن لەسەرەتاوە تا کۆتایی بکەوینە نێو ڕووداوەکان، بکەوینە نێو داووتان‌و پۆی ڕێك چنراوی چیرۆکەکان.

بۆ من خوێندنەوەی ئەم چیرۆکە جەرگبڕانە تاسەر پەڕەی ڕۆح ئازاری دام، بەتایبەتی کە زانیم زۆربەی قوربانیەکان ئافرەتن، ئەو بوونەوەرەی کە لەبەردەم هەموو هێرشەکاندا بێ چەك وەستاوەتەوە، ئەم چیرۆکانە چەندین ئەشکەوتی ناو ڕۆحی ئادەمیزادیان بۆ ڕوناك کردمەوە، لەم چیرۆکانەوە زانیم کە چ بکوژێك لەناو هەریەکەماندا دەژی، دەکرێ نووستبێ، بەڵام ئەو دڕندەیە زۆر ئاسان وەئاگادێ‌و هەموو شتێکی جوان بەناوی شەرەفەوە وێران دەکات.

**شێرزاد حەسەن**

**وتەیەك لەسەر دوا بەرگی چاپی یەکەمی**

**مەرگی وەنەوشە**

## پێڕست